يوسف الحاج أحمد



# قوربانیەکانی خۆشەویستی



چەند چیرۆک و ڕووداوێکی ڕاستەقینەی
کاریگەری ئەو ئافرەتانەیە کە بوونەتە
قوربانی حەزو ئارەزوو وبێ ئاگـــایی
خاوەنەکـــانیان بە خوێن و فرمێسک
گێراویانەتەوە

وەرگێرانی : لیژنەیەک

پێداچوونەوەی :
فاتیح سەنگاوی

2006
چاپی یەکەم

# قوربانیەکانی خۆشەویستی

قوربانیەکانی خۆشەویستی، وێنەکاری، تێکەڵی، سەتەلایت، تەلەفۆن

**چەند چیرۆك و ڕووداوێكی ڕاستەقینەی كاریگەری ئەو ئافرەتانەیە كەبونەتە قوربانی حەزوئارەزوو بێئاگایی، خاوەنەكانیان بەخوێن و فرمێسك گێڕاویانەتەوە.**


یوسف حاج أحمد

وەرگێڕانی بۆكوردی: لیژنەیەك

پێداچونەوە: فاتیح سەنگاوی

ناوی کتێب: قوربانیەکانی خۆشەویستی

ناوی نوسەر: یوسف حاج احمد

وەرگێڕانی: لیژنەیەك

پێداچونەوەو سەرپەرشتی: فاتیح سەنگاوی

وێنەی بەرگ: هیوا رەفعەت

تیراژ: ١٠٠٠دانە

چاپخانە: چاپخانەی پەیوەند

ژمارەی سپاردن: ٨٩٧ ساڵی ٢٠٠٦

چاپی یەکەم ــ ٢٠٠٦

رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَا إِنَّكَ أنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ

**پەروەردگار، ئەم کاردمان لێوەرگرە، چونکە بەڕاستی تۆ بیسەرو زانایت**

**پێغەمبەری خوا(د.خ) دەفەرموێت:( الدین النصیحة، قلنا لمن؟ قال: لله ولکتابه ولرسوله ولأئمة المسلمین وعامتهم)**

**رواد مسلم.**

## هیواو ئاواتێك لەخوا داواكارم بەدیبهێنێ

خوازیارم ئەم وشانە بەرگوێی دڵە هۆشیاردكان بكەوێو پەسەند بكرێن. لەناخی دڵمەوە هیواخوازم ئەم كتێبە بچێتە هەموو ماڵێكەوە. هەموو لاوێكی كچوكوڕ بیخوێنێتەوە لەسەردەمێكدا دڵودەرونەكان لاوازبوون بەهۆی زۆری فیتنەو بڵاوبونەوەی ڕەوشت نزمیو خراپەكاریەوە، بەڵكو ئەو دێڕانەی نوسیمە هۆكاروبەرگریەك بن بۆئەوانەی شەیتان خراپەكاری بۆڕازاندونەتەوەو دەیەوێ بەهۆی كاری بێڕەوشتیو خراپەكاریەوە ناشرینو لێخنیان بكا.

خوایەگیان . . . .ئاواتەكانم بێنەدیو لێم وەرگرە

نوسەر

# پێشکەش

پێشکەشە بەتۆ، ئەی ئافرەتی مە ڕلمانی دامەزراوو خۆڕاگر، جا چ دایک یا کچ یا هاوسەربیت.
پێشکەشە بەتەواوی ئەوکچانەی شەیتان ئەیەوێ گومڕاو سەرلێشێواویانکاو حەزو ئارەزووەکانیان بۆبرازێنێتەوە. وەبەهەموو ئەوئەوکچە هەرزەکارانەی بەنامەکانی خۆشەویستیو قسەی لوسو شیرین فێڵیان لێکراوەو هەڵخەڵەتێنراون.

ئەم کتێبە پێشکەشە

بەناوی خوای گەوردو میهربان

## پێشەکی سەرپەرشتیار/

لە ساتەوەختی هاتنەدی مرۆڤەو . حەزو غەریزە مرۆییەکانیش لەگەڵیدا خولقێنراون و لەگەڵ گەورە بوونی مرۆڤیشدا بەشێك لە حەزە شاراوەکانی چرۆ دەکەن و هاوتەریبی پەرە سەندنی جەستە ئەمانیش لە گەشەکردن و بەرەو کەماڵ چوندان...ویستی خوای گەورەش وابوە مرۆڤەکان بێ پەڵەو هەڵە نەبن و هەڵگری تۆوی خێرو چاکەخوازی و زیان و شەرەنگێزی بن و توانای هەڵبژادنی باش وخراپیان هەبێت ،هەروەکو خۆیشی دەفەرموێ ((إنا هديناه السبيل إما شاكرا وإما كفورا))((وهديناه النجدين)). سەرەڕای بوونی توانای پاکیزەیی و چڵێسی و پرکێشەیی و بە پێزی و ئاشتی خوازی و شەڕەنگێزی لە مرۆڤ دا...لەگەڵ بوونی ئەم توانا دوو ڕەهەندیەدا..کەچی دەرونی مرۆڤ حەزو و مەیلی خراپەکردن زیاتر لە ناخیدا بەرجەستەیە و بە دەربڕینی قورئانی((إن النفس لأمارة بالسوء)) نەخاسەمە ئەگەر لە ژینگەیەکی شێواو و کەش و هەوایەکی نا لەبار و پیس بوو دابێت... ئا لەو ساتەوەختانەدا...دەرونی زیاتر ختوکەی دەدات و حەزی تێرکردنی ئارەزوەکانی بەشێوەیەکی ناشایستە کوێری دەکات لە ئاست سەرەنجامە کاردساتاوی و خەم هێنەرەکاندا...خۆ ئەگەر مرۆڤ لە هەندێ لە ساتەکانی ژیانیدا ژیری و ئاوەزی نەخاتەگەڕ ونەیکاتە داوەری حەزو غەریزەکانی، ئەوا ڕۆژانی دورودرێژی دواتری خەمۆکی و ڕیسوایی و ئابڕو چون دەبێت ،پاش ئەوەی کار لەکار دەترازێ و پەشیمانی داد نادات .لەوانەیە هەڵویستەیەکی ژیر مەندانە و خۆڕاگری و بەئاگایی چەند سات و چرکە ساتێکی کەم لەو سەرەنجامە نا لەبارانە ڕزگاری بکات..........

ئەم کتێبەی بەردەستتان کە بریتیە لەچەند بابەتێك وکۆمەڵێك چیرۆك وبەسەرهاتی ئەو کەسانەیە بونوتە قوربانی حەزو ئارەزویەکی سەرکەش و کاتی وکراونەتە نێچیری مرۆڤە گورگ ئاساکان ،ئەوانەی لە دەرفەتێك دەگەڕێن تاوەکو کەسانیتر بخەنە داوی حەزی نەفس و دەرونی چڵێسیانەوە و پاشتریش بەبێ باکی وبێ دەربەسیەوە ،بەجێیان دەهێڵن تاوەکو بەخەم و خەفەت و ئازارو خوێناوی خۆیانەوە بتلێنەوە ،کە لەوانەیە سەرەتای ئەو کاردساتانەی بریتی بوو بێ لەسەرنج دانێکی فریودەرانە یان بەڵێنێکی درۆیانە یاخود پەیوەندییەکی تەلەفۆنی و چاتێکی ئەنتەرنێتی سەرەڕای بەدوادا چونی فلیم و کەناڵە ئابڕوبەرە ئاسمانیەکان ...وهتد .دواتریش

قوربانیەکان (کەزۆرینەی هەردزۆریان ئافرەتن)تێ کەوتون و پاشان هەر خۆیان وەکو نوسەر دەڵێ (حیرۆك و بەسەرهاتی خۆیان بەمەرەکەبی خوێن و ڕوباری فرمێسك نوسیوەتەوە)...بەو ئومێدەی دەستە خوشکانی تریان بەمەرەدەی ئەوان نەچن و نەبنە نێچیری مرۆڤە قێزەون و ئارەزوباز و درندە ئاساکان...پاش پێداچونەوەی وەرگێڕانی لیژنەکە بەپێ ی توانا هەوڵم دا دەستکارییەکی باشی وەرگێرانەکە بکەم و لە هەندێ شوێنیش دا دایان بڕێژمەوەو دەستکاری هەندێ لە دەربڕینەکان بکەم. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ شوێنی وەرگێرانەکە لاوازی پێوە دیارە،هیوادارم لە جاپێکی تری ئەم کتێبەدا ئەو کەم و کورتیانەش نێیە ڕێنرێ.هەندێ برگەی ئەم کتێبە بەتایبەتی ئەوانەی مۆرکی حوکە و فەتوادانی پێوەیە یاکاریگەری ژینگە و عورفی کۆمەڵگایەکی لەسەرد نەکرێ ئەوا نەجێ ی یەك دەنگی هەموو لایەك نەبن .لە هەندێ شوێنیش دا بەنابراوەتەبەر کەمێك دەستکاری و کورت کردنەوە تاوەکو خزمەتێکی باشتر بە خوێنەر بکاو مەبەستی نوسەریش بگەیەنێ ... دیارە زۆر بەدەگمەن ئەمانە لەحیرۆك و بەسەرهاتەکاندائەنجام دراون. چونکە قابیلی دەستکاری نین و ڕوداوەکانیش واقعین...
لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتن بۆ لیژنەکە و هەموو ئەوانە دەخوازم کە پشکداریان کرد لە تەواوکردنی ئەم بەرهەمەدا.دەخوازم بەرهەمی تری بەدوا دابێت ،بەتایبەتی لەم شێوەیە کە ڕۆڵێکی باش دەبینێ لە هۆشیارکردنەوەی لاوەکانمان....سەرکەوتوو سەرفراز بن.

**فاتح سەنگاوی**

٢٠٠٦/١٠/١

بەناوی خوای کەورەو میهرەبان

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆخوای تاك و تەنها، داوای یارمەتی لێخۆشبونی لێدەکەین. پەنا بەخوا دەگرین لەدەروونی سەرکەش و خراپی کردارمان، هەرکەسێك خودا ڕێنمایی بکات گومڕا نابێ و هەرکەسیش گومڕای بکا پەی بەهیدایەت نابات، وە شایەدی دەدەین بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەخوا، وەتاك و تەنهاو بێهاوبەشە، وەموحەمەد بەندەو ڕەوانەکراوی ئەوە، بەڕێنمایی و ئایینێکی ڕەواوە ناردویەتی بۆگەیاندنی پەیامی ئیسلام تابڵندی و بالآیی بەسەر هەموو ئایینەکاندا هەبێ گەرچی ناحەزان و بێباوەڕانیش پێی خۆشحاڵ نەبن.

**خوشکی موسڵمان:**

**یــــــــا درة حفظــــــــــت بــــــــالأمس غالبـــــــــة**
**واليـــــــــوم يبقونــــــــها للــــــــهو واللعــــــــب**
**وأيـــــــن مـــــــن كــــــــانت الزهــــــراء أســــــوتها**
**ممـــــن تقفـــــــت خطــــــى حمالــــــة الحطـــــب**

تۆ، ئەو گەوهەرە پارێزراوو بەنرخە بوی تادوینێ، ئەمڕۆکە بۆگەمەو گاڵتە دەتهێڵنەوە، کوا کەسێك (زەهرا)[1] پێشەنگی بێت . یان کەسێك شوێن هەڵگری (کۆڵەدار لەپشت بێت)[2].

**خوشکی بەڕێز:**

چی دەڵێی بەکەسێك کەبچێتە مەیدانی جەنگ و لەخاکی دوژمنەکەیدا بەبێ هیچ توێشوو پێداویستیەکی جەنگی، لەولاشەوە دوژمنەکەیشی سەربازو چەك و هۆکاردکانی بحباشی بۆئەو جەنگە ئامادە کردبێت. ئەمیش هەموو هۆکارێکی جەنگ و سەرکەوتنی فەرامۆش کردبێت؟ ئایا ئەمە نمونەیەك نییە لەنەفامی و . ێتی؟ لەگوندیی و سەرکەشی و خۆڵ گۆڕان ؟

**کەوابوو خوشکی بەڕێزم:**

بزانە کەتۆ ئەو جەنگاوەردی کەچوویت بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمن. وە دوژمنکەشت (شیگان)ە. خوادایەنامان بدات لێی، کەبەردەوام خۆیی و ئەفسەردکانی لەکەمیندان بۆت. چاوەڕێی ئەوەن تا بگەیتە ناوپانتایی خاکیان کەوەکو پشکۆ داگیرساوە تا لەخشتەت بەرن و بتکوژن. بەڵێ بتکوژن.

---

[1] الزهراء: مەبەست لە فاطمە ی کچی پێغەمبەری خوایە (د.خ).

[2] حمالة الحطب ( مەبەستی خێزانی ابو لهب)ە.

ئایا سەرنجت لەو ووتەیەی شاعیر نەداوە بەم دێرە شیعرە ئاگادارت ئەکاتەوەو دەڵێ:

"فتلك يأاخت في سلب حيائك ليس بالسيف ولا بالبندوقية

ئەویش بەتکانی ئابڕوو بردنت نەك كوشتن بەچەكو شمشێر"

## خوشكی مسوڵمانم:

ـەر ئەوەی ناچار دەكرێی بەچونت بۆناو خاكی دوژمن، لەئەركی برایەتیو سۆزو خۆشەویستیمەوەیە بۆت ئانەم كتێبە بكەوێتە دەستی بەدەست نوێژو پاكت، وەیارمەتی دەرێك ـێت پاش یارمەتی خوای گەورە بۆت. تاوەكو لەومەیداندا بەسەربەرزیو ڕووسوری بگەڕێیتەوەو ـنازی بەدینو ئیمانو بەشەرمیو داوێن پاكیتەوە بكەی، بەپێچەوانەی ئەوانەوە كەخۆیانو دینو ـیمانو ئابڕویان دۆڕاند، كەسایەتی لەكەدار كردوو شەرمو حەیای براو بەتایبەتی لەبازاڕو فرۆشگاكاندا لەدەربادترین شوێنن.

ـە(جوبەیری كوڕی موتعیم)ەوە دەفەرموێ: پیاوێك پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا (د.خ) چ شوێنێك لەلای خودا زۆر خۆشەویستە، وە چ شوێنێك لای خودا زۆر بێزراوە؟ پێغەمبەر (د.خ)فەرمووی: نازانم، تاپرسیار لە جبریل(علیه السلام) نەكەم، جبریل هاتو پێی ڕاگەیاند كەخۆشەویسترین جێگەیەك لەلای خودای گەورە مزگەوتەكانە، وە بێزراوترین جێگەیەكیش لەلای خوای گەورە بازاڕەكانە، (احمد و بەزارو ئەبو عەلا گێڕاویانەتەوە)[1].

خوشكی ئەزیزم:

من چەند ڕوداوو چیرۆكێكی واقعی ئەخەمە بەردەستت، كەبەبیستنی دڵەكان دادەخورپێو چاوەكان ئەسرین ئەبارێنن، بۆیە بەهیوام سودی لێوەربگریتو هەڵوێستەی لەئاستدابكەی ئابتگەیەنێتە ئەوپەڕی پارێزراوی لەدەست شەیتانو دەستو پێوەندەكانی پێش ئەوەی زاڵ بن بەسەرتدا.

خوشكی بەڕێزم . . .

پێغەمبەری خوادا(د.خ) فەرمویەتی :( جەستەی ئافرەت دەبێ داپۆشرێ، ئەگەر دەرچوو شەیتان ئەمەڵاسدایە بۆی)ترمزی گێڕاویەتیەوەو فەرمودەكە (صحیح)ە.

ئەی ئەوكەسەی خوازیاری بەهەشتی، مەبەستت لەچون بۆبازاڕ چیە؟ ئایا بۆدابین كردنی پێداویستیەكانتە؟ یاخود بۆزانینی هاتنە بازاڕی دواین مۆدیلی سەردەم؟ یابۆدەرخستنی خۆتە

---

[1] ئابێ واتێبگەین لەفەرمودەكە كەشوێنی كارو كاسبی حەڵاڵ دەگرێتەوە، بەڵكو بەهۆی ئەوەی كەبازاڕەكان بۆنەتە مەیدانێكی فراوان بۆ بڵاوبونەوەی بەدڕەوشتی بەتایبەتی ئەو فرۆشگایانەی جۆرەها سیدی تیابڵاو دەكرێتەوە (و).

نەبیتر جۆی کورەکان و گورگە مرۆییەکان، پێش ئەوە ئامانجەکانت دیاریبکەی، هەڵویستەیەك بەرامبەر ئەم ئایەتە پیرۆزەدابکە، (وقفوهمْ إنَهمْ مسؤولون) (الصافات:٢٤) .

خوشکی ئازیز . . .

ئەوساتانە لەڕوخساری خۆت و خۆئارایشت کردنت دەڕوانی لەئاوێنەداو ئامادەسازی دەکەی بۆچونە بازاڕت ئەم پرسیارانە لەخۆت کە:-

ئایا ڕوخسارو پۆشاکەکات چەندە بەپێی فەرمانەکانی ئەو خودایەیە کەدروستی کردویت و جوانی و تەندروستی پێبەخشیویت ؟ یاخو لەگەڵ مۆدێلەکانی سەردەمدا گونجانوتەو بەپێی خواستی دوژمنەکانتە ، کەماوەیەکە ئارامیان لێبڕاودو لەچاوەڕوانیتدان ؟

خوشکم، ئەم ئایەتە پیرۆزە بهێنەرەوە یادت کەخوای گەور نەفەرمویێت :( واللهُ يريدُ أن يتوب عليكمْ ويريدُ الّذين يتبعون الشّهوات أن تميلُوا ميلا عظيما) (النساء:٢٧)، بێگومان خودا دەیەوێت تەوبەو پەشیمانیتان لێوەرگرێت و لەهەڵەکانتان خۆش بێت. بەڵام ئەوانەی شوێن ئارەزوات و هەوەسبازی کەوتوون دەیانەوێت ئێوەلابدەن بەلادانێکی گەورە[٢]. خوادا پارێزراوت بکات . . .

ژیر ئەوکەسەیە لەهەوڵی زۆرکردنی خەزێنەی چاکەکاریدایەو کۆشش بۆسڕینەوەی هەڵەو تاوانەکانی دەکا، لەوکەسانە مەبە کەبەردەوام خراپەو تاوان کۆدەکەنەوەو بەباشی ئەم ئامۆژگاری و ڕێنماییانە وەربگرە تاتێك نەشکاوی، وەگەرنا ئاخ و پەشیمانی دادی نییە.

ئامۆژگاریم بۆت ئەوەیە . .

١/ ڕوخسەت لەباوك و گەورەی ماڵ وەربگرە بۆهەرشوێنێك کەدەتەوێت بۆی گوزەربکەیت.

٢/ بەتەنها لەماڵ مەڕۆدەرێ. باکەسێکی مەحرەم هاوڕێیەتیت بکات. ئەگەرنەبوو ئافرەتێکی چاك و ژیرت لەگەڵ بێت.

٣/ هاوڕێیەتی ئافرەتێك مەکە کەگرنگی بەشەرم و حەیاو خۆداپۆشین نادات. گەرچی لەکەسە نزیکەکانیشت بین، تانەبیتە جێگەی گومانی خراپ و نێچیری گورگەکان و نەبیتە فیتنە.

٤/ خۆت بپارێزە لەبەکارهێنانی بۆن و عەترو بخورد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی:( إذا استعطرت المرأة فمرت على القوم ليجدوا ريحها فهي زانية) رواه نسائي والترمذي و أبوداود. وهو حديث صحيح.(گەر ئافرەت خۆی بۆندار کردو تێپەڕی بەلای کۆمەڵێکدا تابۆنی گوڵاوەکەی بچێت بەسەریاندا ئەوە لەزینا کارانە).

---

[٢] تەفسیری ئاسان.

٥/ پێڵاوی بن بەرزو بن تیژ لەپێمەکە کەدەنگی پێت دەردەکەن، پێڵاوی ساکارو تەخت لەپێبکە بۆپاراستنی دین‌و تەندروستیت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ :( ولا يضربن بأرجلهن ليُعلم ما يخفين من زينتهن)(النور: من الآية٣١) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن‌و پێیان بدەن بەزەویدا تادەنگی خشڵ‌و پاوانەکانیان ببێت‌و بزانرێت کەزینەت دارو خشڵ دارن.

٦/ دووربکەوە لەلەبەرکردنی پانتۆڵ‌و هەندێك پۆشاکی تەنك‌و سەرنج ڕاکێش.

٧/ خودا پارێزراوت بکا، هەرگیز دوعای لەماڵ دەرچونت لەبیرنەچێت کەپێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت لەکاتی دەرچوون لەماڵ بڵێن:( بسم الله، توكلت على الله، ولاحول ولا قوة إلا بالله ، اللهم اني أعوذ بك أن أضلَ أو أضل، أو أزلَ أو أزل، أو أظلم أو أظلم، أو أجهل أو أجهل عليَ أو أبغي أو يُبغى عليَ) رواه الطبراني وهو حديث صحيح لغيره.

٨/ با زمانت پاراوبێت بەیادی خودا، لەکاتی چون بۆبازاڕ دوعای چونە بازاڕت لەبیربێ کەمەیدانی جەنگە ، کەدەفەرموێ :( من دخل السوق فقال: لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد، يحي ويميت . وهو حي لايموت . بيده الخير . وهو على كل شيء قدير) هەرکەسێ ئەمە بڵێ هەزار خێری بۆدەنوسرێ‌و ئەوەندە خراپەشی لێدەسڕدرێتەوەدو هەزار پلەشی پێبەرزدەبێتەوەو خانویەکی لەبەهەشت دا بۆبنیات دەنرێ. رواه أحمد والترمذي وقال الألباني :حديث حسن.

٩ ڕاستەوخۆ سەر لەوفرۆشگایانە بدە کەپێداویستی‌یەکانتی لێدەست دەکەوێت‌و خۆت دیاریت کردوون. سەربەهەموو دۆکانێکدا مەکەو سەیری هەموو شتێکیش مەکە.

١٠/ زۆر لەگەڵ فرۆشیاردکەدا مەدوێ‌و مەچۆرە ناونەو باسانەی کەفیتنە ئامێزن، ووشەو دەستەواژەی هەستیارو سەرنج ڕاکێش بەکارمەهێنە، لەیادت بێت کەخوای گەورە دەفەرموێ کاتێك خێزانەکانی پێغەمبەر(د.خ) دەدوێنێ :( فلا تخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض )(الاحزاب:٣٢)

جێ لەگەڵ سەردەمێکدا بڵێین کەفیتنە ئامێزە.

١١/با جل‌وبەرگەکانت بالآپۆشی تەواو بێ. گەر هەندێك لەپرچت یا لەشت بەدەرکەوێ دەکەویتە بەرتیرە ژەهراوەکانی چاوبرسی‌یەکان.

١٢/ لەورێگەو شوێنانەدا گوزەر مەکە یا ڕامەوەستە کەفەردبالغن‌و خەڵکی بەریەك دەکەون لەبەر چڕی‌و تەنگەبەری‌یان.

١٣/ خۆپارێزی بکە لەوجۆرە کەسانەی کەدەڵێن (معجب)ین پێت. یا ناوو ناونی‌شان‌و ژمارە تەلەفۆنت پێدەدەن.

١٤/ ئاگاداربە لەكاتی قیاس كردنی كەلوپەلدا بۆسەر سەنگو قەدوبالات گەرچی لەسەر عەباكەشتەوەبێت.

١٥/ لەهاتنە دەرەوەتدا گۆرەوی لەپێ‌بكەو دەست كێش بكە دەستت .

١٦/ لەكاتی پارەپێداندا پا دەستت نەدات لەدەستی فرۆشیارەكە ، بەڵكو لەجێگەیەكدا پارەكە دابنێ‌و بائەوخۆی هەڵی بگرێت.

١٧/ لەلای فرۆشیارەكە عەباكەت دامەنێ، بەشێوەیەك كەببێتە هۆی دەركەوتنی سنگو بەرۆكت.

١٨/ لەكاتی كڕینی ئاڵتون‌و بازنگو مستیلەدا بافرۆشیارەكە نەیكاتە دەستت، دەستی بەدەست نوێژت مەدەرەدەستی.

١٩/ باماوەیەك لەنێوان تۆو فرۆشیارەكەدا هەبێت، بەتایبەت گەر دوكانەكە تەنگەبەر بوو بەتایبەت لەكاتی چوونە دەرەوەو هاتنە ژوورەوەدا.

٢٠/ خوشكی بەڕێز، جوانی چاوو ڕوخسارت بەخششێكی خواییە، ڕازاندنەوەو دەرخستنی بۆنامەحرەم تووشی‌سزای خوایەت دەكات‌و شەیتان زاڵ دەكات بەسەردا.

ئەی ئەوكەسەی بەختەوەری‌و ڕزگاربونت دوێ، بیزانە: زۆربەی لادان‌و سەرپێچی‌یەكان لەبازەڕەوە دەست پێدەكات، زۆر دەرچونت‌و ئەملاوئەولا كردنت‌و پێكەنینت بەزەردەخەنەیەكی لەخشتەبەرو ووشەی(معجب)م. ئەمانە هەمووی بۆخەڵەتاندنن، مرۆڤی ئازادیش خۆی بەكڕین‌و فرۆشتن نادات.

ئاگاداربە ! بەشەرەو شكۆو پاكیتەوە نەچیە بازاڕو بەدۆڕاندنیان بدەیت. بەلەدەست دانی دینت بگەڕێیتەوە.

لەكۆتایی‌دا:

بەخوای گەورەت دەسپێرم، داواكارم كەخودا پارێزراوت بكات. هەمووولامان دامەزراو بكات لەژیان‌و مرندا، وەئەم چەند پەرەگراف‌و ووشانە بكاتە پەندو ئامۆژگاری بۆخۆمان‌و نەوەكانمان لەوناڕەحەتی‌و ناخۆشیانەی كەبەرەو ڕووی خوشك‌و براكانمان دەبێتەوە. تاپارێزراوبین لەڕێگەی چەوت‌و هەڵەكانی ژیان.

بەختەوەر ئەوكەسەیە سود لەهەڵەی خەڵكانی‌تر وەرگرێ. ئەزمونەباشەكانی ژیانی وەردەگرێت‌و لایەنە خراپەكانی وازلێدێنێت ، هەروەك شاعیر دەڵێت:

إن السعيدله من غيره عظة وفي التجارب تحكيم معتبر

واتە: بەختەوەر ئەوكەسەیە كەپەند لەكەسانیتر وەردەگرێ‌و لەئەزمونەكانیش سودمەند ئەبێت.

لەخواداواکارم سوود بەمسوڵمانان بگەیەنیتو بەنیازێکی پاکەوە لێمان وەربگریتو بیکاتە تویشووی ڕۆژی دوایی. ڕۆژێك کەنەماڵو نەسامان فریادڕەس نین، تەنها بەهۆی دڵێکی تەندروست خەرووی ئیمانەوەخوا فریامان دەکەوێت.

درودو سەڵاو لەسەر پێغەمبەر، وەهەموو یارو یاوەرانی. کۆتا پاڕانەوەشمان سوپاسو ستایشی خوای پەروەردگاری جیهانیانە.

**دمشق – شام**

**هەژار بۆسۆزو میهرەبانی خوداو**

**خزمەت گوزاری سوننەت**

یوسف الحاج أحمد

## بۆچونی ئیسلام سەبارەت بەخۆشەویستی

خـوای گـەورە یارمـەتی دەری هـەموان بێـت، بزانـە کـە: خۆشەویسـتی دروسـتە لەئیسـلامدا. بـەو مەرجانەی کەدەیخەینە ڕوو، سونـنەتی دروستیش ئەوەی ڕوون کردۆتەوە ، لەوبەلگانە:

١/ پێغەمبـەر(د.خ) دەفـەرموێ:( لم یـر للمتحـابیین مثـل النکـاح)[١]، شـتێکی چاکـتر لـەماردبڕین بۆخۆشەویستان نـابینم. ئەمە بەلگەیـە لەسـەر ڕەوابوونـی خۆشەویسـتی. بـەلام بەومەرجانـەی کەدوای بەلگەکان دەیخەینەڕوو بەپشتیوانی خودا.

٢/ (مغیـث) مغیـث؟ )، پاشـان کەیەکێکە لـەهاوەلان. پـاش ئـەوەی لـەخێزانی جیابویـەوە شـوێنی کەوتبوو، کەئەوکات خێزانی نامەحرەم بوبو پێی، لەوکاتەدا فرمێسکیش بەگۆناکانیدا ڕێی ئەکرد. پێغەمبەر خوا(د.خ)فەرمووی :(ئەی عەبباس، سەرسام نابی لە خـۆش ویسـتی مغیـث بـۆ بـەریردو ڕقو کینەی بەریردش لەپێغەمبەر(د.خ) بە بەریردی فەرموو:( بۆناگەڕێیتـەوە بـۆلای؟ ). بـەریرە ووتی:( فەرمانم پێدەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا؟) فەرمووی ( بەلکو مـن تەنـها تکاکـارم) بـەریرە ووتی: هیـچ پێویستیەکم پێی نەماوە[٢].

٣/ پیاوێك سکالای لەخێزانەکەی لای پێغەمبەر(د.خ) کرد بەوەی کە هەرکەسێك دەستی بۆدرێـژ بکـات نایداتـە دواوە یـان بەربەرسـتی ناکـات، پێغەمبـەر(د.خ) فـەرمووی تـەلاقی بـدە، فـەرمووی: ئەترسم نەفسم بەدوای بکەوێ، فەرمووی : بیهێلەوە. ( شکا إلی النبي(د.خ) رجـل أن امرأتـه لا تـرد یـد لامس! فقال (( طلقها ))، فقال: إني أخاف أن تتبعها نفسي. فقال:( استمتع بها)[٣].

زانایـان لـەبارەی ڕاڤـەی ئـەم فەرمودەیـەوە ڕای جیاوازیـان هەیـە. مەبەسـتەکەش لـەخـواردوە ڕون کراوەتەوە:-

---

[١] الحدیث صحیح. أخرجه ابن ماجة والحاکم والبیهقي. وقال الارناؤوط: أخرجه ابن ماجة والحاکم والبیهقي وسنده حسن.

[٢] حدیث صحیح. أخرجه البخاري في (صحیحه ٩ ٤٠٨) – کتاب الطلاق (٦٨) باب شفاعة النبي في زوج بریرة (١٦)(ح) (٥٢٨٣). وە ئەو فەرمودەیەی ئەمە زیاتر ڕوون ئەکاتەوە. لەعائیشەوە ( خوای لێ ڕازیبێ)هاتووەکە ( پێغەمبەر(د.خ) بە بەریردی فەرموو: بیبەو ئازادی بکە. چونکە مێردەکەی (کۆیلە) بوو، وە بەریردی سەربەست کرد لەهەلبژاردنیدا، بەلام بەریرە جیابونەوەکەی هەلبژارد. وە ئەگەر ئازادیش بوایە وای نەئەکرد. بوخاریو موسلم لەچەند ڕێگەیەکەوە گێڕاویانەتەوە.

[٣] ڕای جیاواز لەبارەی ئەم فەرمودەیەوە هەیە، هەندێکیامن دەلێن فەرمودەکە (صحیح)ە. وەهەندێکی تریان دەلێن دروست (صحیح) نیـیەو بەلکو لاواز(ضعیف)ەو بەکەلکی بەلگە هێنانەوە نایەت. ( پێغەمبەر(د.خ) بە بەریردی فەرموو: بیبەو ئازادی بکە، چونکە مێردەکەی (کۆیلە) بوو، وە بەریردی سەربەست کرد لەهەلبژاردنیدا. بەلام بەریرە جیابونەوەکەی هەلبژارد. وە ئەگەر ئازادیش بوایە وای نەئەکرد. بوخاریو موسلم لە چەند ڕێگەیەکەوە گێڕاویانەتەوە.

گروپی یەکەم: نیبن‌و قوتەیبە دەفەرموێ: واتە بەخشندەیەو دەستی داواکار بەچۆڵی ناداتە دواوە. (النسائي)ش لە (سنن)دکەیدا لەهەندێکیانەوە گێڕاویەتی‌یەوە دەڵێن: سەخی‌یەو دەبەخشێ. وە بەریەرچی ئەوگوتەیە دراوەتەوە بەوەی کە ئەگەر وابوایە دەیوت ( لاترد ید ملتمس).
گروپی دووەم: کەلەڕاستی‌یەوە نزیکترن : گوتویانە: مەبەست لەوەیە ڕەفتای وایە هەرکەسێك دەستی بۆ درێژبکات نایگێڕێتەوە، نەك ئەوەی کاری خراپ (فاحشە) بکات، پێغەمبەر(د.خ) ڕێگە بەهاوڕێیەتی کەسێك نادات کەئەمە ناکاری بێت، لەوکاتەدا هاوسەردکەی وەك گەوادی لێ‌دێت، بەڵام کاتێ خوڕەوشتی وەها بێت هەرکەس بیەوێت‌و بۆی ڕێك بکەوێت بەرگری چونەلای نەکات، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی وازی لێبهێنە. بەڵام پاش ئەوەی ووتی خۆشم ئەوێ‌و گومانی خراپی لێ‌دەکەم ڕێگەی پێدا لەبەر خۆشەویستی‌یەکەی لێی جیانەبێتەوە، ئەوەك بەهۆی گومانەوە تووشی گرفتێك ببێت. وە خوای گەورە زاناترە. ( بگەڕێردوە بۆ تەفسیری ابن کثیر ٥٤/٥، و روضة المحبین ی ابن القیم لا ١٣٠.

**لەڕوانگەی ئەو بەلگانەوە کەباسمان کرد ڕوون دەبێتەوە کەخۆشەویستی دروستە لەئیسلام دا بەڵام بەمەرجێك کە :-**

١/ دوور بێت لە سەرپێچیە شەرعیەکان، وەکو ماچ کردن‌و ئەژنۆ بەیەکەوە نان، چونکە لەوبارەدا پێی حەڵاڵ نەبووە. پێغەمبەری خوا(د.خ) دەفەرموێ:( لان یطعن في رأس أحدكم بخیط من حدید خیر لها أن یمس امرأة لا تحل له)[1]. گەر سوژنێکی ئاسن بکرێت بەسەری یەکێکتاندا چاکترە لەوەی دەستی بدات لە ئافرەتێکی نامەحرەم.

٢/ تەوقە لەگەڵ یەکتری‌دا نەکەن، چونکە تەوقە کردن لەنێوان ژن‌و پیاوی نامەحرەمدا دروست نیە لەئیسلام دا[2].

---

[1] حدیث صحیح، اخرجه الطبراني في الكبیر وابو النعیم في الطب(٢/٢٣ - ٢٤)و الرویاني في المسند(٢/٢٢٧) والبیهقي.

[2] لەبەلگەکانی نادروستی تەوقەکردنی ژن‌و پیاوی نامەحرەم، فەرمودەی پێغەمبەر(د.خ) (إني لا أصافح النساء، إنما قولي لمئة امرأة كقولي لامرأة واحدة) واتە من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم، گوتەم بۆسەدان ئافرەت‌و یەك ئافرەت هەمان گوتەیە اخرجه النسائي(١٤٩/٧) وابن ماجة(٩٥٩/٢) والترمذي (٢٢٠/٥) ومالك في (الموطأ)(٩٨٢/٢) وأحمد في المسند(٦/ ٣٥٧.

٣ ئەو خۆشەویستیە یادی خواو خۆشەویستی گەوردمان لەبیرنەباتەود کەخۆشەویستی خواو پێغەمبەردکەیەتی(د.خ).

٤/ باشتروایە کەئەوکەسە لەوانەبێ بتوانێت کۆنترۆڵی ددروونو جموجولی بکات. لەبەرئەمە (ابن القیم)(خوای لێرازیبێ) ددڵێ: قسەکردن لە عیشقێکی بێگەردی پیاوێکی پاك ئەودیە دینو پیاوەتیو پاکێتی‌یەکەی ڕێگەنەددن بەتێکدانی نێوەندی لەگەڵ خوادا.

٥/ نابێت لەهەر جێگەیەكو کۆڕو کۆمەڵێکدابوو باسی خۆشەویستی‌یەکەی بکاتو ناوی بهێنێو کۆڕی پێگەرم بکات. (ابن القیم الجوزیة) ئەفەرموێ:( پێویستە لەسەری بیشارێتەود. ناوی لای‌خەڵك نەهێنێت، کەسایەتی لەکەدار نەکات.

٦/ نابێت بۆگەیشتن بەخۆشەویستەکەی ڕێگەی نامەشروع بگرێتەبەر، کەلە (کوفرو شیرك)ددود نزیکی بکاتەوە، (ابن القیم) لەوبارددیەود گوتویە: گەر پشتی بەست بەشەیتان بۆگەیشتن بەخۆشەویستەکەی لەڕێگەی سیحر یان هەرشتێکی دی ئەود پەنای بەشرکو زوڵمو کوفرو سیحر بەستووە.

٧/ خۆشەویستیەکی پاك بێ، ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێبێ) فەرمویەتی: نابی بەتەنها لەگەڵی بمێنێتەوە، چونکە پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی:( لا یخلون رجل بامرأة فان ثالثهما شیطان) [1].

وە (میمون) گوتویەتی: دعاني عم رفقال: إني أوصيك بوصية فاحفظها. إياك أن تخلو بامرأة غير ذات محرم، وإن حدثتك نفسك أن تعلمها القرآن)، واتە: عومەر بانگی کردمو پێی وتم: ئامۆژگاری‌یەکت ئەکەم بیگر گوێ، هەرگیز لەگەڵ نافردتی نامەحردم دا بەتەنها مەبە ئەگەر لەدڵی خۆتدا بڵێی قورئانی فێرددکەم) [2].

---

٢٦٥)، وەفەرمودەکەی عائشە (خوای لێرازیبێت)فەرمویەتی(ولا والله ما مست يده امراة قط في المبايعة . . .)( ئا سوێند بەخودا پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەردەستی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە لەکاتی بەیعەت وەرگرتندا) صحيح. اخرجه البخاري في صحيحه (٥٠٤/٨) ومسلم(١٤٨٩/٣) والترمذي (٢٠٢/٢) واحمد في المسند (١١٤/٦ – ١٥٣).

[1] فەرمودەیەکی صەحیحە. ترمزی لە سنن(٣٨٤/٦) هێناویەتیو وتویەتی فەرمودەیەکی (حسن صحيح غريب)ەو طيالسى (٣١) و ابن حبان(٢٢٨٣) أحمد لە مسند(٨/١ ٣٣٩/٣) هێناویەتی، وە زانا احمد شاکر ئەڵێ: ئیسنادەکەی صەحیحە. حاکم لە مستدرك (١١٤/١) هێناویەتیو بە (صحيح)ی داناوە. و (ذهبي)ش بەهەمان شێوە دانانی پێدا ناوە.

[2] بڕوانە ژیاننامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز (ص /٢٣٠) ابن الجوزی ( ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر د.خ):( ألا لايتبين رجل عند امرأة ثيب إلا ان يكون ناكحا او ذي محرم)[٣]. کەسێك لەگەڵ نافرەتێکی بێوەژندا بەتەنها نەمێنێتەوە، مەگەر مێردی کردبێ یان لەگەڵ مەحرەمێکیدابێ. ابن القيم (خوای لێ ڕازیبێ) فەرمویەتی:( ئێمە ئینکاری ئەو عیشقە فاسدە ئەکەین کەخواستی هەوەسبازی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا ئاردەزوودەکا، بەڵکو لەعیشقێکی پاك دەدوێین. لەلایەن پیاوێکی مەرددود کەدین و پیاوەتیو پاکیەتییەکەی نێوەندی خودی خۆیی و خودای گەورەو خۆشەویستەکەی بەخوڕەوشتی خراپ تێك نادات، ئەمە شێوازی خۆشەویستی پیاوچاکانی پێشینان و زانا ناودارەکانە.

## نمونەگەلێك لەعیشقی پیاوچاکان و پێشینان

(١) هەروەك ابن القيم دەفەرموێ:( ئەوە عبيدالله ی کوڕی عبدالله ی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوودە، کەیەکێکە لە(٧) فەقیهە ناودارەکان، ئەویندار کردووە تا کارەکەی لەنێو خەڵکیدا ئاشکرابوەو پێی زانراوەو کەسیش سەرزەنشتی نەکردووە، بەڵکو ئەم سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کەلۆمەیان کردووەو بەستەمکاری ناوبردوون. ئەمەش لەم چەند دێڕە شیعرەیدا:

كتمـــت الهـــوى حتـــى أخرّ بـــك الكتـــم
ولامـــك أقـــوام ولومـــهم ظلـــم
فنـــم عليـــك الكاشـــحون وقبلـــهم
عليـــك الهـــوى قـــد نمّ ولـــو ينفـــع الكتـــم
فـــاصبحت كـــالهندي إذ مـــات حســـرة
علـــى إثـــر هنـــد أو كمـــن شـــفه الســـقم

باس لەوەدەکا کە خۆشەویستییەکەی پۆشیوە. گەرچی ئەو شاردنەوەیەدزەردری پێگەیاندووە، خەڵکیش سەرزەنشتیان کردووەو بەو سەرزەنشتەیان ستەمیان لێکردووە. گەر ناحەزانت دەتکەن بەبابەتی باسوخواسیان. بەڵام خۆشەویستییەکەت بپارێزە، باهەر باست کەن، گەر شاردنەوەی سودی هەیە تاوەکو هیندییەت لێدێت لەتاو خۆشەویستی هیند دا توشی نەخۆشی دێت و دەمرێ.

---

[٣] فەرموودەیەکی صحيحە. مسلم لە صحيحەکەیدا ١٤ (١٧١) (ح) وبیهقی (٧ ٩٨) دەریان هێناوە. ئیمامی نەوەوی ئەڵێت: ئەگەر نەهی لەبێوەژن کرابێت کە خەڵکی هەندێك ناسانکاری تێدانەبینن کەخەلوەی لەگەڵدابکەن. کەواتە کچ بەهەمان شێوە زۆر لەوە زیاتر خەلوە لەگەڵیدا قەدەغەیە. خوای گەورەش زاناترە.

(٣)وە ئەمەش عومەری کوڕی عبدالعزیزە، و (وای لێر ازیبێت): کەخۆشەویستی کەنیزەکی فاتیمە کچی عبدالملك دەچێتە دڵیەوە، کەنیزەکەکە وێنەیەك بوو لەجوانیو شەیدای ببو. هەرچەندە داوای دەکرد کەپێی ببەخشێ، پێی نەدەدا، بەڵام ئەم خۆشەویستییە لەدڵی (عمر)دا مایەوە تابوو بەخەلیفە پاشان داوایکردو بووبەهاوسەری، چیرۆکی ئەم ڕوداوە لەکتێبی (الداء والدواء)ی ابن القیم دا بەتەواوی باس کراوە.

(٣)ئەبوبەکری محمد کوڕی داود الظاهري زانای ناودار، لەگەورەزانایاندو کەخۆشەویستییەکەی دەنگی دابویەوە[1].

دەڵێم:- ئەم پێشەوایانە خۆشەویستیان کردووە، بەڵام کێی ئێمە وەك ئەوان وایە؟ ئەفسوس خۆشەویتی لەئێستادا بووە بەخۆشەویستییەکی سێکس بازی، مەگەر کەسێك خودا ڕەحمی لێبکا. خۆشەویستییەکە بۆمەبەست گەلێك کەتەنها خودا خۆی لێی بەئاگایە، ئەوەتا کچێکی گەنج شوو بەپیرێك دەکا بۆخۆشەویستی ماڵو دارایییەکەی یا پلەوپایەی، ئەوەیە کە ابن عباس پەنا بەخودا دەگرێ لەم جۆرە خۆشەویستییەخۆشەویستییانە نەزانراوە. هەروەك (ابن القیم) گێڕاویەتیەوە کاتێ ئەو خۆشەویستیە خۆشەویستی خوای لەبیردەباتەوە[2].

## دوانیازی خۆشەویستی مارەبڕینە

ئەوەی کەلەزنجیرە درامایییەکانی ئەمرۆدا نمایش دەکریو تیایدا دەڵێن خۆشەویستییەك خۆشەم دەوێی کەبەمارەبڕینو خواستن کۆتایی نایەت، ئەم جۆرە لەخۆشەویستی خۆشەویستییەکی سێکس بازییەو لەوە تێناگوزەرێت، تاوای لێهاتووە ئەمە لەسەرجادەکانو خوێندنگاکان بەئاشکرا دەبیسترێت . . . . پەنا دەگرێن بەخودا.

ئەمەیە کەلە بێباوەڕانو تاوانبارانەوە فێربووین. وە لەکلکەکانیان، ئەوانەی شوێن کەوتەیانن لەلەهەموو شتێکیاندا.

من سەرسام دەبم: بۆشوێن کەوتەی پیاوچاکانی خۆمان نابین؟ بۆ خوێندنەوە بۆمێژوو ژیانیان ناکەین، گەنجەکانمان ئەمرۆکە سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆمانی (پۆلیسیو جاسوسی)ن. کەچی خوێندنەوەی قورئانی نییە، لاپەڕەکانی ژیانی پێغەمبەر(د.خ) هەڵنادەنەوە تافێری دانایيو ئەمانەت پارێزیبن، کەخۆشبەختی دونیاو دوارۆژی تێدایە.

---

[1] الداء والدواء ص ٢٤٨.

[2] الداء والدواء ص ٢٤٠.

ـەو گەنجانەی سەرقاڵی خوێندنـەوەی ئـەم جۆرە کتێبانـەو کتێبگـەلێکن لەسـەر (جنـس و سـێکـ ـزی) هەرگیز ئامادەگی بەرەنگاربونەوەی دوژمنایـان نـامێنێت، بـەڵام لەپێشدا سەرزەنشتی ئـەو کەسـانە دەکـەم کەئـەوجۆرە لەنوسـین دەخەنـە ناوزبـازار، کەپێچەوانـەی شـەرع و سـوننەتی پێغەمبەر(د.خ)و سروشتی مرۆڤایەتیە.

ـەڵێ دەبێ مەبەستی خۆشەویستی ماردبڕین و خواستن بێ، هەروەك پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ :( نە یر للمتحابیین مثل النکاح)[١].

دەمەوێ بەگوێی لاوانی کچ وکوڕدا بچپێنم: کەبزانن ئەمڕۆکە ووشەی خۆشەویستی و ئـەوینداری ـمزۆری بووەتە ووشەیەك مەبەستی لەشفرۆشی و بازرگـانی ئـامێزی لەپشتەوەیە – مەگـەر خـودا ڕەحم بەکەسێك بکات ، وەبزانن خۆشەویتی ڕاستەقینە لەدوای هاوسەرگیری دێتە ئاراوە لەڕێگەی ـۆزو چاکەوە کەخوادای گـەورە دەیخاتـە دڵی هەردوولایانـەوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێ:( وجعل بینکم مودة ورحمة)(الروم: ٢١)، (ابن القیـم) فـەرمودەی (یامعشر الشباب )دەهێنـێ، دەفـەرموێ:( خۆشەویستی بەدوو شت چارەسەردەکرێت ( أصلي – بدلي)[*]، وەفەرمان دەکـا بـە ئـەصلی و دەڵێ ئەوە چارەسەرە بۆ ئەو گرفتە، وەنابێ لەوە چارەسەری باشتر بگیرێتەبەر[٢].

---

[١] ئەم فەرمودەیە لەهەموو ڕێگەکانی گێڕانەوەیدا (حسن)ە.

[*] مەبەست لە(أصلی) هاوسەرگیرییە وەرگێر –.

[٢] بڕوانە (زاد المعاد) ٢٧٢/٤ – ٢٧٣ – ٢٧٤) بە تحقیقی (شعیب الأرناؤوط).

## چارەسەری خۆشەویستی

دەبێ بزانیت – خوای گەورە منیش و تۆش ڕێنمایی بکات بۆئەوەی خۆی پێی ڕازی‌یە – کەخۆشەویستی بەرەهایی نەخۆشی نی‌یە، بەڵکو پێش ئەوەی نەخۆشی‌یەك بێت چارەسەرە بۆ زۆرێك لەدڵەڕاوکێ‌و کێشەکان، هەندێ‌جار پزیشکەکان ئامۆژگاری دەکەن وەکو چارەسەر بۆ گرێ‌دەرونی‌یەکان‌و تووش بوون بەخەمۆکی(کآبة)تاقی بکرێتەوە، چونکە بەخۆشەویستی دڵ هەست بەگەشانەوە دەکات‌و دوور دەکەوێتەوە لە بێ‌تاقەتی‌و بێ‌هیوایی‌و نیگەرانی.

بەڵام لەکاتێکدا دەبێ بەنەخۆشی کەسنوورەکانی خۆی ببەزێنێ، یاخود بەشێوەی شیاوی خۆی بەکارنەبرێ، وەلەم ساتانەدا پێویستی بەچارەسەرە، لەفەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ)دا هاتووە کەدەفەرموێ:(ما أنزل الله من داء الا وأنزل له دواء) واتە خوای گەورە نەخۆشی‌یەکی نەهێناوەتە ئاراوە مەگەر چارەسەرەکەی لەگەڵیدا دابەزاندبێ، وەلەچارەسەرەکانی خۆشەویستی پێش ئەوەی تووشی ببێ.

## خۆپاراستن باشترە لەچارەسەرکردن

چاوەکانت بپارێزە چونکە یەکەمجار هیچت لەسەر نی‌یە، بەڵام جاری دووەمت لەسەر دەکەوێ. مشتەریانە بۆی مەڕوانە،خوای گەورە ئەفەرموێ:( قُلْ للمؤمنين يغضُوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبيرٌ بما يصنعون ، وقُلْ للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن)(النور: ٣٠ ٣١)، بەپیاوانی ئیماندار بڵێ چاویان بپارێزن لەسەرنجدانی ئافرەتی نامەحرەم، هەروەها ناموس‌و عەورەتی خۆیان لەحەرام بپارێزن. بێگومان ئەوە چاکترو پوختەترە بۆیان.( بۆ دڵ‌و دەروون‌و ڕەوانەت‌و ڕۆح‌و لاشەیان). بەڕاستی خوا ئاگادارە بەوهەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتارانەی کەدەیکەن، بەئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ چاویان بپارێزن لەتەماشای نامەحرەم)[1].

تێبینی بکە چۆن خوای گەورە جیاکاری لەئایەتەکانی (قل للمؤمنين)و(قل للمؤمنات) دەکات لەبەر مەترسی پاراستنی چاوو گرینگی‌یەکەی، خوای گەورە جارێك پیاوان بەئاگادێنێت‌و جارێك ئافرەتان. چونکە بابەتەکە پەیوەندی بەهەردوو ڕەگەزەکەوە هەیەو هەریەکەش بەجیا. ئەمە لەوبابەتانەیە کەخوای گەورە بەجیا هەردوو ڕەگەزەکەی لەسەر دەدوێنێ.

---

[1] تەفسیری ئاسان.

سەردتاکەی سەرنجدانە. لەدوای ئەوە خوای گەورە ئاماژە بە (ویحفظوا فروجهم) دەکا. سەرەتا سینو دوایی پێکەنینو پاشان سەلامو دوایی گفتوگۆو موعد دانو پێگەیشتنو تاددگاتە دەرئەنجام:

كل الحوادث مبدأها من النظر ومعظم النار من مستصغر الشرر

كم نظرة فتكت في قلب صاحبها فتك السهام فلاقوس ولا وتر

يسر مقلته ما ضر مهجته لا مرحبا بسرور جاء بالضرر

والمرء ما دام ذا عين يقلبها في أعين الغيد موقوف على الخطر

زۆربەی ڕوداودکان سەرەتاکەی لەبینینەودیە، هەرودك چۆن ئاگر سەرەتاکەی پزیسکێکەو پاشان بڵێسە ئەسێنێ. ئەو سەرنجدانەیە دڵ بەهیلاك دەباو بەرتیرێکی دەخا کەبەبێ کەوان هاوێژرابێ. گەرچی خۆشیەکی کاتی هەیە، بەڵام سودی خۆشیەك چیە زەرەرێکی لەدوابێ ؟!

کەواتە خۆپاراستن چاکترە لەچارەسەرکردن! برای بەڕێزم، با ئەم ئایەتەپیرۆزەت لەبەرکردبێ :( قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون)(النور/٣٠)بیخوێنەو بیلێرەودو بەزۆرەکەتدا یا بەسەیارەکەتدا هەڵیواسە ئەگەر پێویستی کرد.

بیرکردنەود لەدەرئەنجامەکانی

بیرکردنەودو تێڕامان لەو تایبەتمەندیانەیە کەمرۆڤی پێ لەگیانداران جیادەکرێتەوە، کەوایە مەرج نیە ئەودی بەبیری مرۆڤدا بێت کوتوپڕ ئەنجامی بدات بێبیرلێکردنەوە لەدەرئەنجامەکەی، چونکە بەردو چەندین نەخۆشی مەترسیدار هەنگاوی پێدەنێ، کەدواهەمینیان نەخۆشی (الإيدز)ە کەنەمرۆکە بەهەزارەها لەجیهاندا قوربانی ئەو نەخۆشیەن، زۆرێك لەوانەی کەکەوتونەتە داوی ئەم نەخۆشیە مەترسیداردوە لەبەرهەمی پەیوەندیەوە بووە بەئافرەتێکەوە یان زیاتر، وەیا ئەونەخۆشیە سێکسیانەی کەلەوانەیە ئافرەت بۆمێردەکەی یاپیاوان لەئەنجامی کاری بەدڕەوشتیان لەگەڵ ئافرەتانی تری وەك خۆیاندا بیگوێزنەوە بۆئافرەتانی موسڵمانی پاك خاوێن. هەندێ جار لەبەرئەنجامی گوناهکاری یەوە منالی زۆڵی لێدەکەوێتەوە، خودا بمانپارێزێ، پاشان چ بەڵاو نەهامەتییەك بەسەر کچاندا دەهێنێ، وەئەو منالەی لەو پەیوەندیە نامەشروعەوە دروست دەبێت.

کەسێك دوای ئەودی تەوبەی کردبوو پێی ووتم: لەگەڵ ئافرەتێکی بێوەژنی نەزۆکدا کەمنداڵی نەدەبوو زینای کردبوو، کەچی بەهۆی ئەوکاردوە دوانەیەکی بوو.

* ئەی ئەوكەسەی بیرلەدەرەنجامەكەی ناكەیتەوە! دەتەوێ بەرپرسیاربی لەبەرامبەر مرۆڤێك كەتازە دێتە دنیاوەو نازانێت باوكی كێیە؟ وە ژیانێكی پڕ لەپەژارەو سەرگەردانیو نەخوازراو دەباتەسەر ؟!!

* هەندێك جار تووشی بەلایەك دێیت لەدونیا ژیانی خۆتو خێزانەكەت تێك دەدا، بەلام خوای گەورە پەردەپۆشی دەكات بۆت، بەلام گەربێتو لەسەر ئەوكردارە بڕۆیت ئەوا خوای گەورە ئابڕوت دەبات لەڕۆژی دواییدا.

* خاڵێكی دیكە: تێك چوونو گەندەڵ بوونی دەرونە، مرۆڤ لەدوای ئەوەی خۆشی تەنها لەئافرەتێك نابینێت، بەڵكو دەیەوێ پەیوەندی لەگەڵ چەند ئافرەتێكدا هەبێت. وەئاردەزوی لەخێزانی یا مێردەكەی ناكا یاخود بڵێین: بەهۆی حەرامەوە چێژ لە لەحەلاڵ نابینێ. لەوانەیە هەستو سۆزی لەدەست بدات.

* ئەو گەنجەی ئالودەی كات بەسەربردن بووە لەگەڵ سۆزانیاندا گومانیش لەخێزانە پاكەكەی خۆی دروست دەكات، كەبەهەمان شێوەی خۆی خیانەتی لێبكات. بەمەش ژیانی هاوسەرێتییان دەبێتە دۆزەخ، هەموو ئەمەش بەرەنجامی ئەوگومانەیە كەخۆی بەهۆی خراپەكارییەكانیەوە بەسەر خۆیدا هێناویەتی.

كەسی ژیر: ئەوكەسەیە واز لەپەیوەندییەكانی دێنێت لەبەرخاتری هاوسەری خۆشەویستی، ئەو هاوسەرەی گەركاتێ درەنگ هاتیتەوە چۆن تووشی دڵەڕاوكێ دەبێت بۆت.

چارەسەری خۆشەویستی پاش ئالودەبوون پێی

پەیوەندی هاوسەرێتی

ئەو چیرۆكە خۆشەویستیانەی لەمێژوودا تۆمار كراوەو پاڵەوانەكانیان لەهاوسەرگیریدا بەیەك نەگەیشتوون وەك ( جميل وبثينة – كثير وعزة – قيس وليلى )پێچەوانەی فیترەتی مرۆڤایەتیە. كەواتە مەبەستو چارەسەری خۆشەویستی هاوسەرگیرییە. وەخوای گەورە لەهاوسەرگیریدا بێنیازیو ئارامیو ڕازیبون بەخێزانەكەی بەخشیوە، وەلەهەموو ئافرەتانی دنیاخۆشەویستری دەكا، ئیمامی موسلیم لەجابرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە كەپێغەمبەر(د.خ) ئافرەتێكی بینی. پاشان ئەچێتە لای زەینەبی خێزانیكەپێستەی خۆش ئەكرد، كاری شەرعی لەگەڵ ئەنجام دا، پاشان

گەڕایەوە لای هاوەڵانیو فەرمووی:( ئافرەت لەوێنەی شەیتاندا دێتو دەچێت[*]. جا هەرکاتێك جۆتان کەوتە سەرئافرەتێك بچنە لای خێزانەکانتان بۆ دامرکانەوەی حەزەکانتان). واتای فەرمودەکە ئەوە دەگەیەنێت، هەرکاتێك ئافرەتێکتان بینیو ئارەزووتان لێکرد بچنە لای خێزانەکانتان بۆ دامرکانەوەی ئارەزوتانو پەیوەست بوونی دڵتان بەخێزانەکانتەنەوە.

وەبێگومان لەبارەی ( المراة تقبل في صورة الشيطان وتدبر في صورة الشيطان) زانایان فەرمویانە ئاماژەیە بۆئارەزو هەڵنان بۆفیتنە، لەوەی کەخوای گەورە ئارەزوو حەزی لەپیاواندا دروست کردووە بۆچێژ وەرگرتن لەئافرەتان لەسەیرکردنیان، هەروەکو شەیتان چۆن هەڵمان دەنێو وەسوەسەمان بۆدروت دەکات خراپەکانمان لەلاجوان دەکات، هەروەها ئەوەشی لێبەدەست دێت لەم فەرمودەیەدا کەئافرەتان بۆ پێوستیەکانیان نەبێ لەوناوەدەکانی پیاودا هاتوچۆنەکەن، هەروەك پێویستە لەسەر پیاوانیش چاوەکانیان بپارێزن لەئاستی ئافرەتان.

هەروەها زانایان فەرمویانە: پێغەمبەر(د.خ) بەکردەوە ئەمەی کرد تاهاوەڵانی ڕێنمایی بکات ئەوانیش بەهەمان شێوەبکەن. هەروەك بەزار بیستیان بەکردەوەش ئەنجامیدا، وەهەرکاتێك ئارەزویان کرد ئاوێزانی خێزانەکانیان بن، گەرچی سەرقاڵیەکیشیان هەبێ، تا ئەوئارەزووە کاریگەری خراپ لەسەر لاشەو دڵو چاوی دروست نەکات، خوای گەورەش لەهەموان زاناترە.

ابن ماجە(١٨٤٧) وە حاکم (٢٧٢٤) وە جگە لەوانیش بەسەنەدێکی باش گێڕاویانەتەوە، لە ابن عەباسەوە کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی ( لم نر للمتحابيين مثل الزواج )، ئازێزان بوونی حەڵاڵ بەزارەی دڵەکان لادەباتو شیفا بەدڵەکان دەبەخشێت، جائەگەر بەو ئافرەتە نەگەیشت کەخۆشی دەوێت ئەوا لەنمونەی ئەو لەئافرەتاندا زۆرە.

ئەوکەسەی نەیتوانی بەحەڵاڵی بگات بەخۆشەویستکەی ئەوا پێویستە:-

دوور کەوێتەوەو نائومێد بێ لێی

گەرچی دابڕان ئازارێکی بەسۆیە، بەڵام ئەمە چاکترە لەئەشکەنجەیەك کەلەناختا بت سوتێنێ، هەربۆیە هەوڵبدە بەپاکێتی بمێنیتەوەو بەپشتیوانی خودا بەسەر خۆتا زاڵ بیت، هەروەك پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی:( ومن يستعفف يعفه الله، من يستغن يغنه الله، ومن يتصبر يصبره

---

[*] ئەمە سەرزەنشتی ئافرەت نیە وەکو ئافرەت، بەڵکو قسەکردنە لەسەر ئەوحاڵەتانەی ئافرەت کەدەجەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی پیاوو حەزەکانی دەوروژێنێ. ئەگەر پیاویش هەمان بارودۆخ بۆئافرەت دروست بکات هەمان حوکمی هەیە - وەرگێر - .

الله. وما يعطي أحد عطاء خيرا وأوسع من الصبر )(متفق عليه). وه هەركەسێك لەبەرخاتری خودا واز لەشت گەلێك بهێنێت خوای گەورە بەباشتر جێگەی بۆ پڕدەكاتەوە.

فإن سأل الواشون فيما هجرتها؟ فقل: نفس حر سليت فتسلت

دایكی الضحاك المحاربة وتویەتی:

ســـــــألت المحبـــــــين الذيـــــــن تحملـــــــوا
تبـــــاريح هـــــذا الحـــــب مـــــن ســـــالف الدهـــــر
فقلـــــت لهـــــم مـــــا يذهـــــب الحـــــب بعدمـــــا
تبـــــوء مـــــا بـــــين الجوانـــــح والصـــــدر ؟
فقـــــالوا: شـــــفاء الحـــــب حـــــب يزيلـــــه
لآخـــــر أو آنـــــأي الليـــــل طويـــــل علـــــى الهجـــــر
لأو اليـــــأس حتـــــى تذهـــــل النفـــــس بعدمـــــا
رجـــــت طمعـــــا واليـــــأس عـــــون علـــــى الصـــــبر

پرسیام كرد لەوخۆشەویستانەی كەلەدێرزەمانەوە شەوقی ئەم خۆشەویستیەیان چەشتووە. وە پێم گوتن خۆشەویستی چۆن لەدڵ دەردەچێت لەكاتێكدا نێودندی پەراسودكان و قەفەسەی سنگدا جێگەی گرتبێ.

گوتیان چارەسەری خۆشەویستی خۆشەویستییە. یادوركەوتنەوە دوای وازلێهێنان یابێ ئومێد دەبێ پاش بەهیوابوون وە بێئومێد بوون پاڵپشتییە بۆ (صبر).

گۆڕینی هەستو سۆزەكان بۆ شت گەلێكی بەپێزو بەرزترو بەنرختر

لەوجۆرە:خۆشەویستی خوای گەورەو سودی بەندەكان، وەنزیك بونەوە لێی بەگوێڕایەڵیو نوێژكردنو خوێندنی قورئانو هاودڵی كردنی پیاوچاكانو زۆر پاڕانەوەو لالانەوە وخۆسەرقاڵكردن

بەكارە گرنگەكان و ئەو كارو بارانەی سوودی دین و دونیای تێدایە . وە سەرقاڵ بەوشتانەی وزەكانی لاوەكان بەرەو سوودی دونیاو دوارۆژ ئاراستە دەكات ( وێنەی وەرزش و فێربوون ... پشت بەستن بەخوای گەورە هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ (ومن يتوكل على الله فهو حسبه) سورە الطلاق ٣ . لەكۆتاییدا دەڵێم : لە ڕاستیدا ئەو دڵەی پڕە لەخەم و خولیاكانی خەڵكی لەوانەیە بەخۆشەویستی تووشی ترپە ترپ و دڵ كوتێ ببێ . بەڵام نابێتە كۆیلەو دیل و ژێر دەستەی .

ـەلام دلە خالیەکان دەبێتە جێ شوێنی هەموو بارێکی لەناکاو و هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێ
ـەدەرگای بدەن و پێیان دەڵێ: وەرن بفەرموون چیتان ـەوێ بیکەن !
ـەی ژیانتان بەرهەم دارکە بە کاری جیدی و بیرکردنەوەی دروست داهێنان کاری بەکەڵك
ـوهاوڕێیەتی باشاندا !
تەنها بیری لە حەزو غەریزەکانت مەکەردوە بەوێنەی ئاژەڵەکان .. بەلکو بیر کەردوە لەو بەخششە
گەورەیەی خوای گەورە پێتی بەخشیوە .. بەخششی ژیری و عەقل ، بەکاری بهێنە لە گوێ ڕایەڵی
ـو ڕەزامەندی خوای گەورەدا تاوەکو بگەیتە کەناری ئاسایش و دڵ ئارامی ... ئاوین داربە، بەلام بۆ
ـاست خۆشەویستیت ببێ ، بەلام بۆکردەوەی چاك! خوای گەورە بت پارێزێ و چاودێریت کا ،
توانای سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خۆیت پێ ببەخشێ ، دڵ و ژیری و دین و دونیات لەهەموو
خراپەو ناساغیەك بپارێزێ !

# جەژنی خۆشەویستی ( ڤالەنتاین )

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درووودو سەلام بۆ سەر ڕۆحی پاکی محمد، وە یارویاوەرو شوێنکەوتوانی بەگشتی: ئەمجا

بێگومان خوای پەروەردگار ئیسلامی وەك ئاین بۆ هەڵبژاردوین، وە ڕازی نابێت لە هیچ کەسێك کە جگە لە ئیسلام ئاینی بێت، هەروەك ئەفەرموێت :( ومن يبتغ غير الأسلام دينا فلن يقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرين)(آل عمران:٨٥) .

وەپێغەمبەر (ص)هەواڵی پێداوین کە چەند خەڵکانێك لە ئوممەتەکەی لە هەندێك لە نەریت و دروشمەکانیاندابە دوای دوژمنانی خودا ئەکەون . هەروەك لە فەرمووودیەکدا هاتووە کە ئەبوسعید الخدری(خ.ل)لە پێغەمبەر (ص)ەوە ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ص) ئەفەرموێ: ((بێگومان شوێن ڕێچکەو ڕێبازی ئەوانە ئەکەون کە لە پێش خۆتاندا بوون. بست بە بست و هەنگاو بە هەنگاو، تەنانەت ئەگەری ئەوان بچنە ڕێگەی کونی گیانداره خشۆکەکانیشەوە(مارمێلکە- قۆڕی _ دایکە مارانە) بە شوێنیاندا ئەڕۆن، هاوەڵان ووتیان: گاورو جولەکە ؟ فەرمووی ئەی گوایە کێ؟ ))

وەبێ گومان ئەوەی کە پێغەمبەر (ص) هەواڵی پێداوین ڕویداوە، وە لەم سەردەمانەی دواییدا لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاوبۆتەوە، کە زۆربەی موسڵمانان شوێن پێی دوژمنانی خوایان هەڵگرتووە لە زۆربەی نەریت و ئاکارو هەڵسوکەوتیاندا چاویان لێکردوون و لە زۆربەی دروشمەکانیاندا لاساییان کردونەتەوە، وە بە بۆنەی جەژنەکانی ئەوانەوە ئاهەنگ ئەگێڕن. وە کرانەوەی ڕاگەیاندن لە نێو گەلاندا کاردکەی بە ئاقارێکی خراپتردا برد، تا وای لێهات دروشمی بێ باوەڕان و نەریتیان بە ڕازاوەیی و سەرنج ڕاکێشراوی و بە دەنگ و ڕەنگەوە لە وڵاتانی خۆیانەوە بۆ وڵاتانی ئیسلامی گوێزرانەوە، ئەوەش لە ڕێی کەناڵە ئاسمانیو تۆڕە جیهانییەکان_ئینتەرنێت_بەوەش زۆربەی موسڵمانان بەو شتە جوانکراوانە سەرنجیان ڕاکێشرا (خوا هیدایەتیان بدات) . بە تایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا دیاردەیەك لە نێوان زوربەی لاوانیموسڵماناندا بڵاوبۆتەوە (بە کوڕو کچەوە) ، کە مژدەی خۆشی تێدانییە، کە خۆی ئەنوێنێت لە لاسایی کردنەوەی ئەو لاوانە بۆ گاوردکان لە ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی( خۆشەویستی)دوە، کە ئەمەش وا ئەخوازێت کە زانایان و بانگخوازان یاساو شەریعەتی خوای گەورە لەم بابەتەدا ڕوون بکەنەوە، کە ئەمەش وەك ئامۆژگارییەك لە بەرنامەی خواو پێغەمبەر(ص) و

ـەرکردەی موسڵمانانەوە بۆ گشت موسڵمانان، تاوەکو موسڵمان بەر چاو ڕوون بێت لە کارەکانیداو ـکەوێتە هەڵوێستێکەوە کە باوەڕەکەی لە دەست بدات کە خوای گەورە پێی بەخشیوە.
ـەمەش پێش چاو خستنێکی کورتە لە لایەك لە زانایانی شەریعەتەوە _خوا پاداشتی چاکەی ـەموویان بداتەوە_ بۆ بنچینەی ئەم جەژنەو سەرهەڵدانیو مەبەست لێ‌ی وە موسڵمان چی لە ـەرد بیکات بەرامبەر بەم جەژنە.

## چیرۆکی جەژنی خۆشەویستی

جەژنی خۆشەویستی دادەنرێت بە یەکێك لە جەژنەکانی ڕۆمانی‌یە بت پەرستەکان کە ـپەرستی لە کاتی ڕۆمانی‌یەکاندا بەربلاوبووە، پێش زیاتر لە حەڤدە سەدە، کە ئەوەش ـدربڕینێکە سەبارەت بە چەمکی بت پەرستی ڕۆمانی بۆ خۆشەویستی خواهی یا خواهانە .وە ئەم جەژنە بت پەرستانەیە چەندین ئەفسانەی هەیە ، کە لای ڕۆمانی‌یەکان بەردەوام بووە، وە لای میراتگرەکانیان لە گاورەکان. دیارترین ئەم ئەفسانەیە:

• ڕۆمانی‌یەکان باوەڕیان وابوو کە (ڕۆمیلوس)دامەزرێنەری شاری (ڕۆما)، ڕۆژێك گورگێك شیری پێداوە. ئەمەش هێزو قوڵی بیرکردنەوەی پێبەخشیوە. ڕۆمانی‌یەکان بە بۆنەی ئەم ڕوداوەوە لە نیوەی مانگی فبرایر (شباط) ی هەموو ساڵێکدا ئاهەنگی گەورەیان گێڕاوە، وله ڕێوڕەسمەکانی ئەوە بووە کە سەگێك و چێیر (بزن)ێکیان سەربڕیوە. وە دوو لاویان ئەهێنا کە باڵیان بە یەکەوە بادرابوو بە خوێنی ئەو سەگەو چێیرە چەور ئەکران، پاشان خوێنەکە بە شیر ئەشۆردران، پاش ئەوە خەڵکێکی زۆر بەرێ ئەکەوتن و ئەم دوو لاوەش لە پێشیانەوە ئەڕۆن و بە ڕێگاکانی ئەو شاردا ئەسوڕانەوە. وە ئەم دوولاوە دوو پارچە پێشستەیان پێ بووە، کە هەرکەسێکیان توش بوایە ئەیانهێنا بە گیانی‌دا، وە ئافرەتە ڕۆمی‌یەکان ئەم بەرکەوتنەیان بە خۆشی‌یەوە وەرئەگرت، چونکە باوەڕیان وابووە کە ئەم بەرکەوتنە نەزۆکی ناهێڵێت و شیفایان ئەدات.

پەیوەندی قەشە(ڤالەنتاین ) بەم جەژنەوە

(قەشە ڤالەنتاین)ناوێکەپەیوەست بووە بە دوو لە قوربانی‌یە پێشینەکانی کەنیسەی گاورەکانەوە، وتراوە کە دوان بوون .وە ئەوەش وتراوە کە یەك کەس بووە و لە ڕۆما مردووە لە ئەنجامی ئەو ئەشکەنجەیەی سەرکردەی قوگی (کلودیوس)لە دەوروبەری ساڵی (٢٩٦ ز) داویەتی، وە کەنیسەی ڕۆماش لەو جێگەیە دروست کراوە کە ئەمی لە سەر مردووە لە ساڵی (٣٥٠ز)بۆ ئەمری ناوەکەی.

وە کاتێکیش ڕۆمانی‌یەکان چونــە ســەرئاینی گــاوری، لــە ســەر ئاهــەنگ گــێڕان بــەو جــەژنی خۆشەویستی‌یەوە مانەوە ، بەڵام لە چەمکی بت پەرستی‌یەکەیەوە گواستیانەوە بۆ چەمکێکی تر کە بـە نـاوی ( شـەهیدانی خۆشەویستی)یـەوە دەر ئـەبرێدرا، کە لـە (قەشـە ڤالـەنتاین)دا خـۆی ئەنواندکە بانگەوازی بۆ خۆشەویستی‌و ئاشتی کردووەوە هەر لـە سـەر ئـەو ڕێگەیەش(بـە پێـی ووتـەی ئـەوان)شـەهید بـووە. وەهـەروەها ئـەم جەژنـە نـاونراوە بـە جـەژنی عاشقان، وە(قەشــە ڤالەنتاین)دانراوە بە چاودێرو تکاکاری عاشـقان، وە لـە بـاوەڕە پوچـەکانیان وابووە کـە لـە ڕۆژی ئەم جەژنەدا نـاوی ئـەو کچانـە کـە لـە تەمـەنی شـوکردندان لـە چـەند پارچەیـەکی لـول کـراودا ئەنوسرێن و لە سەر مـێزێك دائەنرێت، پاشـان ئـەو کوڕە لاوانـە بـانگ ئـەکرێن کە ئەیانـەوێت هاوسەرگیری بکەن کە هەر یەکەیان وەرەقەیەکی لول کراو هەڵئبژێرێت، وە خۆی بۆ خاوەنی ناوە نوسراوەکە تەرخان ئەکات بۆ ماوەی ساڵێك، هەریەکەیان هەڵسوکەوتی ئەوی تر هەڵئەسەنگێنێ، پاشان ئەبن بە هاوسەری یەکتری، یان ساڵی دوایی هەمان تیروپشك لە ڕۆژی جەژنەکەدا دووبـارە ئەکەنەوە.

وە پیاوانی ئاینی گاوری بە ڕووی ئەم لاسایی کردنەوەیەدا هەســتان، وە وایـان دانـا کـە ئـەم کـارە تێکدەری ڕەوشتی کوڕو کچە لاوەکانە، پاشان لە ئیگالیادا پوچەڵکرایەوە کە زۆر ناوبانگی هەبوو تیـایدا و پاشـان لـە هـەردوو سـەدەی هـەژدەو نـۆزدەی زایینـی دا زینـدوو کرایـەوە ، کـاتێك کــە هـەندێك لـە وڵاتـانی ڕۆژئـاواو لـە چـەند جێگەیـەك چـەند کتێبێکـی بچوك ئەفرۆشــرا کتێبــی (ڤالەنتاین)، کە هەندێك هۆنراوەی خۆشەویستی تێدابوو بۆ ئـەوەی هـەر کەسێك بیـەوێت وەك کـارتی پیرۆزبـایی بینـێرێت بـۆ خۆشەویستەکەی ..... هـەروەها چـەند پێشـنیارێکی تێدابــوو سەبارەت بە چۆنێتی نوسینی نامەی دڵداری‌و سۆزداری.

* وە هەروەها ئەوەی لـە بـارەی ئـەم جەژنـەوە وتـراوە : کـاتێ کـە ڕۆمانیـەکان چونـە سـەر ئـاینی گــاوری (دوای دەرکــەوتنی)، وە ئیمـبراتۆر(لکودیوســی دووەم ) لــە ســەدەی ســێیەمی زایینــی فـەرمانڕەوایی ڕۆمـانی ئـەکرد سـەربازەکانی خـۆی قەدەغـە کـرد لـە هاوسـەرگیری، چونکـە بوونــی هاوسەر سەرقاڵیان دەکات لەو شەڕانەی کە هەڵی ئەگیرسان . بـۆ ئەمـەش (قەشـە ڤالـەنتاین ) دژی ئـەم بڕیـارە دەنگـی بـەرز کـردەوەو گرێبەسـتی هاوسـەری ســەربازەکان بەنـهێنی ئـەنجام ئـەدرا، ئیمبراتۆر کاتێ بەم کارەی زانی لە زیندان توندی کردو فەرمانی لەسێدارەدانیدا.

وە لـەزینداندا کەوتـە داوی خۆشەویستی کچـی دەرگـاوانی زیندانەکەوە، ئەمـەش هـەر بـە نـهێنی ڕوویدا چونکە لە شەریعەتی گاوریدا هاوسەرگیری‌و پێکهێنانی پەیوەندیـە سۆزداریەکان قەدەغـە بووە لە سەر قەشەو پیاوانی ئاینی، بەڵکو لای گاورەکان بەردەوامی بۆ هات لە سـەر ئـاینی گـاوری.

ئـتـيـ كـه ئيمبراتۆر لێی خـۆش بـوو بـه مـه‌رجێك وار لـه ئـاینی گـاوری بـهێنیٚ خواكانی رۆمـانی بـه‌رستێت. وه ببێت به یه‌كێ له كه‌سه نزیكه‌كانی ئیمبراتۆرو بیكات به زاوای خۆی. به‌لام (قه‌شـه فـالـنتاین) ئه‌م داوایه‌ی دایه دواوه‌و رازی نـه‌بوو و ئـاینی گـاوری هـه‌ڵبژارد. بـه‌مـه‌ش فـه‌رمانی لـه سـێـدارەدانه‌كه‌ی به سه‌ردا جێ به‌جێكرا له رۆژی (١٤ ی فبرایری‌ساڵی ٢٧٠ ی زایینی) شـه‌وی ١٥ ی مـانگی فبرایر جه‌ژنی (لوبه‌ركیلیا)وه له‌و رۆژه‌وه ناوی لێنرا (قدیس).

وه له كتێبی (قصة الحضارة _چیرۆكی ژیار) دا هاتووه: كه‌نیسه ساڵنامه‌یه‌كی دانا. وه هه‌ر رۆژێكی دانا بۆ قدیسێك‌و وه له به‌ریتانیا جه‌ژنی (قدیس ڤالـه‌نتاین)لـه كۆتـایی وه‌رزی زسـتانـدا دانـرا. وه كـاتێك ئه‌و رۆژه _ له سه‌ر قسه‌ی ئه‌وان_باڵنده‌كان زۆر به گه‌رم و گوڕییه‌وه تێكه‌ڵ ئه‌بن. وه كوڕه لاوه‌كان گوڵ له به‌رده‌می په‌نجه‌ره‌ی ئه‌و كچه لاوانه‌دا دائه‌نێن كه خۆشیان ئـه‌وێن(سـه‌یری _قصة الحضارة ی ول دیورانت ١٥تا ٢٢ بكه ) .

وه پاپا رۆژی مردنی (قه‌شه ڤالنتاین) (١٤ / فبرایر/ ٢٧٠ز) كرد به جه‌ژنیٚ بۆ خۆشه‌ویستی، كه‌واته پاپا كێیه؟ ئه‌ویش گه‌وره‌ترین زانایانه، خاوه‌نی په‌یماننامه‌ی (منظور)ه ، وه جێنشینی (بطرس) ی قه‌شه‌یه. كه‌واته بڕوانه ئه‌م زانا گه‌وره‌یه‌یان. چۆن یاسای بۆ داناون ئاهـه‌نگ بگێڕن بـه بۆنـه‌ی ئه‌م جه‌ژنه داهێنراوه‌وه‌و ئایا ئه‌مه ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ی خوامان بیر ناخاته‌وه كه‌ئه‌فه‌رموێ(اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله والمسيح ابن مريم وما أمروا إلا ليعبدوا إلـهاً واحـدا لا إلـه إلا هو سبحانه عما يشركون )التوبة:٣١

له عـدی كـوڕی حاتـه‌مـه‌وه ئه‌فـه‌رموێ (( چـووم بـۆ لای پێغه‌مبـه‌ر (ص) وه خـاچێكی زێـڕم وه‌ك ملوانكه له ملدا بوو. یه‌كسه‌ر ووتی (ص)ئه‌ی عدی ئه‌م بته فڕێ ده. وه گوێم لێ بوو ئه‌م ئایه‌ته‌ی له سوره‌تی ( البراوه ) ئـه‌خوێنده‌وه(اتخـذوا أحبـارهم ورهبانـهم أربابـا مـن دون الله والمسيح ابـن مريم وما أمروا إلا ليعبدوا إلها واحدا لا إله إلا هو سبحانه عما يشركون)(التوبة:٣١) ده‌فه‌رموێ، خـۆ ئه‌وان ئه‌یان ئه‌په‌رستن. به‌ڵام ئه‌گه‌ر شتێكیان به حـه‌ڵاڵ بكردایـه ئـه‌مانیش حـه‌ڵاڵیان ئـه‌كرد، وه ئه‌گه‌ر حه‌رامیشیان بكردایه ئه‌مانیش به حه‌رامیان ئه‌زانی (رواه الترمذی).

## لە گرنگترین دروشمەکانیان لەم جەژنەدا :

١/ دەرخستنی گەشیودڵخۆشی لەو جەژنەدا، هەروەکو لە جەژنە گرنگەکانی تردا ئەیانکرد.

٢/ گۆڕینــەوەی گوڵــی ســوور ، ئــەویش وەك دەربڕینێــك بــۆ ئــەو خۆشەویســتی‌یەی کــە خۆشەویستی‌یەکی خواهی بــوودلای بــت پەرســتەکان و وە وەك (العشــاق) شــەیدا بوونێــك لای گاورەکان.

٣/بەخشینەوەی کارتی پیرۆزبایی تێیدا، وە لە هەندێکیاندا وێنەی (کیوبید)هەیە کە منداڵێکە دوو باڵی هەیە کە کەوانێك و (نشاب)ێکی هەلگرتووە، ئەو منداڵەش خوای خۆشەویستی بووە لای بت پەرستی ڕۆمان_خوای گەورە زۆر بەرزترو پاکترە لە گومڕایی ئەوان_.

٤/ گۆڕینەوەی وشەی خۆشەویستیو عیشق و دڵداری لەو کارتی پیرۆزبایی‌یانەدا کە لە نێوانی خۆیاندا ئەیانگۆڕی‌یەوە وەك هۆنراوە یان پارچە پەخشان یـان ڕستەی کورت. وە لە هەندێك لە کارتەکاندا وێنەی پێکەنیناویو قسەی گاڵتەجاڕی هەبوودو وە لە زۆربەیاندا ئەم دەربڕینە هەبوود (ببە بە ڤالـەنتاین)ئەمـە وەك چـەمکێکی گـاوری خـۆی ئـەنوێنێ دوای گۆڕانـی لـە چـەمکێکی بـت پەرستی‌یەوە .

٥/ لە زۆربەی هەرێمەکانی گاورەکاندا ئاهەنگی ڕۆژانە سـاز دەکرێـت وە شـەوەکەش بـە ئاهـەنگ و تێکـەڵیو بـە سـەما کردنـەوە ئەمێننـەوەدو وە زوربـەیان دیـاری بـۆ یـەکتری ئـەنێرن وەك : گـوڵ بوخچەی چوکلێت بۆ هاوسەرەکانیان و هاوڕێکانیان و ئەوانەی خۆشیان ئەوێن.

وە بە ڕوانین بۆ ئەوانەی لە پێشەوە خرانە ڕوو لە چەند شتێکی نەفسانە لـە بـارەی ئـەم جەژنـە بت پەرستانەیەوە، ئەم شتانەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە:

**یەکەم**/ئـەم جەژنـە لـە بنچینـەدا بـاوەڕێکی بـت پەرسـتی بـوون لای ڕۆمانـەکان. کـە بـەو جەژنـە خۆشەویستی‌یەکی خواهی دەرئەبڕن بۆ ئەو بتەی کە لـە بـری خـوای گـەورە پەرسـتویانە. کەواتـە هەر کەسێك ئاهەنگ بگێڕێت بـە بۆنـەی ئـەم جەژنـەوە . ئـەوە ئاهـەنگ دەگێڕێت بـە بۆنـەیـەکی هاوبەش پەیداکردنەوە کە تێیدا بتەکانی تێدا بە گەورە دانراوە. خوای گەورە ئەفەرموێ( إنه من يشرك بالله فقد حرم الله عليه الجنة ومأواه النار وما للظالمين من أنصار)(المائدة: من الآيه٧٢).

**دووەم**/ ســەرهەڵدانی ئــەم جەژنــە لای ڕۆمانی‌یــەکان پەیوەســتە بــە چــەند نەفســانەو شــتێکی پڕوپەچەوە کە هیچ هۆشێکی هاوسەنگ پێی ڕازی نابێت. ئەمە سەرەڕای هۆش و عەقڵی موسڵمان کە بڕوای بە خوای گەورەو نێردراوەکانی ( عليهم السلام) هەیە .

ـيـ ئـه هۆشیاری کەسێکی هاوسەنگدا جێی ئەبێتەوە کـە گورگێکـی مێینـە شـیری دابـێ بـە
ـمەزرێنەری شاری (ڕۆما) وە هێزو بیرکردنەوەی قوڵی پێ بەخشیبێ؟ هەروەك لە ئەفسانەی ئەم
جەژنەدا دەردئەکەوێ کە دژ ئەوەستێ لەگـەڵ بیروبـاوەڕی موسـڵماندا، چونکە هێزو بیرکردنـەوەی
ـەشێز لە لایەن خوای گەورەوە ئەبەخشرێ نەك شیری گورگ. بەهەمان شێوە ئەفسانەی ئەوەی کە
ـەکانیان ئەیانپارێزێت لە هەموو زیانێك وە مەڕو ماڵاتەکانیان لە گورگ ئەپارێزێت.

**ـسێیەم** لە بێ ڕەزاترین دروشمەکانی ئـەم جەژنـە لای ڕۆمانـەکان بریتـی بـووە لـە سـەربڕینی
ـەگێك و چتورێك. وە چەورکردنی دوو لاو بـە خوێنـی ئـەو دوو سـەربڕاوەو پاشـان شـۆرینی
خوێنەکە بە شیر ...هتد. ئەمەش هیچ سروشتێکی ڕاست و هۆشێکی دروست پێی ڕازی نابێت.

**چوارەم/** پـەیوەندی قـەشە (ڤالـەنتاین) بـەم جەژنـەوە گومـانی لـە سـەرە لـە لایـەن زوربـەی
ـەرچاوەکانەوەو بە نادڵنیایی ناوی بردووە. بـەلای گاورەکانـەوە باشـتر لایان وایەکە ئـەم جەژنـە
ـەدنە دواوەکە تێیدا چاو لە بت پەرستەکان کراوە. ئـەی بـە لای ئێمـەی موسڵمانەوە چۆنـە؟ کە
ـێمە فەرمانمان پێکراوە جیاواز بین لەگەڵ گاورەکان و بت پەرستەکانی پێش ئەوان.

**پێنجەم/** ئـەم جەژنـە لـە لایـەن پیـاوانی ئـاینی گاورەکانـەوە پوچـەڵ کراوەتـەوە لـە ئیتالیـادا کـە
ـەرچاوەی ڕێڕەوی کاسۆلیکیە . بە هۆی بڵاوبونەوەی ئاکاری نەخوازراو و کاریگەر لە سەر هۆشـی
لاوە کچ و کوڕەکان بە هۆی ئەم جەژنەوە. کەواتە موسڵمانان لە خەڵکی تر لـە پێشـترن بـۆ ئـەوەی
ێی دووربکەونـەوەو ووریـای بـن. وە هەسـتان بـە فـەرمان بـە چاکـەو ڕێگـری لـە خراپـە لـە
ـەرامبەریدا.

* لەوانەیە یەکێك بڵێت : بۆچی ئێمەی موسڵمان ئاهەنگ نەگێڕین بۆ ئەم جەژنە ؟
* وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە لە چەند ڕوویەکەوە دەبێت:

ڕووی یەکەم: جەژنـەکان لـە ئیسلامدا دیـاری کـراون و نـەگۆڕن . ڕێگە نـادرێ بـە زیـادکردنی یـا
کەمکردنی. ئـەوەش بەندایـەتی ئێمـەی موسـڵمانە واتـە بڕیـاری لـە سـەر دراوەو خـوای گـەورەو
پێغەمبەرەکەی (ص) وەك دین بۆ ئێمەیان داناوە.

ابن التیمیە (رحمه الله) ئەفەرموێ: جەژنەکان لە کۆمەڵەی ئەو شتانەن کە خوای گورە وەك دین
باسیان دەکات و ئەفەرموێ(وأنزلنا إليك الكتاب بالحق مصدقا لمـا بيـن يديـه مـن الكتـاب ومـهيمنا
عليه فاحكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع أهواءهم عما جاءك مـن الحق لكل جعلنـا منكم شـرعة
ومنهاجا ولو شاء الله لجعلكم أمة واحدة ولكن ليبلوكـم فـي مـا آتـاكم فاستبقوا الخيرات إلـى اللـه
مرجعكم جميعا فينبئكم بما كنتم فيه تختلفون)(المائدة:٤٨) وەك ڕووگە(قبله)و نوێژو ڕۆژوو، وە

هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان بەشداری کردنیان لە جەژنەکانیانداو لە نێوان بەشداری کردنیان لە بەشەکانی تری دینەکەیاندا، وە لەگەڵ بوونیان لە کۆی جەژنەکانیان لەگەڵ بونیانە لە کوفرەکەیاندا ( پەنا ئەگرین بە خوا). لەگەڵ بوونیان لە هەندێ لە بەشەکان لەگەڵ بونیانە لە هەندێك لە بەشەکانی کوفر، بەڵکو جەژنەکان لەو دروشمە تایبەت و دیارانەیەیان کە ئاینەکەیانی پێ دەناسرێتەوە، وە لەگەڵ بونیان لە جەژنەکانیاندا لەگەڵ بونیانە لە دروشمە تایبەتی و دیارەکانی کوفر.وە گومانی تێدانییە لەگەڵ بونیان لەم جەژنەدا بە گشتیو بە مەرجەکانیەوە کۆتایی سەر لە کوفرەوە دەر ئەکات. بەڵام سەرەتاکەی کەمترینی ئەوەیە کە تاوان و سەرپێچییە . وە پێغەمبەر (ص) ئاماژەی بەم تایبەتییانە داوە کە ئەفەرموێ: ( هەموو نەتەوەو پێڕەوانی ئاینێك جەژنێکیان هەیە، وە ئەمەش جەژنی ئێمەیە) (بخاری:٩٥٢، مسلم ٨٩٢ (الاقتضاء ١\٤٧١- ٤٧٢) .

وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە جەژنی خۆشەویستی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕۆمانی، نەك سەردەمی ئیسلامی، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەم جەژنە لە تایبەتمەندی گاورەکانەو موسڵمان هیچ بەش و پەیوەندییەکیان بەم جەژنەوە نییە.

ڕووی دووەم:ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنی خۆشەویستییەوە خۆ چواندنە بە ڕۆمانییە بت پەرستەکان، پاشان بە گاورەکان لەو شتانەی کە شوێنی کەوتون و لە ئاینی خۆشیان نییە، وە ئەگەر خۆ چواندن بە گاورەکان قەدەغە بێت لەو شتانەدا کە لە دینەکەیاندا بە ڕاستی هەیە _ئەگەر ئەو شتانە لە دینی ئێمەدا نەبێت چۆن دەبێت لەو شتانەدا کە خۆیان لە بت پەرستەکانەوە وەریان گرتووە.

بە گشتی خۆنواندن بە بێ باوەڕان بت پەرست بن یان شوێن کەوتوانی ئاینەکانی پێش ئیسلام حەرامە بە بڕاوەیی جا ئیتر ئەم خۆنواندن و خۆچواندنە لە بەندایەتی (عبادە ) یەکاندا بێت یا خوونەریت و هەڵسوکەوتیاندا، وە لە سەرئەم شتەش بەڵگەیقورئان و فەرمودەو کۆدەنگی(اجماع) زانایان هەیە :

١/ لە قورئانی پیرۆزو ووتەی خوای گەورە(ولا تكونوا كالذين تفرقوا واختلفوا من بعد ما جاءهم البينات وأولئك لهم عذاب عظيم) (آل عمران:١٠٥) ٢/ لە فەرمودەی پێغەمبەر (ص) ئەفەرموێ ( من تشبه بقوم فهو منهم ) ( هەرکەسێك خۆی بە هەرکۆمەڵێك بچوێنێت ئەوە لەوانە ) اخرجه احمد ٢/٥٠ و ابو داود(٤٠٢١)، شيخ الاسلام ابن تيمية ئەفەرموێ( ئەم فەرمودەیە کەمترینی ئەوەی لێی وەربگیرێ قەدەغە کردنی خۆچواندنە بە کافرەکان، ئەگەر چی ڕووی دیاری فەرمودەکە

ئەربوونی کەسەکەیە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ(يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصارى اولياء بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فإنه منهم إن الله لا يهدي القوم الظالمين) (المائدة:٥١) ٢/ وە کۆ دەنگی زانایان. لە ئیبن التیمیەوە وەرگیراوە کە ڕای براوە لە سەر ئەوەیە کە خۆچواندن بە بێ باوەڕان لە جەژنەکاندا قەدەغەیە . وە لە سەردەمی هاوەڵاندا (خ .ل)، هەروەك لە ئیبن القیم وەرگیراوە کە کۆدەنگی زانایان لە سەر ئەمە هەیە ( سەیری الاقتضاء ١/٤٥٤، واحكام أهل الذمة٢/٧٢٢ ٧٢٥ ) بکە.

٤: خوای گورە نەهی کردووە لەوەی کە چاو لە بێباوەڕان بکرێت، وە ئاگادار کردنەوە لەم شتەو ترساندنی لە زۆر ئایەتی قورئانداو بۆنەی جۆراوجۆرو شێوازی هەمەجۆر باس کراوە. بە تایبەتی چاو لێکردنی بێباوەڕان. جارێك بە واز لێهێنان لە دواکەوتن و بە گوێ کردنیان وە جارێك بە ئاگادارکردنەوە لێیان و سەرسام بوون و هەڵخەڵەتان بە فێڵەکانیان و دان نان بە بیروڕاکانیانداو گرێگەربوون بە کارو ناکارو هەڵس وکەوتیان. وەجارێکی تر بە باس کردنی هەندێك لەو حووانەیان کە موسڵمانان پشتی لێ هەڵئەکەن.وە زورترین ئەو کەسانەی کە قورئان موسڵمانانی لێ ئاگادار کردۆتەوە، جولەکەو دوو ڕوودکانن، پاشان دوای ئەوان گاورو هاوبەش پەیداکەرەکانن بە گشتی. وە خوای گەورە لە قورئاندا چاو لە بێباوەڕان کردن و بە قسە کردنیان و ئەوانەش کە موسڵمان لە دینی خوا ئەکەنە دەردوە بە باشی ڕوون کردۆتەوەو داوای لە موسڵمانان کە بە گوێی بێ باوەڕان نەکەن و شوێنی خوو نەریتە خراپەکانیان نەکەون. و چاو لێکردن کەموکوڕی لە کەسێتی موسڵماندا دروست دەکات، لە هەست کردن بە بچوکی و کەمی و لاوازی و ڕوخان و پاشان لادان و دوورکەوتنەوە لە ڕێڕەوو ئاینی خودا.

بێ گومان بە ئەزمون ئەوە سەلمێنراوە کە سەرسام بوون بە بێباوەڕان و چاولێکردنیان هۆیەکە بۆ خۆشویستنیان و متمانەی ڕەها پێدانیان و ڕوتێکردنیان. وە خۆ بێگانە کردن لە ئیسلام و موسڵمانان و پاڵەوانانی و کولتورە گران بەهاکەی و نەبوونی زانیاری بەرامبەر هەموو ئەو شتانە.

ڕووی سێیەم: مەبەست لە جەژنی خۆشەویستی لەم سەردەمەداو بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی لە نێوان خەڵکیدا بە گشتی بە باوەڕدارو بێباوەڕەوە، گومان لەوەدا نی‌یە کە خۆشویستنی بێباوەڕان قەدەغەیە . خوای گەورە دەفەرموێ (لا تجد قوما يؤمنون بالله واليوم الآخر يوادون من حاد الله ورسوله ولو كانوا آباءهم أو أبناءهم أو إخوانهم أو عشيرتهم أولئك كتب في قلوبهم الأيمان وأيدهم بروح منه ويدخلهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها رضي الله عنهم ورضوا عنه أولئك حزب الله ألا إن حزب الله هم المفلحون) (المجادلة:٢٢). زانایان ئەفەرموون :( خوای گەورە

ئەفەرموێت موسڵمانێك نىیە خۆشەویستی بێ باوەڕ لە دڵیدا بێت. وە هەر کەسێك دڵی بە لای کافردا بڕوات موسڵمان نىیە، وەخۆ چواندنیش لە ڕووکەشدا گومانی خۆشەویستی لێ دەکرێت بەوەش قەدەغە ئەبێت- خوای گەورەش زاناترە.

ڕووی چوارەم: ئەو خۆشەویستیەی لەم جەژنەدا مەبەستە هەر لەو کاتەوە کە گاورەکان زیندویان کردۆتەوە شەیدا بوونێکی دڵخوازی دەردودی چوارچێوەی ژیانی هاوسەریە. وە ئەنجامی ئەمەش: بڵاوبونەوەی زیناکاری‌و خراپەیە، هەر لە بەر ئەوە پیاوانی ئاینی گاوری لە کاتێك لە کاتەکاندا دژی وەستاونەتەوەو پاشان هێنراوەتەوە بۆ جارێکی تر. وە زۆربەی لاوان بۆیە یادی ئەکەنەوە چونکە زوربەی ئارەزووەکانیانی تیادا جێ بەجێ بووە. بە بێ ڕوانین بۆ ئەوەی کە ئەمە چاولێکەرییە یان خۆ چواندنە، کەواتە با پێکەوە بۆ ئەم دەردە بڕوانین کە هۆی بڵاوبونەوەی زیناو کاری خراپەیەپەنا ئەگرین بە خوای گەورە .

هەندێك پرسیار ئەکەن‌و ئەڵێن:- ئێوە بەم کاردتان ئەتانەوێ بێبەشمان بکەن لە خۆشەویستی. وە ئێمە لەم ڕۆژەدا تەنها هەست‌و سۆزی خۆمان دەرئەبڕین. ئەمە چی خراپەیەکی تیا ئەڵێین:-

**یەکەم:** هەڵەیە کە ئێمە ڕووی دەردودی ناوی ئەم رشوە تێکەڵ بکەین لەگەڵ ئەو مەبەستانەی کە لە پشت ئەمەوەیە، وە مەبەست لە خۆشەویستی لەم ڕۆژەدا بریتییە لە شەیدایی‌و عیشق‌و گرتنی خۆشەویست، بەمەش ئەو ڕۆژە ئەبێت بە ڕۆژی ڕەهایی سێکس بەبێ کۆت‌و سنور، وە ئەم جۆرە کەسانەش باس لە خۆشەویستییەکی بێگەرد ناکەن لە نێوان پیاووخێزانەکەیدا یان ژن‌و پیاوەکەیداو یان بە لای کەمەوەجیاوازی ناکەن لە نێوان خۆشەویستییەکی ڕێگەپێدراو لە پەیوەندی نێوان دوو هاوسەردا لەگەڵ خۆشەویستییەکی ڕێگە پێنەدراودا لە نێوان عاشقان‌و سێکس بازەکان . وە جەژن لای ئەوان هۆی دەربڕینە لە خۆشەویستییەکی کۆمەڵەکی.

**دووەم:**- دەربڕینی هەست‌و سۆز ڕێگە نادات بە موسڵمان کە ڕۆژێك دابمێنێت‌و ئەو ڕۆژە بە گەورە بزانێت‌و لە لایەن خۆیەوە بۆ ئەو مەبەستە تایبەتی بکات و وە ناوی بنێت جەژن‌و وەك جەژنێك مامەڵەی لەگەڵدا بکات. ئەگەر وابێت ئەی باردکە لەگەڵ جەژنەکانی بێبڕوایان چۆنە!

لە ئیسلامدا مێرد خێزانەکەی خۆی بە دریژایی ساڵ خوش دەوێت‌و ئەم خۆشەویستییەش بە دیاری‌و هۆنراوەو پەخشان‌و نامەو شتی تری لەو جۆرە دەر ئەبڕێن،و ئەمە بە درێژایی ساڵ بەردەوامەو پەیوەست نىیە بە هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ساڵ.

**سێیەم:** هیچ ئایینێك بەدی ناكرێت وەك ئاینی ئیسلام هانی خۆشەویستیو هاوسۆزی بەردكنی خۆی بدات. ئەمەش لە هەموو كاتو ساتێكدا، ئەوەك لە ڕۆژێكی تایبەتیدا، بەڵكو شی ئەوە ئەدات كە سۆزو خۆشەویستی لە هەمو كاتو ساتێكدا دەربڕێت.

هەروەك پێغەمبەر (د.خ ) ئەفەرموێ( ئەگەر پیاوێك براكەی خۆی خۆشویست ئەوە با پێی بێت كە خۆشم ئەوێت) ابو داود(٥١٢٤) (الترمذی ٢٣٢٩ ) وهو صحیح .وە ئەفەرموێ ( ناچنە بەهەشت تا بڕوا نەهێنن، وە بڕواش ناهێنن هەتا یەكترێتان خۆش نەوێت. ئایا ڕێنماییتان بكەم بۆ شتێك ئەگەر كردتان یەكترتان خۆش دەوێت؟ سلاوو ئاشتی لە نێو خۆتاندا بلاو بكەنەوە) مسلم، ابو داود.

**چوارەم:** خۆشەویستی لە ئیسلامدا لەوە گشتیو گشت گیرترە لە خۆشەویستی نێوان ژنو پیاو كورت بكرێتەوە. بەڵكو نێوەندو لایەنی هەمە گیرترو بەرز تر هەیە، وەك خۆشویستی خودای بەرزو پێغەمبەرەكەی (د.خ ) و هاوەڵە بەرێزەكان(ڕ.خ )، وە خۆشەویستی خەڵكانی خێرخوازو چاكە كار. وە خۆشەویستی ئایینەكەو سەرخستنی، وە خۆشەویستی شەهید لە پێناو ڕێبازی خوادا، وە جۆرەها خۆشەویستی تر هەیە، وە زۆر هەڵەو مەترسی دارەكە مانای فراوانی خۆشەویستی كورت بكەینەوە لەم جۆرە خۆشەویستیەدا.

**پێنجەم:** گومانی ئەو كەسانەی كە پێیان وایە كە خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری سوودبەخشەو پەیوندیەكی باشە. گومانەكەیان ئەی پێكاوە، هەروەك زوربەی ئەزموونو لێكۆڵینەوەكان ئەوە دەسەلێنن، كە لە لێكۆڵینەوەیەكدا زانكۆیقاهیرە ئەنجامی داوە سەبارەت بە هاوسەرگیری خۆشەویستی( زواج الحب) و هاوسەرگیری پەیڕەوكراو( تقلیدی)، تێیدا هاووە:

ئەو هاوسرگیریەی لە دوای چیرۆكی خۆشەویسیتیەوە ئەنجام دراوە(٨٨٪ ) كۆتایی دۆخەكانی بە دڵە ڕاوكێ كۆتایی هاتووە. واتە ڕێژەی سەركەوتن لە (١٢٪) تێپەڕ ناكات، بەلام ئەو هاوسەرگیریەی ب چاولێكەری (تقلیدی) ناو ئەبرێت ڕێژەی (٧٠٪) ی سەركەوتنی بە دەست هێناوە. بە دەربڕینێكی تر، ژمارەی ئەو دۆخانەی هاوسەرگیری تێیدا سەركەوتووە لە هاوسەرگیری چاولێكەری شەش هێندەی ئەو هاوسەرگیریەیە كە پێی دەوترێت هاوسەرگیری خۆشەویستی.

پاشان ئەگەر تێبینی بكەین لە بارودۆخی كۆمەڵگاكانی ئەوروپا كە ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی جەژنی خۆشەویستیەوەو ڕەواجی پێ ئەدەن و دەپرسین: ئایا بارودۆخی پەیوەندیە

هاوسەرێیەکان لای ئەوان چۆنە؟ وە ئایا شوێنەواری ئەم ئاهەنگو جەژنانە لە سەر مامەڵەی نێوان هاوسەرەکان چیە؟ ئایا هیچ شوێنەوارێکی باشی هەبووە لە سەریان؟

لە لێکۆڵینەوەو سەرژمێرییەکانیاندا هاتووە کە:-

١/لە لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکی ساڵی(١٤٠٧هـ- ١٩٨٧ز )هاتووە کە لە ٧٩٪ ی پیاوان لە ئافرەتان ئەدەن، بە تایبەتی ئەو پیاوانەی هاوسەریان هەیە..!( ڕۆژنامەی القبس ١٩٨٨/٢/١٥ )

٢/ وە لە لێکۆلینەوەیەکدا کە نوسینگەی نیشتمانی ئەمریکی بۆ تەندروستی دەروونی ئامادەی کردووە تێیدا هاتووە کە : ١٧٪ ی ئەو ئافرەتانەی کە ئەگەنە ژووردکانی فریاکەوتن بە هۆی لێدانو ئەزیەت دانی پیاوانو هاوڕێکانیانەوەیە، ٨٣٪ ی پێشتر چونەتە نەخۆشخانە بۆ چارەسەر لەو برینو زامدار کردنانە کە لە ئەنجامی لێ دانەوە بووە. وە لێکۆڵینەوەکە ئەوەشی زیاد کردووە کە زوربەی ئافرەتان بۆ چارەسەر ناچنە نەخۆشخانەو بەڵکو هەر لە ماڵەوە چارەسەر دەکرێن.

٣/لە ڕاپۆرتی ئاژانسی ناوخۆیی ئەمریکی بۆ پشکنینو لێکۆڵینەوە ( F P T )هاتووە کە لە هەموو(١٨) چرکەیەکدا ئافرەتێك لە لایەن پیاوەکەیەوە لێی ئەدرێت.

٤/ وە گۆڤاری (تایم )ی ئەمریکی بلاوی کردەوە کە نزیکەی ( ٤٠٠٠ ) ژن لە نێو نزیکەی (٦٠٠٠٠٠٠ ) ملیۆن ژندا لێیان ئەدرێتو لە ئەنجامی ئەو لێدانە ئەمرنو گیان لە دەست ئەدەن.

٥/ وە لە لێکۆڵینەوەیەکی ئەڵمانیدا هاتووە کە (١٠٠٠٠٠ ) کەمتر نین ئەو نافرەتانەی کە ساڵانە ڕوو بە ڕووی لێدانو سزای جەستەیی‌و دەروونی دەبنەوە کە پیاوەکان پیادەی دەکەن. لوگەڵ ئەگەری ئەوەی کە ئەم ژمارەیە زیاد بکات بەرەو ملیۆن.

٦/ وە لە فەرەنسا نزیکەی ملیۆنێك ڕوو بە ڕووی لێدان ئەبنەوە .

٧/ لە بەریتانیاو لە یەکێك لە ڕاوەرگرتنەکاندا کە (٧٠٠٠ )ئافرەت بەشداری تێدا کردووە. لە ٢٨٪ی وتویانە : ئەوان ڕوو بە ڕووی لێدانو هێرش دەبنەوە لە لایەن مێردەکانیانو هاوڕێکانیانەوە.

کەواتە چۆن دوای هەموو ئەمانە ئەوە بە ڕاست دابنێین کە جەژنی خۆشەویستی سوودی بۆ هاوسەرەکان هەیە؟ وە لە ڕاستیشدا ئەوە بانگەوازێکە بۆ زیاتر لادانو خراپەکاریو پەیوەندی حەرامو خراپ لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا. وە پیاوی ڕاستگۆ لە خۆشەویستی خێزانەکەی حەوجێی بەوە نییە کە خۆشەویستییەکەی بیر بخرێتەوە، بەڵکو ئەو هەموو کاتوساتێك ئەو خۆشەویستییە دەردەبڕێت.

# هەڵوێستی موسڵمان لە بەرامبەر جەژنی خۆشەویستی

ـەوەی کە لە پێشەوە ڕوون کرایەوە هەڵوێستی موسڵمان ڕوون ئەبێتەوە لە بەرامبەر ئەم جەژنەدا کە لەم خاڵانەدا خۆی ئەبینێتەوە:

**یەکەم**:- ئاهەنگ نەگێڕان لە یادیدا، وە یان بەشداری نەکردن لەئاهەنگ گێڕان بۆی و ئامادە ـبوون تێیداو بە هۆی ئەوبەڵگانەی کە لە پێشەوە باسکرا لە سەر قەدەغە کردنی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنی بێبڕوایان.وە سەرژمێریەکان ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە جەژنی خۆشەویستی دووەم بۆنەیە لە دوای (کریسماس) جەژنی لە دایك بوونی مەسیح، وە کاتێك ڕوون بووە کە جەژنی خۆشەویستی لە جەژنی گاورەکانەو لە پلەی دووەمدایە لە دوای (کریسماس)، کەواتە دروست نی‌یە موسڵمانان بەشداری‌یان بکەن لە ئاهەنگ گێڕان لەو بەروارەدا، چونکە ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە جیاواز بین لەگەڵیاندا لە ئایین و نەریت و تایبەتمەندی‌یەکانی تریاندا، وەك لە قورئان و فەرمودەو کۆڕای زانایاندا هاتووە.

**دووەم**:- یارمەتی نەدانی بێ باوەڕان لە ئاهەنگەکانیاندا، چونکە دروشمێکە لە دروشمەکانی بێ باوەڕان، وە یارمەتی دانیان و دان نان پیایدا یارمەتی دانە لە بڵاوبونەوەی بێ بڕوایی و بەرز ڕاگرتنی و دان پیادا نانی.

**سێیەم**:- یارمەتی نەدانی ئەو موسڵمانانەی کە بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ دەگێڕن، بەڵکو پێویستە نکاری‌یان بکرێت، چونکە ئاهەنگ گێڕانی موسڵمانان بە بۆنەی جەژنی بێ بڕوایانەوە خراپەیەکەو دەبێ لابرێ، شیخ الاسلام (ابن التیمیە )(رحمه الله) ئەفەرموێ: ( هەروەك ئەوەی نابێ موسڵمانان خۆیان بچوێنن لە جەژنەکانیاندا، هەمان شێوە موسڵمان نابێت یارمەتی‌یان بدات لەو جەژنەدا، بەڵکو نەهی لەو کارە دەکرێت) ( الاقتضاء۲/۵۱۹-۵۲۰ ).

وە لە سەرئەوەی کە زانایانی ئیسلام دانیان پیادا ناوە، نابێت بازرگانەکان دیاری‌یەکانی جەژنی خۆشەویستی وەك کاری بازرگانی بهێنن، لەو جۆرە پۆشاکێکی دیاری کراو یان گوڵی سوور یان هەر شتێکی لەو بابەتە، هەروەك ئەوەی نابێت دیاری بەو بۆنەیەوە وەربگیرێت، چونکە لە وەرگرتنی‌دا جۆرێك لە ڕازی بوون هەیە بەو جەژنە.

یەکێك لە بانگخوازان ئەڵێن:- ڕوومان کردە یەکێك لە شوێنەکانی گوڵ فرۆشتن لە شارە موسڵمانەکاندا، خۆ ئامادە کردنێکی تەواو بینی، لە سەرەتاوە پێش دوکانەکە فەرشێکی سووری لێ ڕاخرابوو،وە تابلۆی سوور هەڵواسرابوو، وە دیمەنی سوور دانرابوو وە گفتوگۆمان لەگەڵ یەکێ لە کارکەرەکان کردو پرسیارمان لێکرد سەبارەت بە ئاستی خۆ ئامادە کردنیان بۆ ئەم بۆنەیە؟

وەڵامی داینەوە کە خۆ ئامادەکردنەکان باش بوون، وە خواست لە سەری چڕ بووە، پاشان کرێکارەکە پێی وتین کە ئەو زۆر سەری سوڕماوە، چونکە تازە موسڵمان ببو (پێشتر گاور بوو)، وە ئەو ئەم بۆنەیەی لە ئاینی گاوریدا بینیوە، چۆن ئەم هەموو کڕیارە هەنو گاورنینو موسڵمانن.

وە لە چەند فرۆشگەیەکی تردا بینیمان کە گوڵێکی زۆری سوور دانرابوو، وبە نرخێکی زۆر بەرز ئەفرۆشرا، وە کاتێك یەکێك لە ئافرەتە بانگ خوازەکان چووە ژوورەوە بۆ لای کۆمەڵێ قوتابی کچ لە هۆڵی ووتنەوەی وانەکان بۆ ئەوەی دوانیان بۆ بڵێتەوە و تووشی بێ ئومێدیەکی گەورە بووو چونکە بینی کە ئامادە بووان خۆیان سور کردووەو یەکێك گوڵی سووری پێیەو یەکێکی تر شاڵی سووری پێیەویان دەستە سرێکی سوورو یان جانتایەکی سوور یان گۆرەوی سوور....هتد،زۆر مەخابن بۆ کچانی موسڵمان.

## وە هەندێك لەو دیاردانەی تر کە ئەبینریٚ لە نێو موسڵماناندا:-

١- هەموو قوتابیەکی کچ ڕێك دەەوێت لەگەڵ هاوڕێکەیدا کە پەتێکی سوور لە مەچەکی دەستی چەپی ببەستیٚ.

٢- پۆشینی هەر بەرگێکی سوور(بلوز- قردێلە – پێڵاو-..... )، وە ئەمە لە ساڵانی ڕابردوودا زۆر ئاشکرا بووە بە ڕادەیەك کە دەچوینە ومرزەکانەوەدەمانبینی کە زوربەی قوتابیە کچەکانئاوەها جلیان ئەپۆشی وەك ئەوەی جلێکی ڕەسمی بێت.

٣- باڵۆنی سوور کە لێی نوسرابوو( I LOVE YOU )و وە ئاسایی لە کۆتا ڕۆژی خوێندنو لە گۆڕەپاندا دوورلا لە چاوی مامۆستاکان هەڵیان ئەدا.

٤- هەڵکەندنی ناوو دڵو پیتی یەکەمی ناوەکان لە دەست.

٥- بڵاوکردنەوەی گوڵی سوور بە شێوەیەکی بەربڵاو لەم ڕۆژەدا.

دەستەیەك لە کچان ئەچونە هۆڵی وانەکانەوەو لە ڕۆژی(١٤فبرایەر )وە هەموو یەکێك لەوان جلێکی سووری پۆشیوەووێنەی دڵی سووری بە ڕوخساریەوە لکاندووە ، دوای ئەوەی مادەی جوانکاری سوور بە ڕوخساریەوە، وە دەست ئەکەن بە گۆڕینەوەی دیاری سوور لەگەڵ ماچ کردنی گەرمو گوڕی یەکتری، ئەمانە لە زیاتر لە زانکۆیەکی وڵاتانی ئیسلامی دووبارە دەبێتەوە، بەڵکو لە زانکۆئیسمیەکاندا، خوای گەورە ئێمەو موسڵمانان بە دروستی بگێڕێتەوە بۆ ئایینەکەی.

مەوسوعەی عەرەبی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە جوژنی (ڤالەنتاین)سروتێکی تایبەتە ، وەك چاپکردنی هەستوسۆزی خۆشەویستی لە سەر کارتودابەشکردنیبە سەرنزیکەکانو

حوتـەویستاندا، وە هەندێکیان وێنەیەکی بە پێکەنینەوە لە سەر ئەم کارتانە چەسـپ ئەکـەن . وە زۆر جـار لـە سـەری ئەنوسـرێت (ببـە بـە ڤالـەنتاین)، وە زۆر جـار ئاهـەنگی سـەمای ڕۆژانـە بـەو بۆنەیەوە ساز ئەکرێت، وە تا ئێستاو بـەردەوام ئەوروپی‌یـەکان بـە بۆنـەی ئـەم جەژنـەوە ئاهـەنگ ئەگێرن، لە بـەریتانیا فرۆشـتنی گوڵ لـەم ڕۆژەدا گەیشـتۆتە دوو ملیـۆن جنیـهی ئیسـتەرلینی، وە بەردەوام ڕووکردن لێی لە زیادبووندایەوەکۆمپانیاکان لە پێگەکانی خۆیانەوە نامـەی خۆڕایـی بـەم بۆنەیەوە بڵاو دەکەنەوە وەك بەهادارکردنێك بە پێگەکانی خۆیان.

جەژنی (ڤالەنتاین) بۆ زوربەی وڵاتانی عەرەبیو ئیسلامی گوازراوەتەوە، تەنانەت نیـوە دوورگـەی عەرەبیش ( کە خۆیـان بـە یەکـەم شـەێنی ئیسلام دەزانـن) وە بـۆزۆر کۆمـەڵگا کـە وامـان ئـەزانی دوورن لەم شڵەژانەوە، تا ئەوەی نرخی گوڵ یە شێوەیەکی شێتانە بەرز بۆتەوە لەم ڕۆژەدا بۆ(١٠$) لەکاتێکدا لە بـاری ئاسایی‌دا دۆلاروچارەکێك بـوو، وەدوکانـەکانی فرۆشـتنی دیـاری‌پێش بڕکێیـان ئەکردلە داهێنانی شێوەی نوێ بۆ ڤردێلەو دیاری نوێ. وە هەندێك لە خێزانەکان لەو ڕۆژەدا گوڵی سووریان ئەکرد بە پەنجەرەکانیاندا.

* وە لـە هـەندێ لـە وڵاتـابی کـەنداو چـەندین نـاوەندی بازرگـانی ڕێـك ئـەخران لەگـەڵ میوانخانەکانبۆ گێڕانی ئاهەنگ بـەم بۆنەیـەوە، وە زوربـەی شوێنو کۆمـەڵگا بازرگانی‌یـەکان بـە ڕەنگی سوور دائەپۆشران، وە باڵۆنو یاری ئاگرینی سوور لە یەکێك لە چێشتخانە گران بەهاکانی کەنداو بـەرز ئـەبۆوە، بـە ڕێ کـردن لەگـەڵ نەریتـەکانی جـەژنی خۆشەویسـتیو ئەفسـانەکانی ئاینی بت پەرستی چێشتخانەکە نمونەیەکی لە کەسێتی(کیوبید)بتی خۆشەویستی ئـەنواند کـە لە ئەفسانەی ڕۆماندا هەیە کە نیوەی ڕووتە لەگەڵ خۆیو کەوانکـەییو تیرەکـەی، هـەروەك ئـەم نواندنە هەڵئەسا بە هەڵبژاردنی کچو کوڕی (ڤالەنتاین) لە نێو ئامادەبووواندا.

* بەڵام ئەو چێشتخانانەی کـە هـەرزان بـەها بـوون بـە ڕێگـەی تایبـەتی خۆیـان بـەم بۆنەیـەوە ئاهەگیان ئـەگێڕا، کـە هـەندێك لـە شـوێنەکان هەڵئەسـان بـە گۆڕینـی پارچـەکانی لـە شـێوەی ئاسایی‌یەوە بۆ شـێوەی دڵ، وە چەرچـەفی مێزەکانیـان ئـەکرد بـە ڕەنگی سـوور، هـەروەك گوڵـی سوور لە سەر هەر مێزێك دائەنرا بۆ ئەوەی خوشەویستان پێشکەشی یەکتری بکەن .

* دیارترین نەریتەکانی جەژنی خۆشەویستی خاوەنی یەکێك لە دوکانەکانی دیـاری فرۆشـتن لـە کومیت پێش کەشی کرد کە هەستا بە هێنانی کەروێشکی زینـدووی فەرەنسـی بچـوك کـە چاویـان سـوور بـوو، وە بۆینبـاخی کـرد بـە ملی هـەندێك لـەو کەروێشـکانەوە، وە کردنیـە نێـو کـارتۆنو قوتووی بچوکەوە بۆ ئەوەی وەك دیاری پێشکەش بکرێت.

* وە پێویستە کە بەربەرەکانی ئەم دیاردەیە بە جۆرەها شێوە بکرێت بەرپرسیارێتیش لە سەر کۆمەڵگایە.

**چوارەم** :- پیرۆزبایی لە یەکتر نەکردن بە بۆنەی جەژنی خۆشەویستییەوەو چونکە جەژنی موسڵمانان نییە، ئەگەر پیرۆزباییش لە موسڵمان کرا نابێ وەڵام بداتەوە.

ئیبن القیم( رحمه الله) ئەفەرموێ:- پیرۆزبایی بە بۆنەی دروشمەکانی کوفرەوەکە تایبەتە بەوان بوکۆی دەنگ قەدەغەیە، وەك ئەوەی کە پیرۆزباییان لێ بکرێت بە جەژنەکانیانو بەرۆژووبونەکانیان.

وە بڵێت: جەژنت پیرۆز بێت، یان بە هەچ شێوەیەك پیرۆزبایی بکات.

بەم شێوەیە ئەگەر بێژەری ئەم قسەیە لە بێباوەڕی (کوفر) ڕزگاری ببێت ئەوا ووتنی قەدەغەیە، وەك ئوە وایە پیرۆزبایی لێ بکات بە کوڕنوش بردنی بۆ خاچەکەی، بەڵکو ئەوە زۆر گەورەترە لەوەی دەست خۆشی لێ بکات لە مەی خواردنەوەو کوشتنی خەڵکانی بێ تاوانو زیناو شتی تری لەو جۆرە، وە زۆرێك لەوانەی ئایین لای ئەندازەیەکی نییە ئەەوێتە ئەو کارەوەو خۆشی هەست بە خراپی کارەکەی خۆی ناکات، وە هەرکەسێك پیرۆزباییو دەست خۆشی لە هەر کەسێك بکات بەرامبەر کردنی تاوانێك یان داهێنراو(بدعه) ێ کیان بێ باوەڕی(کفر) ێك،ئەوە ئەکەوێتە بەر خشمو تورەیی خوای گەورە (احکام اهل الذمة ٤٤١/١-٤٤٢) .

**پێنجەم**:- پێویستە ڕاستێتی ئەم جەژنەو هاوشێوەکانی جژنی بێ باوەڕان ڕوون بکرێتەوە بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لایان نامۆیە، وە ڕوون کردنەوەی موسڵمان بۆ دینەکەییو بیرەباوەڕەکەییو ئەو شتانەش کە بیروباوەڕەکەی پوچەڵ ئەکەنەوە، ئەمەش بۆ ئامۆژگاری کردنی ئوممەتو بە جێ گەیاندنی ئەرکی فەرمان بە چاکەورێگری لە خراپە.

وە لە کۆتاییدا داوا لە خوا ئەکەین کە موسڵمانان بپارێزێت لە پێهەڵخلیسکانو لە خراپەکارییەکانی نەفسی خۆیان بیان پارێزێتو وە فێڵی دژمنانیان پوچەڵ بکاتەوە، وە ئەو بیسەرووەڵامدەرەوەیە، وە درووو سلاوی خوای گەورەش برژێت بە سەر پێغەمبەرو بنەماڵەو هاوەڵانیدا.

## ( ووتەیەك لە سەر عیشق )

ـ لقيم ( رحمه الله ) ئەفەرموێ: (عیشق بریتیە لە ڕۆچون لە خۆشەویستیدا، بەجۆرێ کە حەز لێکراودکەتەواوی دڵی عاشقەکە داگیر ددکات. تا ئەو ڕادەیەی کە هەرگیز لە بیرکردنەوەی ـدوور ناکەوێتەود. بە جۆرێك کە بەردەوام لەبەر دیدەی خەیاڵی لاناچێت. ئا لەو کاتەدا ددروون ـ جرکە ساتەکانی خواپاکانی ددروونەوە سەرقاڵ ددبێت. یەکسەر ئەو هێزانە لە کار ئەکەون. ـ لەکارکەوتنی بەلا توشی جەستەو گیان (ڕۆح )ددبێت کە چارەسەرکردنی گرانە، بەوەش کەسەکە سیفەتو کرددودو مەبەستەکانی ئەگۆڕێت. ود ئەوانە هەموو مرۆڤەکە لە سەر باری ـایی خۆی لائەدات، هەرودك ووتراود:

الحب اول ما يكون لجاجة تاتي به و تسوقه الاقدار

حتى اذ افاض الفتى لجمع الهوى جاءت امور لا تطاق كبار

خۆشەویستی سەردتا قسەیەکی شێواوو تێکەڵو پێکەڵە کە بە ڕێکەوت دێتە مەیدان، تا ئەو کاتەی مرۆڤ تیایدا ڕۆ ئەچێت وە سەر ئەکێشێت بۆ کاروبارێك کە مرۆڤی گەورە ناتوانێت شان ـاتە بەری. وە خوشەویستی سەردتاکەی ئاسانو سوكو خۆشە، وە ناودڕاستەکەی غەمو ـەرقاڵی دڵو نەخۆشییە، وە کۆتاییەکەی لە ناوچونو کوشتنە، ئەگەر ڕەحمەتو چاودێری خوای گەورە لای لێنەکاتەود .

هەرودك تراود:

و عش خاليا فالحب اوله غنى واوسطه سقم واخره قتل.

واتە : بە تەنهاو دوور لە خۆشەویستی بژی، چونکە خۆشەویستی سەردتاکەی ناڕەحەتییەو ناودڕاستەکەی نەخۆشییەو کۆتاییەکەی کوشتنە.

وە یەکێکی تر ئەڵێ:

توله بالعشق حتى عشق فلما استقل به لم يطق

رأى لجة ظنها موجة فلما تمكن منها غرق.

واتە: بە دوای خۆشەویستیدا گەڕا ناخۆشی ویست ، بەلام کاتێك دەستی لێ گیربوو توانای هەلگرتنی نەبوو. ئاوێکی کەمی بینی وایزانی شەپۆلە ئاوێکی گەورەیە، بەلام کاتێك کەوتە ناوی نقوم بوو.

وه تـاوان تـاوانی خۆیـەتی(واتـە شـەیداکە) وە خـۆی تـاوانی لـە خـۆی کـردووە. وە سـەبارەت بـە چارەسەری ئەم دەردە گرانە:-

شیخ (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ ئەفەرمویّ: وە دەرمانی ئەم دەردە کوشـندەیە بریتـی‌یـە لـەوەی کـە بزانیّـئـەو دەردەی توشـی بـووە دژە لەگـەلّ یـەکتا پەرسـتی. بـەلّکو ئـەوە لـە بـیّ ئاگـا بوونی‌یەوەلـە خـواو یـادی خـوا توشـی بـووە، بۆیـە سـەرلادتا پێویسـتە ئاگـاداری یەکتاپەرسـتی‌و سەننەت‌و ئایەتەکانی خوای گەورە بێت، پاشان بێتـە سـەر بەندایـەتی‌و پەرستنەکانی دەردکـی‌و ناوەکی‌یەکان، بۆ ئەوەی دلّی سەرقالّ بکات‌و بەردەوام بیری لیّ بکاتەوە وەزیاتر مل کەچ بکـات بـۆ خودای بەرزو بـالاّ، وە بـە دلّ بگەڕێتـەوە بـۆ لای ئـەو. وە هیـچ دەرمـانێکی لەمـە باشـترو لـە بـە دلّسۆزی پەرستنی خوای گەورە نی‌یە، وە ئەوەش دەرمانێکە کـە خـوای گـەورە لـە قورئانەکـەیدا باسی کـردووە، لـە کـاتێکدا باسـی چیرۆکی یوسـف پێغەمبـەر (ص) دەکـات. ئەفـەرمویّ: ( كذلـك لنصرف عنه السوء والفحشاء إنه مـن عبادنـا المخلصـين)(يوسـف: مـن الآيـة٢٤). واتـە بەوشـێوەیە بۆئەوەی خراپەوداوێن پیسی لە یوسف دوور بخەینەوە. چونکە ئەو یەکێکە لەو بەندانەی کە بە دلّسۆزی خوا ئەپەرستیّ.

خوای گەورە هەوالّمان ئەداتیّ کە ئەو بۆیە خراپەو داوین پیسی لە یوسف (ص) دا دا چونکە بە دلّسۆزی‌وبیّ ڕیا خوای ئەپەرست، کەواتە ئەگەر دلّ یەکلا ببێتەوە و کردەوەکـان تەنـها بـۆ خـودا ئەنجام بدات ئەوە شەیدا بوون بە وێنە بە سەریدا زالّ نابێت. وە شەیدای وێنەکان تەنها بە سەر ئەو دلاّنەدا زالّ ئەبێت کە لە یادی خوادا بەتالّن. وەك وتراوە:

اتانی هواها قبل ان اعرف الهوی          فصادف قلنا خالیا فتمکنا.

واتە: حەزو خۆشەویستی ئەو گەیشت پێم پێـش ئـەوەی حـەزو ئـارەزوو بناسـم. وە ئـەو حـەزە توشی دلّێکی چۆلّ بوو، وە یەکسەر بە سەریدا زالّ بوو.

با هەموو هۆشیارێك بزانێت کە هۆشیاری مرۆڤـــ پێویست ئەکەن کە بەرژەوەندی‌یەکان بـە دەست بهێنرێت‌و تەواو بکرێن، وەخراپە کاری‌یەکان کەم بکەنەوە.

وە زانراویشە کە خۆشویستنی وێنەکان هیچ بەرژەوەندی‌یەکی ئایینی تێدا نی‌یە. بەلّکو خراپـەی دنیاو دوارۆژی تێدایە، ئەو خراپـەش چـەندان ئـەوەندەی ئـەو بەرژەوەندی‌یەیـە کـەوا گومـان ئەبرێت تێیدا بێت، ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە:

ـكەم: سەرقاڵ بوون بە یادی دروست کراوەکانی خواوەو خۆشویستنی لە جێی یادی خوای گەورە. وەلە یەك دڵیشدا ئەم دوو یادو خۆشەویستی‌یە کۆ نابنەوە، بەڵکو ئەبێت یەکێکیان بە سەر ئەوی تریاندا زاڵ ببێت، لەو کاتەدا دەسەڵاتو زاڵ بوون بۆ ئەو دەبێت.

دووەم: ئازاردانی دڵی بە هۆی خۆشەویستی‌یەکەیەوە، چونکە بێگومان ئەگەر جگە لە خوا کەسێکی تری خۆش ویست هەر بەو خۆشەویستە سزا ئەدرێت، وەك وتراوە:-

| | |
|---|---|
| فما في الارض اشقى من يحب | وان وجد الهوى حلو المذاق |
| تراه باكيا في كل حين | مخافة فراقه او اشتياق |
| فيبكي ان ناوا شوقا اليهم | ويبكى ان دنوا خوف الفراق |
| فتسفن عينه عند الفراق | و تسخن عينه عند التلاق. |

واتە: لە دنیادا لە خۆشەویستەکانی غەیری خودا بەدبەخت تر نی‌یە، ئەگەر چی حەزو ئارەزووی هەست بە هەندێك شیرینی بکات، بەردەوامو لە هەموو کاتێکدا ئەیبینی ئەگریان، لە ترسی جیابوونەوەو تامەزرۆ بوون . ئەگەر لە خۆشەویستەکەی نزیك بێتەوە لە خۆشیا ئەگریا، وەئەگەر لێشی جیابێتەوە هەر دەگریا، کەواتە چاوەکانی بەردەوام فرمێسك ئەرێژن لە کاتی جیابوونەوەو بە یەکگەیشتندا.

وە خۆشەویستی ئەگەر چی خاوەنەکەی ئازار ئەدات بەڵام گەورەترین سزای دڵە.

سێیەم: خۆشەویست دڵی دیلە لە دەستی خۆشەویستەکەیداو بە ئارەزووی خۆی یاری پێ ئەکات. بەڵام لە بەرمەستی هەست بەوە ناکات کە توشی دڵی بووە.

| | |
|---|---|
| كعصفورة في كف الطفل يومها | حياض الردى و الطفل يلهو و يلعب. |

وەك پاساری‌یەك لە دەستی منداڵێکدا بە ویستی خۆی یاری پێ دەکاتو ئازاری ئەدات، وە منداڵەکە بەم کاردی یاری‌و حەزی خۆی جێ بەجێ دەکات، کەواتە ژیانی خۆشەویست ژیانی دیلو کۆیلەیە.

چوارەم: بەو کاردی سەرقاڵ ئەبێت لە بەرژەوەندی‌و کاروباری دنیاو دوارۆژی، هیچ شتێك هێندەی شەیدابوونی وێنەکان بەرژەوەندی‌یەکانی دونیاو دوارۆژ لە دەست نادەن، بەرژەوەندی‌یەکانی ئایین پەیوەستە بەوەوە کە دڵ سەرقاڵ ئەبێ‌و پشت هەڵئەکات لە یادی خوا، شەیدابوونی وێنەکان گەورەترین شتێکە کە دڵ بشێوێنێت‌و پارچە پارچەی بکات. وە بەرژەوەندی‌یەکانی دونیا، لە ڕاستی‌دا بە بەرژەوەندی‌یەکانی ئاییندا هەڵواسراوە، وە لێرەوە هەر

کەسێك بەرژەوەندی ئایینی لە دەست داب ە دوایدا بەرژەوەندی دونیاشی لە دەست دەچی.
وتەکانی شیخ ابن القیم (رحمه الله) تەواو بوو.
وە ئەو شەیدا بوونەی ( کە کچان ناوی ئەنێن سەرسام بوون) لە مەترسی جێگەدایە. شاعیر ئەڵێت:-

تفنى اللذاذة ممن نال صفوتها          من الحرام، يبقى الاثم والعار
تبقى عواقب السوء في مغبتها          لا مرحبا بسرور من بعدة النار.

واتە: ئەو کەسەی بگاتە لوتکەی حەرامەکان لزەتو خۆشی لە دەست ئەدات. ئەوەی ئەمێنێتەوە تاوانو شورەیی‌یە، دوای ئەوە پاشماوەو پاشەڕۆژە خراپەکەی ئەمێنێتەوە، ئەو خۆشی‌یە بە خێر نەیەت کە ئاگر بە دوای خۆیدا ئەهێنێت.
شیخ ابن القیم(رحمه الله ) ئەفەرموێ:-
هەندێ خۆشەویستی ئەبێ بە کوفر، وەك ئەوەی کە خۆشەویستەکەی ئەکات بە خوایەك خۆشی ئەوێت وەك ئەوەی کە خوای خۆش ئەوێت، ئەی چۆنە کە هەندێك جار خۆشەویستی خۆشەویستەکەی لە خۆشەویستی خوای گەورە لە دڵیدا گەورەترە.
ئەمەش جۆرە خۆشەویستی‌یەکە کە لێخۆش بوون بۆ خاوەنەکەی نی‌یە. وە ئەوە لە گەورەترین هاوبەشی داناناکانە بۆ خوای گەورە، وە خوای گەورەشلە هاوبەش پەیداکردن خۆش نابێت. بەڵکو بە تەنها بە تەوبەو گەڕانەوەیەکی وا خۆش دەبێتکە هەموو دووڵیو تاوانەکان بسڕێتەوە.
وە نیشانەی ئەم خۆشەویستی‌یە بێباوەڕی‌یە ئەوەیە کە کەسەکە ڕازیبوونی خۆشەویستەکەی بخاتە سەرووی ڕەزامەندی خوای گەورەوە. وە ئەگەر مافی خۆشەویستەکەیو خوای گەورە تێك گیران، ئەوە مافی خۆشەویستەکەی پێش مافی خوای گەورە ئەخات وە ڕەزامەندی خۆشەویستەکەی پێش ڕەزامەندی خوای گەورە ئەخات، وە شتی بە نرخ بۆ خۆشەویستەکەی خەرج ئەکاتو شتی بێ بایەخ لە ڕێی خوادا خەرج ئەکات. وە ئەو توانایەی بە کاری ئەهێنێت بۆ ڕزامەندی خۆشەویستەکەی زیاترە لەوەی بۆ ڕازیکردنو ڕەزامەندی خوای گەورەخەرجی ئەکات، وە ئەگەر خوای پەرست لەو کاتانەدا ئەیپەرستێ کە لە خۆشەویستەکەی ئەمێنێتەوە. وە کارەکە توند تر ئەبێت، کاتێك کە ئەو کەسەی کە پێی سەرسام ئەبێتکەسێك بێت لە بێ

ـ ڕ ێ ان و له دین ده‌رچوان، ده‌رچوون له دین بریتی‌یه له به‌ربه‌ره‌کانی ئه‌وانه‌ی‌که له ئایینداا به‌ ـبۆیستی ناسراون.

**ی: هۆی سه‌رهه‌ڵدانی ئه‌مانه چه‌ند شتێکه :-**

جۆلی دڵه‌کان له خۆشه‌زیستی خواوپێغه‌مبه‌ره‌که‌ی(ص).

- دڵسۆز نه‌بوون له خۆشه‌ویستی خواو پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی (ص).
- نه‌ڕوانین بۆ سه‌ره‌نجام‌و کۆتایی کاره‌کان.

: یه‌یوه‌ست بوون به وێنه‌وه.

: نه‌ڕوانینێکی ووردو ڕوون به‌وه‌ی‌که لاو په‌یوه‌سته پێوه‌ی.

# کچان و خۆشەویستی

چەند جوانە مرۆڤـ هەست بەگەرم بوونەوە بکات لە ساردترین ڕۆژەکانی زستان و بەجوانی بەهار لە دڵـی پـاییزدا و بـەئاوازی ناسـك و خـەیاڵاوی لـەناو ناسـۆری ژیـان و ژاوەژاو و قورسـایی و خەمـەکانی ! چـەند خۆشـە خـۆت ببیـنی لەسـەر دڵـی پیـاوێك وەك شـاژنێك سـەرەڕای ئـەوەی تـۆ مرۆڤێکی ئاسایت لـەماڵ و نـاو هاوڕێکانت ! چـەند خۆشـە گرنگی پێدانێکی تایبـەتیت هـەبێت سەرەڕای ئەوەی تۆ هیچ گرنگی پێدانێکت نییە لەنێوان کەس و کارو خزماندا ! چەند سازگارە کە ووتەی خۆش ببیستی کەچی دایك و باوك لەماڵدا تەنها کەم و کوڕیەکانت دەبینن.

چەند ئارام بەخشە هەرچی لە دڵ و دەروونتدایە بە ئاشکرایی باسـی بکـەیت و یـەکێك هـەبێت بـە گرنگی پێدانەوە گوێت لێبگرێت! بەڵام کاتێك دایکت گوێت لێدەگرێت خەریکی چێشت لێنانە . یا ماڵ ڕێك دەخات یا هەرشتێکی تر . ئەمە ئەگەر هەر ئامادەبێت گوێت لێ بگرێت !

چ دڵ خۆشیەکە کە گوێت لەو ڕستانە دەبێت باسـی شـتە جوانـەکانی تـۆی تێدایـە . بـەڵام لـەولاوە لەدایك و باوکتـەوە تەنـها گوێـت لـە لۆمـەکردن و ڕەخنــەو هەڕەشــە دەبێـت ! بــەڵام دەرفــەتێك ئازیزەکەم ، ئایا کارەکان گرنـگ کۆتاییەکەی نییـە ؟ کـەچ بـەروبومێکی هەیـە کـۆی بکەیتـەوە ؟! بۆچی بیرلەوە ناکەیتەوە کە پەیوەندیت بە خۆشەویستەوە بـەراوورد بکـەیت بـە پـەیوەندیت بـە دایك و باوکتەوە ؟ بۆچی پرسیار ناکەیت ئامانجی خۆشەویستیت چیە ؟ ئامـانجی دایـك و بـاوکت چیە ؟ ئایا کامیان لەو دوولایەنە ئاواتی ئەوە دەخوازن کە تۆ سەربەرزبیت لە دونیاو قیامـەتدا ؟! وەڵامەکە بۆ خۆت بەجێ دێڵم ..!!

ئایا ئێستا ڕێگـەم پێدەدەیـت بـێ پێـچ و پـەنا قسـەت لەگـەڵدا بکـەم ؟ بـەڵێ خۆشەویسـتی شـتێکی جوانـە بـەڵام مـەخابن خوشکی خـۆم زۆر بـەپاکی درێـژە ناکێشـێ و بەختیاریەکـەی هەرچـەندە بەردەوام بێت زۆر درێژە ناکێشێت بەڵکو زۆرجار هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە سزاو ئازارو پەشیمانی وبێ ئومێدی و هەستکردن بەچەوساوەیی و بـێ نرخـی .... خـوای گـەورە بتپـارێزێ و سـەلامەتت بکات .

بەڵام زیر ئەو کەسەیە خۆی بپارێزێ و لێ ی پرسێ پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ .. بەڵام ئەمەش ئـەوە ناگەیـەنێت کـە خـۆت لەخۆشەویسـتی پـاك بپـارێزی . چونکـە ئـەوە مرۆڤـی ئاسـایی لـە توانایدانیە لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆشەویستی و هەسـت و سـۆزی تیـادا خولقانـدوە .. ئەگـەر سەرنجێکی گەردون بـدەیـت دەبیـنی بناغەکـەی خۆشەویستیە . ئەستێرەکان لـە کۆمەڵـەی خۆیـان

ـــرنین . چونکە بەردەوام لە دۆخی ڕاکێشاندان . هەیڤ دوورناکەوێتەوە لــە هەسارەکەی خــۆی ، جۆکــە پەیوەستــە پێوەی . ئەمــە لــە دروستکراوە مەزنــەکاندا .... خــۆ ئەگــەر بــۆ شــتە وورد و جۆکەکانیش بڕوانــین دەبینــین نــاوکی گەردیلــە جــۆرە ڕاکێشــانێکی تێدایــە لــەنێوان خــۆی و ـەکترۆنەکانی کە بەدەوری خۆیدا ڕێکیــان دەخات ..!! وە خــوای گــەورە خۆشەویستی کردووەتــە ـێیشانی پەیوەندی خــۆی و بــەندە چاکەکانی ، ئــەویش مرۆڤــی بــاوەڕدارە کــاتێك خــوای گــەورە ـــی ئەو بەندانــە دەکات وەسفی پــەیوەندیان دەکات بــە پــەروەردگارەوە هــەروەك دەفــەرموێت ﴿یحبهم و یحبونه﴾سورەتی "المائدة" ئایەتی ٥٤﴾.

ـەت هەر ئەمــەو بــەس بــەڵکو خــوای گــەورە خۆشەویستی کردووەتــە بناغــەی بــاوەڕ بــوون پێــی ، ـەنگەش بۆ ئەوە پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ﴿لایؤمـن أحدکـم حتـی أکـون حب الیە من ولدە و والدە والناس اجمعین﴾ واتە : "کەستان باوەڕتان نییە هەتاوەکو مــنی خۆشتر ـەوێت لە منالّ و دایك و باوك و هەموو خەڵکی"

ـەوە حەزرەتی عومەری کوڕی خــەتتاب خوالێــی ڕازی بێــت بــە پێغەمبــەری دەفــەرمووێ تــۆم لــە هەموو شتێك خۆشتر دەوێت بەس لە خۆم نــەبێت ... بــەڵام پێغەمبــەر (د.خ) چــی پــێ فــەرموو؟؟ ـوتی نەخێر عومەر . دەبێ منت لە نەفسی خــۆت خۆشــتر بوێــت . کــاتێك حــەزرەتی عومــەر پێــی ـەرموو سوێند بەخوا ئێسا لە خۆم زیاتر خۆشم نــەوێیت .. پێغەمبــەر (د.خ) فــەرمووی ئــا ئێســتا ـەی عومەر !! ﴿بوخاری ڕێوایەتی کردووە﴾

خوشکی خۆم بڕوا بەوە مەکە کە دەڵێــت ئــایینی ئیسلام بــێ بەشــت دەکات لــە خۆشەویستی ـرووشتی و ڕێ پێدراو . بەڵکو تۆ بڕوانە حاڵی خۆشەویستان لە ئەستێرە پرشــنگدارو کەسایەتیە دیارەکان ئەوەتا پێغەمبەرمان ئیبراهیم سەلامی خوای گەورەی لێبێت "سارە" خــانی خــێزانی زۆر خۆشدەویست . تاوەکوو هەشتا ساڵ لەگەڵیا ژیاو منداڵی نەبوو بەڵام لەبەر خۆشەویستی ژنی تــری نەهێنا بۆی ئەوەی هەستی برینــدار نــەکات ... سارە خــانی خــێزانی داوای لێکــرد کــە هاجرە خــان بخوازێ تا لەسەر داوای ئەو هاجرە خانی خواست ... هەروەها ئەوەتا پێشــەوامان پێغەمبــەر (د.خ) خۆشەویستی خۆی بۆ عائیشەی خێزانی ناشارێتەوە کاتێك عــەمری کــوڕی عــاس لــە جــەنگی (ذات السلاسل) دا بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە لێی پرسی ئەی پێغەمبەری خودا کێ لات زۆر خۆشەویستە ؟؟ گومانی وابوو کە خۆی بێت بــەڵام پێشەوا (د.خ) لەبــەردەم خــەڵکی پێــی فــەرموو "عائیشــە" ! عــەمر فــەرمووی مــن پرسیاری پیاوانت لێدەکەم ؟ پێغەمبــەر فــەرمووی بــاوکی عائیشــە !! ئایــا خوشکی خۆم بینیت ئەو پاکانەی کە خۆشەویستیەکەیان ڕاستەقینەیە باکیان لــەوە نیــە لــە ڕووی

خەڵکیدا باسی بکەن ، بەڵام ئەوانەی خۆشەویستیەکەیان لەپێناو ئاردزووبازی و حەزی ئاژەڵانەیە و ئەیانەوێت ناموسی ئافرەتی موسڵمان لەکەدار بکەن ئەیانەوێت کاردکانیان بە نهێنی بێت و دووربێت لەخەڵك ، ودك خوای گەورە دەفەرموێت "یستخفون من الناس" خۆشتر ئەودیە خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) بۆ عائشە ببووە کارێك جێ نشینەکان و گەورە هاودڵان بەهەند وەریان دەگرت .

ئەوەتا هاوەڵان چاوەڕوانی ڕۆژی عائیشە دەکەن بۆ ئەوەی دیاری بۆ پێغەمبەری خوا بەرن تاودکوو هاوار لە خێزانەکانی تری پێغەمبەر بەرزبوودوە ، ئەودتا عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت کە بەناوبانگ بوو لەتوندی دا ڕەچاوی ئەو خۆشەویستیەی پێغەمبەری خودای دەکرد بۆ هەریەك لە خێزانەکانی پێغەمبەر (د.خ) دە هەزاری دەبڕیەوە بۆ عائیشە دووهەزاری زیاترکرد !! کاتێك پرسیاریان لێکرد هۆی چیە ؟ فەرمووی ئەوە خۆشەویستی پێغەمبەری خودایە

ئەوەتا مەسروق کە یەکێکە لە زانا پایە بەرزەکانی فەرمووده ئەگەر فەرموودەیەکی لە عائیشە ڕەزای خوای لێ بیت بگێرایەتەوە دەیفەرموو " لە (صدیقە) کچی (صدیقە) خۆشەویستی پێغەمبەری خوداوەیە .

هەروەها ئەو هەڵوێستە بهێنە بەرچاوی خۆت کاتێك عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت دەربارەی خەدیجە ڕەزای خوای لێ بێت غیرەیەك دەنوێنێ ، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت " إني قد رزقت حبها " ... بەم شێوەیە بە سادەیی و بەڕوونی پەیامبەر ووشەکانی دەفەرموو وە دەشیزانی کە ئەو ووتانە بڵاو دەبێتەوە لەناو خەلکیدا تاودکوو ڕۆژی دوایی ... هەروەها لە ئیبن عەبباس دەگێڕنەوە کە پیاوێك هاتەلای پەیامبەر (د.خ) ووتی کچێکی بێ باوکمان لایە . دوو کەس داخوازی کردووە یەکێکیان دەوڵەمەند و ئەوی تریان هەژارە .. پێغەمبەر فەرمووی خۆی حەز دەکات شوو بە کامیان بکات ؟ کابرا ووتی حەز دەکات شوو بەهەژارەکە بکات ... پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی " دوو کەس حەزیان بۆ یەك بوو پێویستە بدرێنە یەکتری " لم یری للمتاحبین الا النکاح" حدیث حسن ، رواه ابن الماجه والحاکم .

پێغەمبەر تورە نەبوو لەو پیاوەی کە پرسیار دەکات کە ئەو دووکەسە حەزیان بۆ یەکتری هەیە و دڵیان سۆزی بۆ یەکتر دەوروژێ . بەڵکو فەرمووی چاکترین شت بۆ دوو کەس کە یەکتریان دەوێت هاوکارییانە لەسەر ژن هێنان و شووکردنیان . هەروەها ئەمە چیرۆکی (مغیث و بریرة) کە هەردووکیان هاوسەری یەکتری بوون و پێشتر هەردووکیان کۆیلە بوون . بەریرە داوای جیابوونەوەی لە (مغیث) کرد جیابوودوە بەڵام (مغیث) هەرخۆشی دەویست و دڵی بۆی دەسووتا و

ـ ڕێگاوبانەکان هەر بەدواوەی بوو ...فرمێسک بەڕوومەتەکانی دەهاتەخوارەوە و داوای لێ دەکرد دبڕایەوە کە بگەڕێتەوە بۆلای بەلام بەریرە ڕازی نەبوو .... پێغەمبەری خودا بۆ ئەمە دلی ـرە بوو چوو بۆلای بەریرە و فەرمووی ئەگەر بگەڕایتایەتەوە بۆلای (مغیث) چونکە ئەو باوکی ـەکانتە ... بەریرە گوتی فەرمانم پێ دەکەیت؟ پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی " بەلکو من تکای بۆ ـەکەم " بەریرە گوتی من پێویستم بە (مغیث) نیە. دەبینی کچی خۆم چۆن پێغەمبەری خودا گرنگی بە خۆشەویستی پاك داوە سەردرای ئەو هەموو سەرقالی وخەمخۆریەی موسلمانان و ئومەتی ئیسلامی کە کەوتبووە سەرشانی ...

ـبینی کچی خۆم هەقی داوە بە دووکەس کە یەکیان خۆش دەوێت بۆیەك بن ، با باری ئابووری کوڕەکەش باش نەبێت . ئەبینی کچی خۆم چۆن هەقی داوە بە ژن کە ئەوەی دلی ئارەزوی ئەکات هەلی بژێرێ ... بینیت چۆن دلی نەرم بوو بۆ (مغیث) ، بەلام ژ نەکەی ناچار نەکرد کە هەر گەڕێتەوە .. هەروەها سەیری هاوەلان بکە ڕەزای خودایان لێ بێت چۆن شاردزای هەلوێستی پێغەمبەر (د.خ) بوون بۆ خۆشەویستی و هەولدان و بۆ بەیەك گەیشتنی دوو خۆشەویست ، ئەوانیش هەولی زیندووکردنەوەی سوننەتەکەیان دەدا و لەسەری دەڕۆیشتن .

دەگێرنەوە ئەبوبەکر لە شەواندا بەناو شاردا دەسوڕایەوە بۆ بەئاگابوون لە حالی موسلمانان ، گوێی لێ بوو کچێك گۆرانی بۆخۆشەویستی دەوت و دابڕانی خۆی دەلاوانەوە و باسی ئازاری دلی خۆی دەکرد . ئەبوبەکر لە دەرگای دا و داوای لێکرد پێی بلێ . ئەویش بۆی باس کرد بەلام کچەکە کۆیلە بوو . ئەبوبەکر ئازادی کردوو دای بەوکەسەی خۆشی دەویست و ئەویش کچەکەی خۆش دەویست !! ئەوە جێنشینی پێغەمبەرە (د.خ) کە نزیکبوونەوە لە خودای گەورە لەوەشدا دەبینێت کە دوو خۆشەویستی حەلال خواز بەیەك بگەیەنێ ، چونکە گرنگی دان بە ئومەت ئەوەیە دل و برینەکانیان چارەسەر بکات. وە لێوەی فێردەبین چۆن بەسۆزو زەردەخەنە بین و خۆشەویستی دەربڕین نەك لەناوی بەرین وە ئاگامان لە هەستە جوانەکان بێت نەك بیان خنکێنین ....

هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب کە بە توونەدی بەناوبانگە ئەو ووتەیەی لێبیستراوە کە دەیفەرموو " ئەگەر عوروە و عەفراو لەسەردەمی مندا بوونایە بەیەکیانم دەگەیاند " عوروە و عەفراو دوو خۆشەویستی یەکتربوون لەسەردەمی نەفامیدا و جیابوونەوە و بۆ یەك نەبوون ئەو عومەردی شەیتان نەیدەتوانی لەڕێیدا بوەستێ دلی نەرم دەبێت بۆ دوو خۆشەویست و چارەسەریان بۆ دادەنێت بە دەرمانی پێغەمبەری خودا (د.خ) ئەویش پێکهێنانی خێزانە .... هەتا

خێزانەکانی باسی دەکەن ئەڵێن کاتێك دەهاتە ژوورەوە دەبووە منداڵێکی بچوك ئەوەندە دڵ نەرم ونیان دەبوو هەڵس و کەوتی لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی دەکرد .

هەروەها ئیمامی عومەر شەوانە پاسەوانی شاری دەکرد . شەوێك گوێی لە ژنێك بوو لەکاتی پاسەوانیدا بەدەنگێکی غەمبار ئەمەی دەگووت :

تطاول هذا الليل وازور جانبه

وليس إلى جنبي خليل الاعبه

فوالله لولا الله لاشئ غيره

لزعزع من هذا السرير جوانبه

مخافة ربي والحياة يكفيني

وأكرم بعلي أن تنال مراكبه

ئیمامی عومەر بەپەلە پاسەوانی بەجێ هێشت و چوو پرسیای ئەو ژنەی کرد و ووتیان ئەوە ژنی فلان کەسەو پیاوەکەی لەرێی خوادا جیهاد دەکات . ئیمامی عومەر ژنێکی نارد لای بێت و ناردی بەدوای مێردەکەیدا و گەڕانیەوە بۆ ماڵەوە و دواتر چوو بۆلای حەفسەی کچی خۆی کە دایکی ئیمانداران بوو پێی فەرموو کچی خۆم: ژن چەند ئارام دەگرێت کە پیاوەکەی لێی دووربێت؟ حەفسەخان فەرمووی: پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە تۆ پۆسیار لەمن دەکەی لەو باردیەوە . ئەویش فەرمووی : ئەگەر بۆ کاروباری مسوڵمانان نەبوایە پرسیارم لێت نەدەکرد . لەوەلامدا فەرمووی چوار مانگ ، لە دوای ئەمەوە حەزرەتی عومەر چوار مانگی دیاری کرد بۆ موجاهیدەکان کە مانگێ بۆ رێگاو بان و سێ مانگیش بۆ مانەوە

لەوەش سەیرتر ئەبینین گەورە هاوەڵان چیرۆکی خۆشەویستی یان هەبووە ئەوەتا عەبدوڵای کوڕی عومەر ئەو پیاوە چاکە لەخواترسە کەنیزەکێکی خۆی خۆش دەویست ڕۆژێك کەنیزەکەکە بەرێدا دەڕۆیشت بەدەما کەوت عەبدوڵای کوڕی عومەر یەکسەر هەڵی سانەوە و تۆزی دەم و چاوی سڕی بە دەستی خۆی و فەرمووی ( گیان و دەروونم بەقوربانت بێت . دواتر لێی جیابۆوە و زۆر غەمبار بوو بۆی، هەر کاتێ بەیادی بهاتایەتەوە هۆنراوەی بۆی دەوت و خۆی بە کەمتەرخەم دەزانی لە ئاستی خۆشەویستەکەی و گوێی بەوەنەدەدا بە ئاشکرا ڕازی دڵەباوەڕدارەکەی خۆی باس بکات !

ـەد تێڕوانینـە جوانـە بـۆ خۆشەویستی وای لـە ( ئـەبوو سائیبی مـەخزوومی ) کردبـوو دەسـتی ـەگرتـە دیـواری کەعبـەوەو دەیفـەرموو خوایـە گیـان ڕەحـم بـە خۆشەویسـتان بکـەیت و دڵیـان ـڕێزیت و دڵی خۆشەویستەکانیان بۆ بە سۆز بکەیت .

ـێرکە ئەم زانا پایە بەرزە تا چ ڕادەیەك هەڵوێستی هەیـە بـۆ ئـەم جـۆرە کەسـانە و دەپارێتـەوە ـوێن و تانەوو تەشەریان لێ نادات و نەفرەتیان لێ ناکات ، بەڵکو بـەختیاری ڕاسـتەقینەیان لـەوەدا ـەبینێتەوە کە بۆ یەك بن ..

لێرەدا چەند پرسارێك دێتە مێشکداو ڕێم بدە وەڵامت بدەمەوە ئەی خوشکی خۆم

پ ئەی بۆچی خۆشەویستی بە شتێکی ناشرین ناودەبرێت ؟

و هەموو جۆرە خۆشەویستیەکان بە تاوان و ناشرین ناونابرێت ، بەڵکو بەس ئەوانە بە تاوان ناو ـەبرێن کە لە تاریکیدا دروست دەبن و لەوێ بەردەوام دەبـن و ئـەوەش بزانـە ئـەوەی لـە تـاریکیدا ـروست دەبێت لە تاریکیەکی توندتردا دەخنکێ !

پ / ئـەوە چ گرفتێکـە ؟ ئـەوە پەیوەندیـەکی تایبـەتی خۆمـە و مـافی خۆمـە پارێزگـاری لـە تایبەتیەکانی خۆم بکەم .

و / بـەڵێ ڕاسـتە ئـەوە کـاری تایبـەتی خۆتـە ، دەتوانـی پارێزگـاری لێ بکـەیت بەمـەرجێ سـنوری ڕێگەی پێدراوی شەرع نەبەزێنیت .

پ / سنوری شەرع چی یە ؟؟

و / بەبێ ئاگای دایك و باوك و کەس وکارت پەیوەندی و یەك بینین مەکە لە خۆشەویستیەکەتدا . ئەوە خیانەت و بێ فەرمانی دایك وباوکە و هەرگیز بەتەنها چاوت پێـی نەکەوێت چونکە پـەنا بەخوا شەیتان دەبیتەسێیەمتان

پ / باشە چی ڕوودەدات ئەگەر من ئەو سنورەم بەزاند ؟

و / زۆر شت ڕوودەدات، خوا بتپارێزێت، ئەو چیرۆکانەی کە ڕووداوی ڕاستەقینەن لە بەردەستت وەڵامێکی ڕوونن بۆت.

### گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن : -

١. ڕێزوحورمـەتت بۆخـۆت نـامێنێت و بەتێپـەڕبوونی کـات وای لێدێـت بـێز لـەخۆت دەکەیتەوە.

٢. ڕێزت لای هاوڕێ پیسەکەت بەتەواوی نامێنێت بەڵام بەئاشکرا پێت نالێت چونکە ئەیەوێت لێی دوورنەکەوێتەوە تاکوو بۆ ئارەزووبازی بەکارت بهێنێت .

٣. ڕێزی کەس وکاری کوڕەکەت لەدەست دەچێت ئەگەر لەداهاتوودا بۆ یەکیش ببن هەرچەندە بۆ یەک بوونیش زۆر دوورە .

٤. تووڕەیی خوای گەورە دروست دەبێت یان ئەوەتا ماوەیەك مۆڵەتت دەدات تاوەکوو بگەڕێیتەوە و تۆبە بکەیت یان ئەوەتا سزایەکی بەپەلەت بۆ دەنێرێت یان ئەوەتا لێت دەگەڕێ بۆخۆت لەگەڵ نەفس و شەیتاندا بیت پاشان لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات !!

٥. ژیانت شێوەی دڵەڕاوکێ و خەفەت و ترس و پەژارە دەگرێتەخۆی و دەترسی ئەم پەیوەندیە ئاشکرابێت یان خۆشەویستەکەت تێك بچێت لەگەڵتاو سەرئەنجامەکەی کارێکی زۆر ناخۆش دەبێت . بۆیە لەسەرئەنجامی ئەمەوە حەزت لە دووردەپەرێزی و دوور کەوتنەوەیە تەنانەت لە دایك و باوکت .

٦. وای لێدێت وەك یاری خلیسکێنەی منالآنت لێ دێت کە دەست پێکردنی ئاسانە بەلآم وەستاندنەوەی زۆر قورسە هەتا نەگاتە سەر ئەنجامە ناخۆشەکەی .

٧. ئابڕووت لە مەترسیدایە، لەژێر بەزەیی گورگێك کە بەزەیی بەهیچدا نایەتەوە . هەتا ئەگەر شووبکەیت بە کەسێکی تر ئەو ئەیەوێت ئارەزووبازیت لەگەڵ بکات ، چونکە گەنجان شانازی بەو کارەوە دەکەن لەناو یەکتردا کچان بۆخۆیان قۆرخ بکەن . ئایا کچێکی داوێن پاك و بەڕێزی وەکوو تۆ ڕازی دەبێت ئەو ناوبانگە خراپەی هەبێت ؟؟ .

٨. خۆشەویستیەکەت هەمووی مەترسیدارە چونکە مەبەستی درۆکردنە لەگەڵت، تەنها بۆ کات بەسەربردنەو ئارەزووی خۆی بەدەست بێنێت و کاتی خۆی بەسەربەرێت وەیان سزات بدات بەهۆی کەسێکی تر کەقۆڵی ئەوی بڕیوە ! ئەگەر ئەو ڕازی نابێت ئەمە لەگەڵ دایك و خوشکیدا بکرێت ئەی بۆچی خۆی ڕازی دەبێت ئەوە لەگەڵ تۆدا بکات ؟یان بۆچی تۆ ڕازی دەبیت بەوە؟!

٩. هەتا ئەگەر داوێن پیسیشی لەگەڵ نەکەی ئەگەری هێنانی تۆ زۆر لاوازە ، ئەزانی بۆ ؟؟ چونکە بیر لەوە دەکاتەوە چۆن تۆ خیانەتت لە دایك و باوکت کردووە وە متمانەی ئەوانت بەهەند وەرنەگرتووە و درۆت لەگەڵیان کردووە ، وە ئەوەشی لەبیر ناچێت چۆن تۆ بەنهێنی لەگەڵیدا ژووانت کردووە لەبەرئەوە متمانەی پێت نابێت وە هەرگیز باوەڕت پێناکات، هەتا ئەگەر بۆیەکیش بوون هەر مایەی متمانەی ئەونیت ... ئەوکاتە ژیانت

دەبێتە دۆزەخێك و ئەو ژینەی تۆ خەونت پێوە دەبینی پڕ دەبێت لە گومان و گرفت کە هەرگیز کۆتـایی نایـەت ... ئەگـەر سـەیری ڕێـژەی جیابوونـەوە بکـەین لـەنێوان ئەوانـەی دوای پەیوەندی نهێنی بـۆ یـەك دەبـن زۆر بـەرزە !! ئامارێك لـە زانکۆی قاهیرەدا کـراوە دەرکەوتووە ٨٨٪ ئەوانەی بەنهێنی پەیوەندیان هەبووە. دوای گواستنەوە جیابوونەتەوە !!
پ/ ئایـا ڕێگـای دەربـازبوون چـی یـە؟! ڕێگـای دەربـازبوون ئەوەیـە پـەیوەندیت لەگـەڵیدا بووەستێنیت و پشت بەخوا ببەستیت و داوای لێبکەیت یارمـەتیت بـدات و نـهێنیت بـۆ بپۆشێت ... زۆر ئاگاداربە ئەگـەر لەسـەرەتای ڕێگـای ئـەوا گـوێ لـەوەی شـەوقی بگـرە کـە دەڵێت : تەماشاکردن ... زەردەخەنە ... سڵاوکردن ... قسەکردن ... دانـانی کـات (موعـد) .. بەیەك گەیشتن.
کارەکە لەتەماشاکردنێکەوە دەست پێدەکات ... ئەگەر سەیری کەست نەکردوو و ئەوانەی سەیرت دەکەن و هەوڵی نزیك بوونەوە دەدەن فەرامۆشیان بکەیت و هیچ نرخێکیان بۆ دانەنێیت ئەوکاتە دەرباز دەبیـت ... ئەگـەر زانـی تـۆ لەسـەر هەڵوێستی خـۆت بـەردەوامی و ڕێگـای ڕاسـتت گرتـووە ئەوکاتە بەدوا یەکێکی تردا دەگەڕێت بۆ ئارەزووەکانی خۆی وە ئەگەر هـاتوو بەڕاسـتی تـۆی خـۆش دەوێت ئەوکاتە زیاتر ڕێزی بۆت دەبێت کە تۆ خـاوەن ئاکاری جوانـی ئـەوکات هـەڵتدەبژێرێت بـۆ ژنی خۆی و بوون بە خێزان و دایکی منداڵەکانی لە ئاییندەدا .
ئەگەر لەسەرەتای گەنجێتیدا بوون و کاتی هاوسەرگیریتان دوور بوو ئەکاتە باکەس وکار قسەی تێدابکەن و ڕێگای بۆ یەك بوون لە ئاییندەدا دیاری بکەن و ئەو ئامانجە پیرۆزە جێ بەجێ بکەن و خۆڕاگربن . ئەوکاتە لەیەکتری تێدەگەن لەڕێی خوشك ودایکەوە و دڵنیا دەبن لەیەکتری . ئـەوەش بزانە ئەگەر بەم ڕێگاڕاستەدا ڕۆیشتی ئەوە خوای گەورە لەگەڵتدا دەبێـت و بەردەکـەت بەردەکـەت دەخاتـە هەنگاوەکانتـەوە . هەرکەسێکیش خـودا لەگـەڵی بێـت کـەس نـاتوانێت تووشـی بکـات و هەرکەسێ خودا لەگەڵیدا نەبێت کێ یارمەتی دەدات ؟؟ ئەگەر هاتوو داوای هاتنە پێشەوەت لێکردو بەهانەی جۆراوجۆری هێنایەوە و درۆی لەگەڵتداکرد ئەوە بزانە شایەنی ڕێزی تۆ نییە و پێویست بەوە ناکات گرنگی پێ بدەیت و ڕێزی لێبگریت و هـەرگیز بەتـەمای ئـەوە مەبـە لـە ئـاییندەدا تـۆ بهێنیت . ئایا چۆن چاوەڕێن خوای گەورە یارمەتیتان بدات لەکاتێکدا ئێوە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەت ؟؟

خوشکی خۆم زۆر وریابە لەوەی پێت بڵێت من پێویستم بە تۆیە و بەبێ تۆ ناتوانم بژیم !! ئەم جۆرە قسانە کە گەنجان کچی داماوی پێ هەڵدەخەڵەتێنن ئەم قسانە هەمووی درۆیە. ئەمانبینیوە کەس بەبێ کەسێکی تر ژیـان لـە دەسـت بـدات هـەروەها هەریەکـەمان ڕۆژی دوایـی بـە تـەنهاین و

کەسیش تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت،ئایا رازیە لە ڕۆژی دوایدا هەندێ لە تاوان و گوناهەکانت هەلگری؟!

پ/ باشە ئەگەر هاتوو دایکم ڕێگەی پێنەدام لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکەم و ئامادە نەبوو لەم ڕووەوە قسەم لەگەڵ بکات؟

و / لەو کاتەدا ئەگەر زۆر هەوڵیدا پێی رابگەیەنە کە تۆ چاوەڕێی ئەوە دەکەیت کە بێتە داخوازیت و داوا لەکەس و کارت بکات و دڵنیا بێت لێ‌ت بەبێ ئەوەی خوای گەورە لە خۆتان بڕەنجێنن و هەردەم لە خوای گەورە بپاڕێردەوە کە کاری بۆ ئاسان بکات و بەیەکتان بگەیەنێت ، وە ئەو پەیمانەی خوای گەورەت لە بیرنەچێت کە دەفەرموێت " ومن يتق الله يجعل له مخرجا ويرزقه من حيث لايحتسب " " ومن أوفى بعهده من الله " ..... کچی ژیرو دانا باوەڕی بە خۆشەویستی نییە لە پێناو خۆشەویستی ، بەڵکو باوەڕی بە خۆشەویستی هەیە وەك پێشەکیەك بۆ شووکردن و هاوسەرگیرییەکی ئاسودەو بەختیار.

پ/ چۆن من ئارام بگرم لەم ماوەیەدا ؟

و/ (١) پەنابردن بۆلای خوای گەورەو داوای یارمەتی لێکردن و ئارامگرتن چونکە خوای گەورە چاکترین فریاد ڕەسە، وە داوای لێ بکە کە پاك بیت وەك (مریم) سەلامی خوای لەسەر بێت چونکە حەزرەتی (مریم) پاك بوو وە داوای لێ بکە خۆشەویستەکەت بپارێزێ وەك چۆن حەزرەتی یوسفی پاراست، وە خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

(٢) یادکردنەوەی ئەو هەڵوێستە مەزنەی حەزرەتی یوسف سەلامی خوای لێ بێت " قال رب السجن أحب إلي مما يدعونني إليه وإلا تصرف عني كيدهن أصب إليهن وأكن من الجاهلين " وە ئەنجامەکەی ئەوەبوو " فأستجاب لهُ ربهُ فصرف عنهُ كيدهن إنهُ هو السميع العليم " سورەتی یوسف (٣٢-٣٤) .

(٣) هاوڕێتی کردنی هاوەڵی دەم و داوێن پاك و خاوەن ڕەوشت و هاوکاری کردنی یەکتری لەسەر چاکەکردن .

(٤) دوورکەوتنەوە لە هاوڕێی خراپ چونکە هاوڕێتی کردنیان دەبێتە هۆی لەکەدار کردنی پلەوپایەی تۆ ئەوەش بزانە شەیتان دوو جۆرە ، شەیتانی جنۆکەکان وە شەیتانی ئادەمیزاد .

(٥) دوورکەوتنەوە بەپێی توانا لە گۆرانی. بەتایبەتی ئەوانەی باسی خۆشەویستی دەکەن چونکە ئامانجی ئەوانە تێکدانی بیروهۆشی تۆیە و ئەیەوێ ئارەزووەکانت بووروژێنی و بیخاتەگەڕ . دەتوانی

ـحـى ئەوانە گوێ لە سروودی ئایینی خۆش بگریت کە گیـانی ئیمانی لەدڵی موسڵماندا چالاك
ـئـێـت.

ـ) بروانـەکردن بـەو درۆوددلەسـانەی لـە فیلمـە کۆنـەکان بـڵاو ددکرێنـەوە چونکـە چـیرۆکی حۆشـەویستی تێدایە، هەرچەنـدە فیلمەکە کۆمیدی بێت یـان نیشتمانی وانیشـان ددەدات کە جیـهان ـتـنیـی بووە لە خۆشەویستی و بەس وە ئێمە تەنها بۆ ئەم جۆرە خۆشەویستیە دروستکراوین.
ـوتی بزانین لەو فیلمە کۆنانەدا ئەوانە دوای کۆمەڵێ پەیوەندی نادروست بۆ یەك ددبن بەڵام لە ـیمە تازەکانـدا پەرەددسێنێت بۆ داوێن پیسی و مەی خواردنەوە و سەماکردن بە ڕووتی ...ئایا تـا ـسـتا فیلمێکت بینیوە باسی پاکو بێگەردی کچ و ئابڕووی بکات یان باسی بێگەردی بکات ؟؟؟ .
(٧) خوونەگرتن بەو چیرۆکانەی کە کچان فریو ددەدەن و چیرۆکەکانیان لـە نێـوان خۆشەویستی ـڕۆمانسی و داوێن پیسیدایە وە پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێت و بڵاوی دەکەنـەوە،هـاو وێنـەی زنجیرەی ـعبیر)و(زهور).
(٨) بڕوا بەو چیرۆکانە مەکە کە باسی خۆشەویسـتی هونەرمـەندە بەناوبانـگەکان ددکـەن وە لـە گۆڤارە بێ نرخەکاندا بڵاویددکەنەوە .... ددتوانی لە بری ئەوانە سـود لـەکتێبی چیرۆکی ئافرەتـە جێکەخوازەکان وەربگرە لەوانە دایکانی ئیمـانداران و ئافرەتـانی هـاوەڵی دکتـۆرە (بنـت الشـاطئ) و ـەوانی تـر ... یـان گـوێ بگریـت لـە کاسـێتی (نسـاء خـالدات) ی دکتـۆر (طـارق السـويدان) یـان ـزنجیرەکانی " نلقى ألاحبة " کەباسی دایکی ئیمانداران ددکات کە ووتاری بەڕێز (عمرو خالد)ە ، با ـمونەی تۆ فاتیمەی کچی پێغەمبەر بێت (د.خ) وە عائیشەی و مەریەمی داوێن پاك بێت و نمونەی ـەوانەی وەك ئەوان بوون .
(٩) هـەوڵبـدە خـۆت سـەرقاڵ بکـە بەشـتی بەسـوودەوە ، وەك وەرزش یـان ڕۆشـنبیری یـان کـاری ـدەستکرد یان هەر شتێکی تر کە بەسوود بێت لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵبدە لە خوێندن سەرکەوتوبیت ـەو نیازەی کچێکی موسڵمانی زیرەك و بەئاگاو بەهێزبیت وە چاکەکاربیت لەگەڵە دایك و باوکتدا، ـێردوە بەهۆی ئەوهەموو کارو تێکۆشانەی ئەنجامی ددەدەی پلەو پاداشتی باشت بۆ بەدی دێت .
(١٠) وەك گوڵ مەبە نرخی هەرزان بێت و بەئاسانی دەست بیگاتێ و هەرکەسێ بیەوێ بیکاتەوە ـو کات بەسەریدا بڕوات سیس بێت بەڵکو وەك دوڕ وابە نرخی گرانـەو بەئاسـانی دەسـت ناکـەوێت هەر کەسێ شایانی نەبێت نایگاتێ و بە تێپەڕبوونی کات نرخەکەی زیاد ددکات .
(١١) پەیوەندی بکە بەوانەی قورئان دەخوێنن تاوەکو تەجوید فێربیت و

بەشداری ووتارو وانەی ئایینی بکە، لەو شوێنانە هاوڕێ و کەسانی چاك دەدۆزیتەوە و هاوکارت دەبن بۆ پەرستنی خوای گەورەو دۆزینەوەی ڕێگای ئاسودەیی بۆ دونیا و قیامەت .

(١٢) دەتوانی سوود لە ئەنتەرنێت وەربگریت بە تایبەت ئەوانەی تایبەتن بە ئافرەت لەو پێگەبەسودانە بۆ نموونە :

- http:/www.waha web.com
- http:\www.lahaonline.com
- http:/www.laki.com
- http:/www.my-vose.net
- http:/www.hawa aworld.net
- htt:/www.Uaete er.com
- http:/vb.alwrood.com
- http:/fornm.fwaed.net
- http:/www.muslm.org

(١٣) بەپێی توانای خۆت یارمەتی خەڵکی بدە، نەزان فێرکە یارمەتی لاوازبدە دەست بهێنەسەر بێ باوکدا . سەردانی نەخۆش بکە ، ئەوکاتە هەست بە خۆشی و ڕەزامەندی دەکەیت لە ناخەوە و هەست دەکەیت نرخی ڕاستەقینەت هەیە سەرەڕای ئەوەی کە چەند چاکەو پاداشتت بۆ دەنوسرێ ئەگەر مەبەستت بۆ خوای گەورە بێت

پ / ئەی دەروون فەرمان بەخراپە ئەکات؟!

و / بەڵێ وەك خوای گەورە لەسەر زمانی خێزانی عەزیز دەفەرموێت " وما أبرئ نفسي إن النفس لأمارة بالسوا " بەڵام ئەوەی لێ دەردەهێنێ " إلا من رحم ربي " سورەتی یوسف ئایەتی (٥٣) ..... واتە دەرونم بێ تاوان ناکەم چونکە فەرمانم پێ دەکات بە خراپە. تەنها ئەوە نەبێ کە خوای گەورە ڕەحمی پێ دەکات . جا لەبەر ئەوە پێویستە بەردەوام هەوڵ بدەیت لەگەڵ ناخی خۆتدا وە لە خوا بپاڕێیتەوە کە ڕەحمت پێ بکات وە مل کەچی فەرمانەکانی بیت، خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکە داوای لێ بکەو بڵێ " أللهم آت نفسي تقواها وزكها أنت خير من زكاها أنت وليها و مولاها أللهم يا مالك الملك ملكني نفسي ولا تسلطها علي بذنوبي " واتە: خوایە گیان تەقوا ببەخشە بەدەرونم. پاکو پکژی بکە. چونکە

ـەوە هەر لەدەست تۆدێت، خوایە ئەی خاوەنی موڵکەکان دەرونم خۆڕاگرکەو بەهۆی ئ ـەکانمەوە زاڵی مەکە بەسەرمدا .

ب ـ ئەی ئەگەر سەفەری دووری کردو هەواڵیم نەزانی ؟؟؟

ۆ تەنها وەلاٚمم ئەوەیە کە( خوای گەورە کۆمان بکاتەوە و گەڕانەوەش هەر بۆلای ئەوە) ... ـەوەت لە بیرنەچێت کە باوکە ئادەم و دایکە حەوا کە دابەزینە سەر زەوی لەیەك بڕ بوون دواتر خوای گەورە لە عەرەفە بەیەکتری شادکردنەوە .... هەروەها حەزرەتی (یوسف) ـەلامی خوای لێ بێت کاتێك لە باوکی بڕ بوو منالٚ بوو هەتا نەیدەزانی شێوەی تەواوی ـوکی چۆنە و شوێنی نەدەزانی بەلاٚم دڵنیایی حەزرەتی یعقوب سەلامی خوای لێ بێت وای کرد کە بڵێت " هل آمنك عيله إلا كما أمنتكم على أخيه من قبلُ فالله خيرٌ حافظا وهو أرحم الراحمين " سوردتی (٦٤) .... واتە خوای گەورە چاکترین پارێزەرە کوڕەکەم (یوسف) دەپارێزێ و ڕەحم بە لاوازی و پیریم دەکات ۆ دەزانێ چەند سۆزم هەیە بۆ کوڕەکەم داوام لە خوای گەورە ئەوەیە بیگێڕێتەوە بۆم و کۆمان بکاتەوە، وە خوای گەورە بەسۆزومیهرەبانە .

ب / ئەی دوای ئەوە ؟؟

کاتێك ئەوکاتە دێت کە خوای گەورە دیاریکردووە، شوو دەکەیت بەو کەسەی خۆشت ویستووە و ڕێزی لێ گرتوی وە ڕێزت لێی گرتووی ومتمانەتان بەیەك بووە و مەبەستان ڕەزامەندی خوای گەورە بووە وە بەشەرم و داوێن پاك و بێگەرد بوون، ئەوکاتە بیربکەرەوە کە کاتێك بۆ یەك دەبوون دەبێ ژیانتان چۆن بێت؟! .... بڕوابکە تام و چێژی ئەو بەرهەمەی کە چاندت و هەوڵتدا لەپێناوی و گرنگیت پێدا و ئارامت گرت لەسەری بۆ ئەوەی گەشە بکات و دواتر دڵ خۆش بوویت بە دروێنەی بەرهەمەکەی زۆر لەوە شیرین وچاکترە لەوەی کە دەیچێنیەوە. یان دەچیتە ماڵ و حاڵت .... ئەگەر خوانەخواستە بۆ یەك نەبوون بە هەر هۆکارێك بوو ئەوە بزانە خوای گەورە توشی خێرت دەکات، ئەو دەزانێ چی چاکە بۆت و خۆشی دەوێ و پارێزگاریت دەکات زۆر لەوەی کە خۆت هەوڵی بۆ دەدەی .... چونکە بەدەستی خۆی دروستی کردووی تۆش دروستکراوی ئەوی لە چاکە زیاتر هیچی تری بۆت ناوێت ... خوای گەورە بەسۆزو میهرەبانە..بەخشندەیە..لێبووردەیە..دادپەروەرە..بەبەزەییە..داناوزانایە و چاکەکارە. لێی بپاڕێرەوە و بڵێ "اللهم خير لي وأختر لي ، فإنك لاتختار إلا الخير" واتە: خوایە گیان خۆت بۆم هەڵبژێرە. چونکە باش نەبێ بۆم هەڵنابژێری .

ئەوەت لە بیر نەچێت کە (أم سلمە) چیکرد تۆش وابکەیت (ام سلمە) کاتێك مێردەکەی مرد زۆر غەمبارو دڵ تەنگ بوو بە مردنی پێیان ووت ووت بڵێ "انا لله وانا الیە راجعون أللهم أجرني في مصيبتي وأخلف لي خيرا منها" ... کاتێك ئەوەی فەرموو نەی دەزانی کە چاکتر لە ئەبو سەلەمە هەیە کە شووی پێ بکات، کەچی دوای ئەوە شووی کرد بە پێشەوای مرۆڤایەتی موحەمەد (د.خ) ...

دوای ئەوەی شووت کرد شووبکە بەو کەسەی کە لە دین و ڕەوشتی ڕازیت چونکە ئەگەر خۆشتی بوویت چاك دەبێت لەگەڵتدا، ئەگەر خۆشی نەوێیت ستەمت لێ ناکات. و ئەوەش بزانە دونیا شوێنی تاقیکردنەوەو کارکردنە نەوەك شوێنی مانەوەو نەمری ... خوای گەورە لە دواڕۆژدا بە چاکترین شێوە شوێنت بۆیڕ دەکاتەوە کاتێك لە (حۆریەکانی) بەهەشت جوانتر دەبیت بە پەرستش و ترسانت لە خوای گەورە و هەوڵدانت و بەردنگار بوونەوەت لەگەڵ دەرونی خراپ و شەیتان ... ئەوەش بەدوور مەزانە لە بەهەشت بەیەك بگەن لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا کاتێك لەوێ کەش لەباردەبێت بۆ هاوسەرگیریەکی بەختیار .... ئێستاش بە خوای گەورەت دەسپێرم، کە سپێردراوەکانی وون ناکات بە ئومێدی بەیەك گەیشتن لە بەهەشتدا "إن شاء الله تعالى" .

## ستار ئەكادیمی

ــز ــابرووبەرە ڕەوشتیەی نەتەوەکەمان تێیدا دەژی لە ڕووی گیانی وسەربازیەوە.

### پێناسەی ئەم بەرنامەیە.

ــەیەك پێش نێستا بەرنامەیەك دەرکەوت کەناو دەبرا بە تەلەفزیۆنی واقــع ئەمــەش دەقاودەق ــۆپی کراوی بەرنامەیەکی فەرەنسی بێ ئابڕوودو ناوی نراوە (ستار ئەکادیمی)و کەناڵی بەردلایی و ــی ڕەوشتی بلاوی دەکاتەوە و "وکۆمەڵێك کوڕوکچی بێ ڕەوشت تێکەڵ بەیەکتر دەبن و بەدرۆ ــێن لێناوە"ئەکادیمی" LBC کەبریتیە لە " "ئەکادیمی "

ــەم بەرنامەیە پێشتر ئامـادە نـاکرێت. بـەڵکو ڕاسـتەوخۆ پێشکەش دەکرێ و ڕوداوەکـان بـەدوای ــکدادێنێت بەپەخشی ڕاستەوخۆوە. بەتــەواوی پشـت دەبەستێت بـە وورو‌ژاندنـی ئارەزووبـازی و ــۆرە جولاندنی بینەر. ئەمەش بەوەی پەخشەکە ئەوانە نیشان دەدات کەچۆن تێکەڵی یەکتر دەبن ــ کوڕوکچ بەشێوەیەکی ناشەرعی. هیچ پاکیەکیان تێدا نیە وە کۆبونەوەکەیان لە یەکەمەوە تـاکو کۆتـایی تەنــها بــەردلایی و بـــێ ڕەوشـــتیە و پچڕانـدنـــی داب و نەریتــە جوانــەکان و ڕەوشـــتە ــیسلامیەکانە ، دواتـر ژمـارەی تەلـەفۆنیان دانــاوە تاخــەڵکی پــەیوەندیان پێوەبکـات و چاکـترین ــەستێرەی جیهانی بێ ئابڕوویی و بێ ڕەوشتی دەست نیشان بکـات و دەنگی بداتـێ ... لـە کـاتێکدا ــیسلام و موسڵمانان لە هەموو شـوێنەکانی سـەر زەوی پارچە پارچە دەکرێـن و مـاڵ و سـامانیان ــەهــەدەر دەبرێــت و خوێــنی موســڵمانان بـــەبێ هیـــچ نرخێـــك دەرێژرێـــت و موســـڵمانان ــدەچەوسێنرینەوە و لاواز دەکرێن و سووکایەتیان پێدەکرێت.... تا لەم کاتەدا ڕوبــەڕوی شکستێکی ــر دەبنەوە کەفەرەنسیەکان دایانهێناوەو ئەمانیش ئـەم شکست و ڕەوشت نزمیـە کۆپـی دەکـەن و خوای گەورە دەکەن لە تاواندا و بەشێوەی ڕاســتەوخۆ پەخشـی دەکـرێو کۆمـەڵێ کوڕوکچـی گـەنج دەبنە قوربانی کە پێشبڕکێیانە لەسەر خراپە کاری تاوەکو بزانن کامیان باشتر خـوای گـەورە تـوڕە دەکەن .

هەر کام لەوانە چاك سەما بکات ئەوە نمرەی بەرز بەدەست دەهێنێت و هەرکامیان چاکتر تێکەڵی کچەکانی هاوڕێی بێت ئەوە لەلایان براوەی یەکەمــە. وە هـەرکامیان بزانـێ گۆرانـی بڵـێ و مۆسـیقا بژەنێ و هەموو ئەو شتەبێ کەڵکانە بزانێ ئەوە یەکەمی سەر هەموویانە .

## (ئامانجەکانی پشت ئەم بەرنامەیە )

یەکەم شت کە پێویستە بیزانین بریتیە لەوەی ئەم بەرنامانە هیچ پەیوەندیەکی بەوەوە نیە کە ئەستێرەی بەناوبانگ دروست بکات یاخود بەهرەکان بدۆزێتەوە ... نەخێر بەڵکو دوو ئامانجی سەرەکی هەیە لەلای ئەوانەی کە هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی و بازاڕ گەرمکردنی ...

**ئامانجی یەکەم :** - بۆ ئامانجی یەکەم هیچ دەربڕینێك وەك قورئان ڕوونی ناکاتەوە. لەکورت و پوختترین دەربڕیندا، ئامانجی یەکەم بلاوکردنەوەی داوێن پیسیە لەناو ئیمانداران .. وەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێت " إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين امنوا لهم عذاب أليم في الدنيا و الأخرة والله يعلم وأنتم لاتعلمون " سورەتی (نور) ئایەتی (١٩) .

ئەگەر مرۆڤ تەنها یەك گەردیلە لە مێشکی خوی بخاتەکار دەزانیٚ کە ئەمانە ئامانجی سەرەکییان لەم بەرنامەیە بلاوکردنەوەی بەرەڵاییە لەناو ئیمانداراندا و تێکدانی ئەو ئومەتەیە کە لەسەر بەرنامەو ڕێگای ڕاست ڕۆیشتووە ، ئەوە ڕوونترین بەڵگەیە کە کەش و هەوایەکی تێکەڵیان بۆ دروستکراوە و زۆر جەختی لەسەر دەکەنەوە و هانیان دەدەن و شەرم و دیواری نێوان کچ و کوڕ دەشکێنن و دواتر جلی سەیرو سەمەرە لەبەر کچان دەکەن و چاوپۆشی لەوە دەکەن کە لەشیان بەریەك بکەوێت وە باوەش بەیەکتریدا و ماچی یەکتری بکەن و سەیرکردن و پێکەنین و شتی لەو جۆرە . وە کەناڵەکەش بەدرێژایی کات پەخشی دەکات ئەمەش هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە مەبەستیان بلاوکردنەوەی بەرەڵاییە لەناو ئیمانداراندا، وە لێرەدا ئامانجی ئەم پرۆژەیە پوکانەوەی دەستکەوتە بەهاییەکانی خەڵکە. کە گەنجە بەشداربووەکان چێژ وەردەگرن و خۆیان لەدەست دەدەن و بینەرانیش ئامانجی سەرەکین.

**ئامانجی دووەم :** دەستکەوتی ماددی زۆر و خێرا بەکارێکی بێ ئەرك و ماندووبوون. هەرچەندە لای خوای گەورە زۆر لەسەریان دەکەوێت. بەتایبەت کاتێ لە پایەگایدا دەوەستن. ئەو خوایەی نەهی کردووە لەوەی لەسەر زەوییدا خراپە بلاو بکرێتەوە. دوای ئەوەی چاکسازی تێدا کراوە و سزای ئەوانەی زۆر سەخت کردووە کە بانگەشەی گومڕایی دەکەن ... دەربارەی ئەوەی چۆن دەستەکەوتیان دەست دەکەوێت؟ ئەویش لەڕێی کردنەوەی هێڵی تەلەفۆن لە هەر وولاتێکدا و دواتر داهاتی قسەکردنەکان دابەش دەکەن لەنێوان کەناڵەکەو کۆمپانیای پەیوەندیەکان ... ئا بەم شێوەیە خاوەنی ئەم کەناڵانە ڕێگای هونەری دەدۆزنەوە بۆ پاککردنەوەو خاڵی کردنی گیرفانی جەماوەر ... ئەوانەی پەیوەندی دەکەن زۆر گێل و نەفامن پارەی خۆیان بە فیڕۆ دەدەن بۆ

حرمەتی ئەو جۆرە کەناڵانە . ئەمەش ڕاستی ئەودمان بۆ دەردەخات کە ئەم کەناڵانە لایەنگری بۆ حزبێن پەیدادەکەن ئەودیە لە هەموو وڵاتاندا بۆ سەرخستنی بێ ئاگاو گێلەکان و بەدەستهێنانی زۆرترین ژمارە لە پەیوەندیکرن کەسێکیان ڕاسپاردووە بۆهاندان بۆئەوەی بەهەموویانەوە دەنگێکی زۆری لێبکەن. ژمارەی پەیوەندی کردن لەیەك بەرنامەدا کە ئەویش بەرنامەی (ستار ئەکادیمی)ە بەم شێوەیەی لای خوارەوەبوو :

- سعودیە : (١١,٣٠٠,٠٠٠) یازدە ملیۆن و سێ سەد هەزار پەیوەندی .
- میسر : (٢٣,٧٥,٠٠٠) بیست و سێ ملیۆن و حەفتاو پێنج هەزار پەیوەندی .
- لوبنان : (١٨,٥٣٦,٠٠٠) هەژدە ملیۆن و پێنج سەد وسی وشەش هەزار پەیوەندی .
- کویت : (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار پەیوەندی .
- ئیمارات : (١,٢٢١,٠٠٠) یەك ملیۆن و دووسەد و بیست و یەك هەزار پەیوەندی .
- یەمەن : (٧,٠٠٠) حەوت هەزار پەیوەندی .
- سوریا : (١٦,٩٣٣,٠٠٠) شازدە ملیۆن و نۆسەدو سی وسێ هەزار پەیوندی .
- ئوردن : (٨,٧٨,٠٠٠) هەشت ملیۆن و حەفتاو هەشت هەزار پەیوەندی .

ئەگەر ژمارەی پەیوەندیەکان کۆبکەینەوە سەرجەمی دەکاتە زیاتر لە (٧٠,٠٠٠,٠٠٠) حەفتا ملیۆن پەیوەندی کەچی ژمارەی پەیوەندیەکان لە وولاتانی عەرەب بۆ ناڕەزایی دژی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش سەبارەت بە جەنگ دژی ئەفغانستانی موسڵمان لەو کاتەدا گەیشتە تەنها سێ ملیۆن پەیوەندی . بەمەش دەردەکەوێت زیاتر لە (٧٠,٠٠٠,٠٠) حەفتا ملیۆن دەنگ بۆ بەرنامەی ستار ئەکادیمی دراوە لەناو موسڵمانان بۆ هاندان و هەڵبژاردنی ئەو گەنجە بێ ئابڕو و کچە دۆڕاوانە و داوای سەرکەوتنیان بۆ دەکەن کەچی سێ ملیۆن پەیوەندی هەبووە داوای ئەویان کردووە کە خوێنی موسڵمانان لە ئەفغانستان نەڕێژرێت .

## مەترسیەکانی ئەم جۆرە بەرنامانە

**یەکەم :** ئەم کەناڵە ئاسمانیانە ماڵەکانیان داگیرکردووە و ئەم جۆرە بەرنامانە لە هەردوو ڕەگەز بینەریان بۆ پەیدابووە ... پێویستە لێی ئاگاداربین چونکە بووەتە قسەو باسی زۆرێك لە کوڕوکچە گەنجەکان .

**دووەم :** ئەم بەرنامانە کاری نەهێشتنی ڕەوشت و ئاکارە جوانەکانە لە ناخی کوڕوکچدا و چەمکە ڕاستیەکان دەڕوخێنێ و پەردەوشەرمی نێوان ژن وپیاو ناهێڵێت و پەیامێکی ئامانجداری لە پشتەوەیە کە ئامانجی پەردپێدانی تێکەڵ کردنی هەردوو ڕەگەزە .... دەیەوێت ئەوە دروست بکات

که پەیوەندی هەردوو ڕەگەز شتێکی ئاسایيە و مەسەلەی دوور لەیەکتری گرتن و هەستیار وەرگرتنی ئەو کارە شتێکە هیچ ڕاست نییە . بۆیە ئەوەندە گەنجان ڕادەهێنن لەسەر ئەم مەسەلەیە و ئەوانیش تەماشای دەکەن تاکو دەبێتە شتێکی ئاسایی لەلایان. دواتر کەمەکەمە بینەر فێری بینینی شتی حەرام دەبێت بەم شێوەیە سات بەسات ئالودەی ئەم کارە دەبن و تاوەکوو ئەم ڕێگاپڕوپوچە وایان لێ دەکات لەناخی خۆیاندا بڵێن : ئەوەتا ئەوانە بە بەرچاوی هەموو خەڵکیەوە ماچی یەکتری دەکەن و سەمادەکەن و باوەش بەیەکتریدا دەکەن و بەیەکەوە دەبن و خەڵکی گوێیان لێ دەگرن و دەیان بینن و ڕاستەخۆ لە کەناڵەکە بڵاوەدەکرێنەوە لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی دەنگیان پێ دەدەن وە هاندەریانن .... باشە بۆ ئێمە بۆخۆمان ئەمە بە نهێنی ئەنجام نەدەین و ژیانی ڕۆمانسی بۆخۆمان دروست نەکەین ؟

بەم شێوەیە هەوڵ دەدەن گەنجان لەڕێ دەرکەن و بێ ئابڕوویان بکەن و کچانیش فێری بەردڵایی و بێ ڕەوشتی دەبن بەشێوەی ڕاستەوخۆ لە کەناڵەکانیانەوە ...بەم شێوەیە داب و نەریتی کۆمەڵگا سەردەبڕن و ڕەوشت و ئاکاری دەبێتە کۆمەڵێ هێمای بەتاڵ و لەناوی دەبەن ...باوکان هەر لەسەرەتای تەمەنی منداڵەکانیانەوە ئەوەیان فێری کچان کردووە کە نابێت پیاو سەیری ئافرەت بکات چونکە حەرامەو نابێت پێکەوەبن ... کەچی کچی داماو لێشاوی ئەو بەردڵاییە دەبینێت دەبێت بڵێت چی؟

**سێیەم** :- ئەم بەرنامەیە کاری ئەوەیە تواناکان لە ناوبەرێت و ئەو ووزانە سڕبکات کە بەباوەڕەوە دەتوانن کاری زۆر بکەن ... وەکاردەکات بۆ ونکردنی ئەو عەقڵانەی کە ئەگەر خرێنە گەڕو هیدایەت بدرێن زۆر سودی گەورە دەگەیەننە کۆمەڵگا ...چی ئەوەیەك لە ئاییندەدا پێ دەگات ئەگەر پەروەردە بکرێن لەسەر شەوە سووردکان و ڕابهێنرێن لەسەر پێشبڕکێی بێ مانا و ئەستێرەی ڕووت و قوتی ؟!

چۆن داوا لەم نەوەیە دەکرێت کە (ئەقصا) ڕزگار بکەن، بەڵکو ئەم کەناڵانە گەنجان وا پەروەردە دەکەن کە ببنە دەرچە بۆ تێپەڕبوونی دوژمن و ببنە کەرەستەی خزمەتکردنیان و ڕایان دەهێنن حەزبەوە بکەن یەکێك ڕەشمەیان بکات، نەخاوەن مەسەلە بن و نەداوای ماف بکەن و نەشەرەفی خۆیان دەپارێزن ... لەسەر ئەم بەرنامانە نەوەی وا پەروەردە دەبێت کە کلیلی دوا قەڵای ئیسلام دەسپێرێتە دوژمن وە پێشوازی لێدەکات و دەیهێنێتە ناو ووڵات و ماڵ و منداڵ و شەرەفی خۆی. وەك چۆن ئەوانی تر لە پێش ئەمان ئەنجامیان دا. ئایا ئەوەیەك دەتوانێ بەرگری بکات لە کەکاری

ـبـ بریتی بێت لەخۆقۆز کردن و هاودڵێتی بێبڕوایان و هەمێشە ئالودەی شامپۆو خۆ چەورکردن ـنـحەیی بێت. ئەگەر تەنها ئەمە خولیایان بێت چییان لێچاودڕێ دەکرێت !؟

**چوارەم :** ئەم بەرنامانە دەیانەوێت ئەونەستێرانەی کە خۆیان دروستی دەکەن ببن بە پێشەنگ ـۆ گەنجان و کاریگەریان لەسەر دروست بکەن و شتە بەرزو بالاکان لای گەنجان تێك بـدەن .. ـەـەمەش ڕوودەدات. بمانەوێ و نەمانـەوێ. ئەگـەر ئـەوان سـەیری ئـەم کەنالانـە بکـەن کـە ـتەوخۆ تێکەڵی ژن و پیاو بڵاودەکەنـەوە بـە دەنـگ وڕەنگـەوە .هەموو ڕەفتـارە ناشـرینەکانیان ـحتی دەکەن. چ خـواردن و خـەوتنیان هـەتا چوونـە سـەرئاویان وەك ئـەوەی لـەناو بـانکێکی ـرکەزیدا بن ژووردکان هەموو وێنەدەگیرێن و هەڵس و کەوتیان نیشان دەدرێت. ئەگەر مـرۆڤ ـیری بکات دەبینێت چەند گرنگیان پێ دەدرێت وا دەزانیت لە ئەستێرەیەکی تردوە دابەزیون و ـرد ئەمان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بۆیە ئاوا گرنگیان پێ دەدرێت و زۆر پێیان سەرسام دەبن ـ ـەم شێوەیە بەردلایی لە کۆمەڵگادا بڵاودەکەنەوە .

ـەرودها لە شریتی ژێر شاشەکەدا کـە وەك هـەواڵ دەڕوات نامـەی دڵداری و قسـەی بـێ شـەرمانە ـڵاودەکەنەوە کە هیچی لەوە کەمتر نییە کە لەسەر شاشـەکە بـلاو دەکرێتـەوە ... ئایا ئەگـەر ئـەم ـرنامەیە کە پەشخ دەکریت بۆ دروستکردنی ئەستێرەی بەناوبانگە. ئەوە هەقی خۆمانە پرسـیار ـکەین ئایا ئەوبە ئەستێرە بوونەی دروستی دەکـەن چین؟؟ وە پسپۆڕییان لـە چیـدا هەیـە؟؟ ئایا ـۆلاتیان ڕزگارکردووە؟ یاخود بەرنامەیەکیان داهێناوە سوودی بۆ ژیانی خەڵکی هەبێت ؟؟ یـاخود ـدرمانێکیـان دۆزیودتـەوە بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی ئـایدز یـان شـەکرە ...؟؟ یـان ئـەوان زانـای گەردوونناسی و زەوی ناسـین ؟؟ یـان شـارەزان لـە بـواری زانست و بانگەوازدا ؟؟ ئـەی چی؟ ئـەم ـەستێردیی بوونەی کە ئەو خراپەکارانە بازاڕیان بۆ گەرم دەکەن پسپۆڕی چی بوارێکن ؟؟ ئایا ڕدوایە ئەستێرەی بەناوبانگ لای موسڵمان بریتی بێت لە مرۆڤی پڕوپوچ و بێ شەرم ؟؟ ئایا ئێمە ـێویستیمان بەم جۆرە ئەستێرانە هەیە تاوەکوو زیادی بکەین ؟؟؟ .

**پێنجەم : –** هەندێ دەزگا لە وولاتانی عەرەبی هاوکاری ئەم جۆرە بەرنامانە دەکەن بۆ سەرقاڵ کردنـی گەلـەکانیان بـۆ ئـەوەی کێشـەی ڕاسـتەقینەی خۆیـان لـە بیربچێتـەوە ... دەبینیـت گـەل و ـدزگاکان هەوڵ و کات و پاردوپولی خۆیان بەفیڕۆدەدەن بۆ سەرخستنی هەرزەکارە کوڕ و کچەکان ـە بواری سەما و گۆرانیدا بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ڕۆڵەکەیان قاردمان و جوامێری بواردکەیەتی وە ـدگاتـە کۆتـایی پێشبڕکێکە ... هـەتا وای لێـهاتووە کـاتێك گـەنجی وولاتێـك نزیکـی سـەرکەوتن دەبێتەوە ئاهەنگی بـۆ دەگێڕن وەك ئـەوەی خۆیـان ئامـادە بکـەن بـۆ نـاردنی مـانگی دەستکرد بـۆ

بۆشایی ئاسمان یان وەك ئەوە پێشەوایەکی خواپەرست یان سەرکردەیەکی مەزنیان پێشکەش بەم ئومەتە کردبێت .
هەرزەکارە کوڕوکچەکان سەمادەکەن و گۆرانی دەڵێن لەولاشەوە هەواڵی داگیرکاری و شەهیدکردنی موسڵمانان بڵاودەکرێتەوە کاتێك یەکێك لەوانە لە پێشبڕکێکە دەرناچێت بۆی دەگرین وەك ئەوەی شاری بەغداد داگیرکرابێت !! .

## ئیسرائیل و ئابڕوو چونی " ستار ئەکادیمی و سوپەر ستار "

لەپەرەسەندنێکی ناموٚدا وەزارەتی ڕۆشنبیری جولەکە لە ئیسرائیل وەسفی بەرنامەی " سوپەرستارعەرەب" ی کرد کە کۆمپانیایەکی ئەمریکی سەرپەرشتی دەکات و گومانی ئەوەی لێدەکرێت کە "یەهو. مەسیحی " بێت وە یارمەتی دەدات و لەسەر زمانی وەزیری جولەکە " جەلعاد شالوم " ئەوە بڵاوکراوەتەوە کە ووتویەتی ئەم بەرنامەیە زۆر چاکە. وەهانمان ئەدات بۆ ئەوەی بتوانین لەگەڵ عەرەبدا بژین !! .

هەروەها ڕۆژنامەکانی جولەکە لە کۆتایی مانگی ئابی ڕابردوو پڕوپاگەندەیەکی باشیان بۆ "سوپەرستار" کرد .... ئەم بەرنامەیە چەند مانگ بەردەوام بوو لە چەندین وولاتی عەرەبی. زیاتر لە پێنج ملیۆن کەس لە وولاتانی عەرەبی بەشداریان تیاداکرد بۆ هەڵبژاردنی باشترین گۆرانی بێژ لە کوڕوکچ کە توانای سەماکردنیشی هەبێت. کەچی لاپەڕە زانستیەکانی ئەو ڕۆژنامانە باسی تەکنەلۆژیای زایۆنی چۆنێتی فرۆشتنی دەکەن بە عەرەب. وە لەولاشەوە پەرەسەندنی بەرنامەی ئەتۆمی زایۆنی کەس باسی ناکات و کەچی هەوڵەکانی کۆریای باکوروئێران بۆ بەدەست هێنانی ووزەی ئەتۆمی بۆتە قسەوباسی ڕۆژانەیان! .

وەزیری جولەکە "جەلعاد شالوم" هەروەك ڕۆژنامەی (هئارتس) لە ٢٠٠٣/٨/٢١ لەسەر زمانی بڵاوی کردۆتەوە ، زۆر وەسفی ئەو بەرنامەیە دەکات و هەندێ لە گەنجە بێناگا عەرەبەکانی فەلەستینی ساڵانی (١٩٤٨-١٩٦٧) بەشداریان تێداکرد... وەزیری جولەکە بەرنامەکەی بەجۆرێکی باش دانا بۆ نزیك بوونەوەی عەرەب و جولەکە !! واتە : وا پێویستە کە گەنجی موسڵمان سەرقاڵ بکرێت بەسەما و گۆرانیەوە و پێشبڕکێی تێدا ئەنجام بدرێت ... هەروەها ڕاوێژکاری سەرۆك وەزیری جولەکە (شارۆن) کەناوی "دوری گۆڵد"ە لە لێدوانێکدا بۆ ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) ی ئەمریکی لە بەرواری ٢٠٠٣/٨/٢٢ دەربارەی ئەو بەرنامەیە کەهەڵایەکی نایەوە دەڵێت "

ـە ـەرنامەیە شتی زۆری بۆ ئێمە سەلماند، گرنگترینیان ئەوەیە کە موسڵمان دوژمنی ئێمەنین.
ـێ دوژمنی ئێمە ئیسلام و ڕێ ایەکانێتی واتە:(قورئان وسوننەت) .

هەروەها ڕۆژنامەنووس "دایڤید سلیڤان" لە ڕۆژنامەی (گیروزالم پۆست) لەبەرواری
ـ ، ۲۰۰۳ دوای ئەو ووروژاندنەی ئەم بەرنامەیە دروستی کرد لەناو گەنجاندا نووسیویەتی و
ـێت : " واقیعی ئەمڕۆی عەرەب و موسڵمانان وامان پێ دەڵێت کە ئەوانەی بڕوایان بە
ـ ـەوەی ئیسرائیل هەیە لەسەر ئەخشە زۆر کەم بونەتەوە و بەرنامەی "سوپەر ستار"
ـ ـێکی پێ بەخشیوین کە ئەوەیەکی لێبوردە هەیە لەناو عەرەب و موسڵمانەکاندا دەتوانێت
ـگەڵ ئیسرائیلی جولەکە بژێت !

ـەیر ئەوەیە کەس پرسیار لەخۆی ناکات: بۆچی جولەکە بەم شێوەیە گرنگی دەدەن بەم
ـ ـامەیە و هانی خەڵکی بۆ دەدەن ؟! نەك هەرئەوەندە بەڵکو کەناڵە بینراو بیستراوەکانی خۆیان
ـ ـەراهەم کردووە ئەوانەی پەخشیان دەگاتە نێو عەرەبەکان بۆ پەخش کردنی ئەم گۆرانیانەو
ـێۆ کلیپی عەرەبی.

ـ ـوەڵامی ئەمە هەرچەندە لای گەنجی خاوەن هەڵوێست پێویست بە وەڵام ناکات بەتایبەت لای
ـ ـەی شەیۆلی زایۆنی و ناشتیە فریودەرەکەی جولەکە ئەیشێواندبوون کە جولەکە بەهاوکاری
ـەمریکا کاری بۆ دەکەن لە ڕێگەی بەرنامە و گەشتی ناشتی کە گەنجی عەرەب و جولەکە و
ـمریکی لە خۆ دەگرێت بەمەبەستی لابردنی بەستەڵەکی نێوانیان و دواتر شکستی هێنا پاش
ـەوەی کە مەبەستی جولەکە ئاشکرا بوو .

## حوکمی ئەم بەرنامەیە

ـیژنەی هەمیشەیی بۆ لیکۆڵینەوەی زانستی و فەتوادان لە شانشینی عەرەبستانی سعودی فەتوای حەرام کردنی ئەم بەرنامەیەی دەرکرد چ بەسەیرکردن چ بە یارمەتی دان و بەشداریکردن و پەیوەندی پێوەکردنیان تەنانەت دەربڕینی سەرسامیش چونکە ئەم بەرنامەیە حەرامی ڕوون و ئاشکرا دەردەخات و پەخشی دەکات .

## چارەسەر

هەندێ کەس پرسیار دەکەن چارەسەر چی یە؟ وە چۆن ڕووبەڕووی ئەم لێشاوی خراپەکارییە ببینەوە کە خۆی کردۆتە ناو ماڵەکانمان بەبێ ئەوەی مۆڵەت وەرگرێت؟ چارەسەر لەم خاڵانەی خوارەوەدا باس دەکەین :

**یەکەم** : بەئاگاهێنانەوەی خەڵکی سەبارەت بەم دیاردە خراپە ومەترسیەکانی و ئەنجامە خراپەکانی بۆ سەر ئومەتی ئیسلام .

**دووەم** : هەستان بەئەرکی سەرشانی خۆت بەدژایەتی کردنی هەموو خراپەیەك یەکەم جار لەناخی خۆماندا ودواتر لەناو ماڵ و ئەوانەی لەدەوروبەرمانن . ئەوە بەرپرسایەتی باوکە بەرامبەر ڕۆڵەکانی و برا لەگەڵ براکانی و قوتابی لەگەڵ هاوڕێکانی و دراوسێ لەگەڵ دراوسێکانی

**سێیەم** : پاككردنەوەی ماڵەکانمان لەم جۆرە شتانە و بەئاگابین لەوەی شەیتان بەناوی ڕۆشنبیری و هۆشیاریەوە خۆی نەکاتە ناو ماڵەکانمانەوە یاخود خۆمان گێل بکەین لە منداڵەکانمان بەبیانوی ئەوەی بڵێین پەروەردەکردن بەزۆر نابێت وە نابێت ڕێگری بکرێت لە منداڵ. واچاکترە خۆیان چاك و خراپ جیابکەنەوە. بەواتای ئەوەی ئێمە نەمانتوانی لە خراپە بیان پارێزین و فێری ئەوەمان نەکردن کە چاك و خراپ بناسن.

بەڵێ هەمووومان شوانین و هەمووومان بەرپرسیارین لەوانەی لەژێر دەستمانن وە پێویستە لە خوا بترسین لەوەی لەژێر دەستمانە . دەبێت ئەوە بزانین کە سپێردراوێکی مەزنە ... وە بیر لەو ڕۆژەبکەرەوە کە پێویستت بەتەنها یەك تۆسقاڵ چاکەیە و پرسیارت لێدەکرێت لە هۆکاری بەرەلآیی کچ و کوڕەکانت، وە لەو ڕۆژەدا منداڵەکانت یەخەت دەگرن وە دەڵێن : خوایە گیان باوکمان ئەمانەتەکەی نەپاراست و ئەو هۆکاری لادانمان بوو...ئەمانەش هەموو بەهۆی ئەوهۆکارانەوە بوو کە بۆی دابین کردبوون بۆ ڕابواردن و شتی نادروست . ئێوەش ئەی کچی و کوڕی لاو لە خوابترسن و دەست بگرن بەقورئان وسوننەتی پێغەمبەرەوە ئەوەش بزانن ئێوە ئامانجی دوژمنانی ئەم ئومەتەن .

دەبێ ئەوەش بزانن ئامانجتان لە ژیاندا زۆر لەوە پیرۆزترە کە دەیانەوێت پێتانی بکەن . دووبارە بڕوانن وە دووبارە سەرنج بدەن ...ئاگاداربن و دیسانەوە ئاگاداربن لەوەی ئەوانە بکەنە پێشەنگی خۆتان چونکە ئەوانە نە لە دونیاو نە لە دواڕۆژدا ڕەوشتیان نییە ... وە پێشەواو پێشەنگی ئێمە محەمەد (د.خ)، ئەوەش بزانە لەگەڵ ئەوەدا حەشر دەکرێیت کە خۆشت ویستووە ... داوا لە خوای گەورە دەکەین لە ژێر ئالآی پێغەمبەر حەشرمان بکات .

**چوارەم** : ئەم بەرنامانە ئەڵقەیەکە لە زنجیرەیەکی دوورو درێژ. ئامانجی گواستنەوەی ڕەوشتی ڕۆژئاوایە بۆمان وە تیرەکانیان بۆ گەنجەکانمان دەهاوێژن ... ئەمانە وامان لێدەکات کە بەرپرسیارێتی پەروەردە لامان زۆر گرنگ بێت و.بەوەش جێ بەجێ نابێت هەر بڵێین پەروەردە

ـتێکی گرنگە و لە مەجلیسەکانماندا باسی بکەین ... کرانەوەی کۆمەڵگاکەمان بە ڕووی ئەم حیێنەدا وا لەخێزانەکانمان دەکات ڕوو بەڕووی کۆمەڵێ هەڕەشەی توونـد ببنـەوە ... هەر کۆپی کردنی تاقیکردنەوەکانی ڕابردوو وە دووبارەکردنەوەی ڕەفتاری باووباپیرانمان بەس نییە ... چونکە دەبێت فێری هونەری پەروەردەکردن بین واپێویست دەکات توانای ئەوەمان هەبێت کە قناعەتیان پی بکەین و گفتوگۆ لەگەڵیان بکەین و کاریگەرییان لەسەر دروست بکەین . وا پێویست دەکات توانای ئەوە بەدەست بخەین کە دڵ و عەقڵیان بۆلای خۆمان ڕابکێشین .

ئەمەش ئەوە لەسەرمان پێویست دەکات کە بخوێنینەوە و گوێ بگرین و گفتوگۆ بکەین و لێکۆڵینەوە لە زۆر شت کە پەیوەندی بە پەروەردەوە هەیە وە بەردەوام بین لەسەری چونکە زۆر پێویستمان بەو بوارە هەیە .

پێنجەم : پێویستە بیر لەوە بکەینەوە کە کۆمەڵە بەرنامەیەك بخەینەکار و ئەو بۆگەنیە لەسەر ڕۆڵەکانمان لابەرین. وە کۆمەڵێ بەرنامەی ڕاگەیاندنی بەپێز و بەرنامەی خۆش و بەکەڵك ئامادەکەین لەناوگەڕەك و قوتابخانە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ئەم بەرنامانەش سەرکەوتوونابن ئەگەر نەتوانن بۆشایی گەنجان پڕبکەنەوە و لەگەڵیاندا تێکەڵ ببن .... ئەمەش کارێکی گرنگەو پێویستە پەروەردەکاران ورۆشنبیران و ڕاگەیاندن و خاوەن دارایی و بڕیاردەرەکان بەشداری تێدا بکەن .

شەشەم : پێویستە پەردەبدەین بەو ووتارانەی کە ڕوبە ڕووی تازە پێگەیشتووان دەکرێنەوە و جۆراوجۆر بکرێن و شێوازی بێزارکەر بەکار نەهێنین وە هەندێ شێوازی کۆن و بێزارکەر تێنیپەڕێنین .

## نامەیەکی ترسناك لەکچێکەوە

ناودرۆکی نامەیەکی کچێکتان بۆ دەگێڕمەوە کە بەهۆی بەرنامەی (ستار ئەکادیمی) یەوە فریوی خواردوە وە دەمەوێ کاریگەری ئەو بەرنامەیە و هاوشێوەکانی بۆ دونیاو وە کاریگەری لەسەر کچ و کوڕە هەژارەکانمان ڕوون بکەمەوە .

**کچەکە لەنامەکەیدا بۆ مامۆستاکەی نوسیوە:**

مامۆستا محمد من کچێکی تەمەن حەڤدە ساڵانم ... لەناو هاوڕێکانم دا لەقۆناغی ئامادەیی دا گوێم لێ دەگرتن کە باسی بەرنامەیەکیان دەکرد کە کۆمەڵێ کچ و کوڕ بەتێکەڵی شەو و ڕۆژ پێکەوە دەبن . یەکێ لەهاوڕێکانم پێی ووتم ئەی (س) تۆ بەردەوام دەڵێ ی من نازانم چۆن تێکەڵ بە کوڕان ببم و قسەیان لەگەڵ بکەم وەمن هەست بە ترس دەکەم کە بیر لە بەستنی پەیوەندی دەکەمەوە لەگەڵ یەکێکیاندا، وەهاوڕێکەم پێی ووتم : کاتی ئەوە هاتووە سەیری ئەم بەرنامە یە بکەی (ستارئەکادیمی) بۆ ئەوەی فێری هونەری پەیوەندی کردن ببیت لەگەڵ کوڕاندا . پاشان وەکو هاوڕێ یەکی دڵسۆز خۆی نیشان داو پێی ووتم :بەووردی سەیری بەرنامەی (ستارئەکادیمی) بکە تەنها لەماوەی دوو ڕۆژدا . پاشان بۆت دەردەکەوێت کە ئەو ترس و حەیایەی تۆی داپۆشیوە و ڕێگرە لەدروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ کوڕان دا ترس و شەرمێکی دواکەوتووە و هیچی تر. وە ئەو شەرمەی تۆ تەنها گرێیەکی دەروونی یەو بەس....!

کچەکە لەنامەکەدا دەڵێ: چاوەڕێ بووم ئەو ڕۆژە کەی قوتابخانە تەواو دەبێ . کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵ دانیشتم و بەهیچ کارێکی ترەوە خۆم خەریك نەکرد تەنها سەیری ئەو بەرنامەیە ئەیێ تابزانم ڕاستەوخۆ چی ڕوودەدات ....

کەسەیرم کرد کچان و کوڕان ئاوەناوە یەکتری ماچ دەکەن و باوەش دەکەن بەیەکتریدا و یەکتری دەگوشن، لەدەروونی خۆمدا ووتم ئەی خوایە ئەوە یەکتری دەگوشن و باوەش بەیەکتر یدا دەکەن و سەمادەکەن !!!بەبەرچاوی هەموو دونیاوە زووزوو یەکتری ماچ دەکەن !!! و پاش کەمێکی تر باوەش دەکەن بەیەکتریدا..! کەچی منیش تا ئێستا دەترسم تەنانەت بەتەلەفۆنیش قسەیەك لەگەڵ کوڕێکدا بکەم .

چەند ڕۆژێکی بەسەدا تێپەڕی هەموو شەوگارم ببوە تەماشاکردنی ئەو بەرنامەیە ڕاستەوخۆ بۆم دەرکەوت کە من کچێکی دواکەوتو و بەش خوراوم لەو ژیانە ڕۆمانسی یە کە پڕە لەخۆشەویستی و

جولآندنی سۆزو وئارەزوو ... پاشان خوازیار بووم لەهەموو ساتێك دا كە من یەكێك بوومایە
ەبەشداربووانی بەرنامەی(ئەكادیمی) بەچەندەها سەعات دابنیشتمایە و لەگەڵ فلآنەكەسی
بەشداربوودابوومایە لەوبەرنامەخۆشە ... وەئەمەوێ سەما بكەم وخۆم زیزبكەم تاكو بێت ڕازیم
بكاوماچم بكات.. وە ئەوەیان لەگەڵ منیش بكردایە كە لەگەڵ كچانی تردا دەیكەن... وەكاتێك
دەڕۆیشتم بۆ قوتابخانە هەموو قسەوباسێكی من تەنها بریتی بوو لەوەی كێ بەشداری كردووە
لەوبەرنامەیە و خەیاڵم دەكرد كەلە ژوورەكەم پێكەوە بوینایە... ووردە ووردە هەستم
بەنازایەتیەكی دەروونی كرد كە بتوانم لەگەڵ گەنجەكان دا بدوێم ئەوانەی كەلەبازاڕەكاندا
دەگەڕێن وە لەدڵی خۆمدا دەمووت تاكەی من بێ بەش بم لەم هەموو شتە... كۆتایی بەنامەكەی
دەهێنێ كە كورتەكەی ئەمەیە:

لەسەر ئەو حاڵە مایەوە وە نەفسی بەردەوام ئەمری بەسەردا دەكرد كەلەسەر ئەوشێوازەسەرلێ
شێواویە بمێنێ وئەزموونی بەختی خۆی بكا لەجیهانی حەرامەكاندا. یەكێك لەهاوڕێكانی ڕۆژێك
لەقوتابخانە پێی دەڵێت : ئایا ڕۆژنامەی (السیاسة) ت نەبینی چی نووسیوە لەسەر بەرنامە
چاكەكەی تۆ(ستارئەكادیمی) برۆ زوو بیخوێنەرەوە زۆر گرنگە...

كچەكە دەڵێت : یەكسەر چوومە سەرخەتی ئەنتەرنێت ناونیشانی بابەتەكە سەرسامی كردم (بەم
شێوەیە كوڕان نازداروكچانی دەكەن) كەیەكەم دێرم خوێندەوە تەزوویەك بەهەموو لەشمدا هات
وەهەستم كرد ئەم بابەتە لەناو هەموو خەڵكی دا بەتایبەت بۆ من نووسراوە ... وەكچەكە دەڵێت :
كاتێك گەیشتمە فەرموودەكەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كە دەفەرمووێ ( ڕەفتار و
ئاكاری قەومەكانی پێش خۆتان بست بەبست و هەنگاو بەهەنگاو دووبارە دەكەنەوە هەتا یەكێ
لەوان چووبێتە كونی بزن مژدیەكەوە ئێوەش تێ ی دەچن وەهەتا یەكێ لەوان چۆن لەگەڵ
خێزانەكەی دا كۆ ببێتەوە ئێوەش چاویان لێ دەكەن و وەك ئەوان دەكەن)

حاكم ریوایەتی كردووە فەرموودەیەكی درووستە .

سوێند بەخوا نەی مامۆستا محمد

هەر كە ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوام (د.خ) خوێندەوە، كەوتم بەسەر ئەژنۆداو بەكوڵ
دەگریام بۆ نەفسی بەد بەختم وەهەستم بەوە دەكرد كە چۆن ئەم فەرموودەیەم لەخۆمدا
جێبەجێكردبو وە چۆن من ئەو چەند هەفتەو مانگەی كە تێپەڕی ڕازی بووم لەگەڵ كۆمەڵێ
كچی سەر لێشێواو دا بژیم وە لاساییم دەركردنەوە و هیوا خواز دەبووم یەكێك بم لەوان ...

بەڕاستی ئامۆژگاری هاوڕێ دڵسۆزەکانم تەواو بوون وەسەبارەت بەهاوڕێ خراپەکانیشم کە پێیان دەووتم تاکەی تۆ دوواکەوتو و کۆنە پەرستی!! لەدرێژەی ئەو بەرنامەیە دوژمنکاری یەدا منیان واڵێ کرد بوو کە ڕەوشت و ئاکاری جوانیان لەلام کردبوو بەدواکەوتوویی وە ژیانیان بەگرێ دروونیەك بۆ پێناسە دەرکردم وە پاکێتی و عەفاف و خۆ داپۆشین لەلای ئەوان دواکەوتوویی و گێلی بوو!!!...

وەمن زۆر سوپاسی تۆ دەکەم مامۆستا محمد گیان لەسەر ئەو زلەوشەقازلەمیهرەبانیەی لە مەقالەکەت دا لێت دام، وات لێکردم کە بتوانم ڕاستیەکان ببینم و خۆم بدۆزمەوە وە ئاشنایەتی لەگەڵ دینەکەم پەیدا بکەم وکچێتی خۆم هەست پێ بکەم پاش ئەوەی خەریك بوو شوێنی خراپەکاران بکەوم ، تکام وایە بمبوری مامۆستا گیان لەوەی درێژەم بەقسەکانم دا.

## کچێکی تەمەن دوانزە ساڵی هاوار لەباوکی دەکاو دەڵێ بمدە بەشوو!

ـۆکی گەشکە گردی کاتێك کچەکەی لەبەردەمیدا ووتی ئەمەوێ بمدەی بەشوو!!
ـەوکچە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو بەلاَم چی پاڵی پێوەنا ئەو رەفتارە سەیرە لەبەردەم باوکیدا بکات
ـەویش (ستارئەکادیمی)ە . بەڵێ ئەو کچەش یەکێکە لەقوربانیەکانی ئەو بەرنامە دوڕاو و
ـیوایە. کە زۆر نابێ پێی ئاشنا بووە . ئەم کچە بەردەوام بوو لەسەیرکردنی ئەم بەرنامەیە
ۆدەیری ئەو هیچ و پووچانە دەکرد. تەنانەت لەکاتی خەویشیاندا . بەو هیوایەی شتێکی سەرنج
ـ کیشیان لێوە ببینێ وە حەزی ئەدەکرد بۆ چرکە ساتێك بچێتەدەرەوە ئەوەك شتێکی
ـەیرکردنی ئەویرویپووچانەی کەلەو بەرنامەیە هەن لەدەست بچێ .
ـەمە حاڵی بوو لەگەڵ ئەوەی دایك و باوکی بێ ئاگابوون لێی تائەو کاتەی لەبەردەم باوکی دا
ـاواری لێ بەرزدەبێتەوە (دەمەوێ شووبکەم) چۆن شتی وا ئاڵێ کاتێ ئەو تەماشای کوڕانێك بکات
ـەوەش بەکچاندا بکەن و یارییان لەگەڵ بکەن لەبەرچاوی ملیۆنەها بینەر !!! بەڕاستی رەوشت
ـەوشاو پاکیتی سەربڕا وەلەم تاریکی و گومڕاییەدا تیاچوون .
ـەری نەبێ کێ خەتابار تاوەنبار و لۆمەکراوبێ ؟ کچەکە یان دایك و باوکەکە . کەکچەکەیان
ـەردلاَ کردبوو سەیری تێکەلاَوی بەرنامەی ژەهراوی بکات . یائەوانەی بەرنامەکە پێشکەش دەکەن
ـ بەشداری دەکەن؟
دەمەوێ وەلاَمەکە بزانم ولەشەوێکی ئەنگوستە چاودا بپاڕێمەوەدو نزا بکەم لەوەی کە هۆکارە بۆ
ئەدیهاتنی ئەم بارە.
خوایە ئەوانەی خراپەیان بۆ موسڵمانان پێ یە بەنەفسی خۆیان خەریکیان بکەی. لەکاتی پلان
دانانەکەدا بیان ڕوخێنی . خوایە ئەوانەی دەیانەوێ بیرو باوەڕمان لێل بکەن خوایە چوار پەلیان
گیرکەی. زمانیان لاڵ کەی. چاویان کوێرکەی ، بەلاَیان بەسەردا بێنی .بەخراپ ترین شێوە
لەناویان بەری ئەی خوای پەروەردگار .

# مەترسی پیگە بەدڕەوشتیەکان

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

. سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، درووددوو سەلام لەسەر پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر(درروودی خوای لەسەربێ) و یارو یاوەرانی و ئەوانەی شوێن کەوتەی بەرنامەکەین تا ڕۆژی دوایی.

بابەتی بەد ڕەوشتی ئەخلاقی و رووت و قوتی گەورەترین مەترسیە لەسەر کۆمەڵگا کۆن و تازەکان وە پێغەمبەر (درروودی خوای لەسەربێ) هەواڵی پێداوین کە دەفەرموێ (شتێکم بەجێ نەهێشتووە لەدوای خۆم لەو فیتنەیە گەورەتربێ کە ئافرەت لەسەر پیاو هەیەتی).

وەزارەتی دادی ئەمریکی لەلێکۆڵینەوەیەکی خۆیدا دەڵێ: بازرگانی کردن بە ئافرەت و لەش فرۆشی و بەد ڕەوشتی بەبرەوترین بازرگانیە ... بڕی ئەو پارەیەی کەبازرگانی پێوەدەکرێ لەو بارەدا دەگاتە هەشت(٨) ملیار دۆلار . وەپەیوەندیەکی بەتینی هەیە بەتاوانکاری ڕێکخراوەوە.بازرگانی لەش فرۆشی زۆرێك لەبوارەکان دەگرێتەوە وەکو پەرتووك و گۆڤارو کاسێتی ڤیدیۆیی و کاناڵەئاسمانیەبەد ڕەوشتەکان و پێگەکانی ئینتەرنێت.

وەسەر ژمێریەکی ئیستخباراتی ئەمریکی (ئێف.بی .ئای) دەڵێ بازرگانی لەش فرۆشی بەگەورەترین و سێ یەم سەرچاوە ی دەهاتی ئەخشە بۆکێشراو دادەنرێت لەدوای ماددەی بێ هۆش کەرو قوماروله ٨٥٪ قازانجی گۆڤارو فیلمە بەد ڕەوشتیەکانیان بەدەستەوەیە، وەدەبینین لەم کاتەی ئێستادا لەئەمریکا بەتەنها (٩٠٠) هۆڵی سینەما هەیە کە تایبەتە بە پێشکەش کردنی فیلمی بەد رەوشتی وەزیاتر لە(١٥٠٠٠) کتێبخانە و فرۆشگای ڤیدیۆ بازرگانی بەفیلم و گۆڤارە بەدڕەوشتیەکانەوە دەکەن. ئەم ژمارەیە زیاترە لە چێشتخانەی(ماکدۆنالد) دکان بەسێ ئەوەندە وە لە کاتێکدا ئەمریکا لەڕابردوودا گەورەترین بەرەنگاربوونەوەی ڕاگەیاند دژی بلاْوکردنەوەی بەد رەوشتی لەکۆمەڵگاکەیدا ئەویش بەسەپاندنی هەندێ سیستەم و یاسا ، بەلاّم تێبینی دەکەین لەم سەردەمەدا ئەوانی دژی بلاْوبوونەوەی بەدڕەوشتی بوون بەردەو رووخان چوون لەو جەنگەی ڕایان گەیاندبوو ، ئەوەبوو ئەو دەزگا ستۆدیۆکان چاودێریان لەسەر فیلمەکان ئاسان و کەم کردوەتەوە و زاراوەی بەدڕەوشتیان بەشێوەیەکی تر پێناسەکردوە . ئەوە بوو ئەو فیلمە بەد ڕەوشتیانەی پێش سەدەیەك لە ژێر بەندی (×) پۆلێن دەکران ئەمڕۆ بە شێوەیەکی تر هەڵدەسەنگێنرێ و دەخرێنە ژێر بەندی ( R ) ەوە کە سوکترە.

هەرودکو چەند کۆمەڵەیەکی تر دروست بوون بەناوی ( CN - ١٧ ) بۆ هەمان ئامانج . ودلەم دوایيەدا لە ئەمریکا توانیان بەسەرکەوتوویی هەندێ یاسا بگۆڕن لەوانە (پاکێتی لەپەیوەندیدا) وە بۆ ئەوەی خەلکی بتوانن مومارەسەی بەدڕەوشتی بکەن وهیچ یاسایەك نەتوانێت ڕێیان لێ بگرێت . ودناشکراشە کە ئەمریکا یەکەم دەولەتە لەجیهاندا لەبەرهەمهێنانی بابەتی بەد ڕەوشتیدا .... سالانە (١٥٠) گۆڤار لەوبابەتە یا (٨٠٠٠) ژمارە سالانە دەردەکات. بازرگانەکانی بەکرێ دانی فیلمی بەد ڕەوشتی لەسالی (١٩٨٥) (٧٥) ملیۆن بون زیادیان کردوە بۆ (٦٦٥) ملیۆن لەسالی ١٩٩٦ دا. ودئەوانەی ئەو جۆرە بازرگانیەیان کردووە دەیانزانی کە خەلکانێکی ترهەن کەحەزیان بەو کاسبیە هەیە و دلیان بۆی لێدەدا. ئەگەر لەترسی حەیا، یا ئەوەی خەلکی بیان بینێ نەوبازرگانیەیان دەکرد یان کاریان لەناو سینەماو فیلمەکاندا دەکرد بۆیە ڕێگەیەکی ئاسان تریان گرتە بەر ئەویش دەرگا ودلا کردن بوو لەڕێگای نامە ناردنەوە. ودپاش ئەوەی فشاریان خرایە سەر لەلایەن دەولەتەوە. هاتن بەشێوازێکی تر کارەکەیان ڕووپۆش کرد بەپەرەی (بنی) تاوەکو ناودڕۆکەکەی نادیار بێت . ودلەگەل ئەوەش خەلکی ناودڕۆکی ئەو نامانەیان دەزانی ئەمەش دەبوە هۆی سلمینەوەی هەندێ لەو دەروون پاکانەی لە بەدڕەوشتی و ناوزڕان دەترسان . تەماشا کە ئەو بازرگانانەی کە لەبواری ڕووتی دا کاددەکەن دەگەڕێن بۆباشترین هۆکار و ڕێگا کە بگونجێ بۆ ئەوەی بەو ڕێگایە ڕاستەوخۆ وبەنهێنی خۆیان بهاونە مالەکانەوە. لەوسۆنگەیەوە توانراوە باشترین سوود لە بەرنامە ڕاستەوخۆکان و هێلەکانی تەلەفۆن وخەتی ئینتەرنێت وەربگیرێت. ودتۆڕی ئەنتەرنێت لەم کاتەی ئێستا باشترین و سەرکەوتووترین ڕێگەیە بۆ ئەو مەبەستە. بۆیە لاپەڕەکانی (تۆڕی جیهانی) کەتایبەتە بەڕووت و قووتی بەبێ رکابەری باشترین ڕەواجی هەیە لەهەموو جیهاندا. خوای گەورە بمانپارێزێ....

## تۆڕی ئینتەرنێت چی یە؟

تۆڕی ئینتەرنێت بریتی یە لە ملیۆنەها کۆمپیوتەر لەجیهاندا هەندێکیان بەهەندێکیانەوە بەستراونەتەوە . ودلەگەل بوونی پەیوەندیەکی زۆری نێوان ئەم کۆمپیوتەرانە دەتوانن لەچاو تورکانێکا نامە گۆڕینەوە بۆ یەکتر بکەن ..... لەگەل گۆڕینەوەی مەلەف . و وێنەی وەستاو جولاوو بابەت و ئەو زانیاریانەی کەناویان ناوە (تۆڕی جیهانی) .

## گواستنەوەی نەخۆشی بۆ ئینتەرنێت وهێرش هێنانی بۆناوماڵەکان

ڕێژەی بەشداربوانی تۆڕی ئینتەرنێت هەر (١٠٠) ڕۆژ جارێك زیاد دەکات لەلێدوانێکی وەزارەتی بازرگانی ئەمریکی دا ڕایگەیاند لەلاپەڕەکانی (تۆڕی جیهانی) لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٧ گەیشتبوە (٢٠٠) ملیۆن لاپەڕە و لەساڵی ١٩٩٨ گەیشتە(٤٤٠) ملیۆن لاپەڕە. وە ژمارەی ئەوانەی سەردانی ئەم تۆڕەیان کردووە ١٤٠ ملیۆن بووە لەساڵی ١٩٩٨ دا. وەئەم ڕێژەیە کۆمپانیای (جینرالْ ماجیك) و گۆڤاری (التایم) دانیان پێدانابوو . بەلاَم هەندێ وای بۆ دەڕوانن تەحەفوزیان هەیە ئەگینا ژمارەی ڕاستی لاپەڕەکان لەساڵی ١٩٩٨ گەیشتبووە (٦٥٠) ملیۆن لاپەڕە . وە تێبینی ئەوە دەکرێت زیاد بکات بۆ (٨) ملیار لەساڵی (٢٠٠٢) دا وەژمارەی لاپەڕەکانی بەرەڵایی لەتۆڕی ئینتەرنێت مەزەندە دەکرێت بە(٢,٣٪) لەقەبارەی گشتی لاپەڕەکانی ئینتەرنێت بێت . وەئەم ژمارەیە بەوە ئەژمار دەکرێت کە بەو شێوەیە نیە و وێنەی ڕاستی گرفتەکە نادات بەدەستەوە.وەك نموونەیەك بۆ ئەمە دەکرێ لەشارێك دا(١٠٠) بازاڕ هەبێ بەلاَم زۆربەی خەڵکی ڕوو لەیەك بازاڕیان دەکەن لەنێوان ئەم (١٠٠) دانە یەدا ، وەبەڕاستی دەبینین ئەم ژمارەیە پشتگیری بیردۆزەکەمان دەکات. کۆمپانیای(Play boy) بەد ڕەوشتی بۆ نموونە دەڵێ (٤,٧) ملیۆن سەردانی سایتەکەی دەکەن لەهەفتەیەك دا . وەهەندێ کۆمپانیا هەستاون بەلێکۆڵینەوەی هەندێ بەشداربووی سایتەکانی ڕووت و قووتی و بەرەڵایی لە ئینتەرنێت بینیان کۆمپانیای (web side stor) هەندێ لەسایتەکانی بەرەڵایی( ٢٨٠٠٣٤) کەس ئەو سایتانە دەکەنەوە ڕۆژانە .وە زیاتر لە (١٠٠) لاپەڕەی هاو وێنە لە (٢٠٠٠٠) بەشداربوو دەکات، وەزیاد لە (٢٠٠) لاپەڕەی لەو جۆرە پێشوازی لە (١٤٠٠) کەس دەکەن ڕۆژانە. وەتەنها یەك سایت لەو سایتانە پێشوازی کردووە لە (٤٣٦١٣٥٠٨) کەس لەماوەی دوو ساڵدا . وە یەکێك لەو لایەنانە دەڵێ زیاد لە (٢٠٠٠٠٠) هەزار وێنەی ڕووتی لایەو زیاد لەیەك ملیار جار بلاَوی کردوەتەوە. لێکۆڵەرانی زانکۆی (کارنجی میلون) هەستان بەلێکۆڵینەوەی ئامار لەسەر (٩١٧٤١٠) وێنە (٨,٥) ملیۆن جار گەڕاندبوویانەوە لە (٢٠٠٠) شار لە (٤٠) دەوڵەت دا، بینیان نیوەی ئەو وێنە گەڕاوانە لە ئینتەرنێت وێنەی ڕووت و بەڕەڵایی بوو ، وەلە ٨٣,٥٪ ی ئەو وێنانەی کە دەساودەسی پێ دەکرێت لەهەواڵەکاندا وێنەی بەرەڵایی یە. وەلەسەرژمێریەکی دەزگاری زوجبی لەمارسی ساڵی (٢٠٠٠) بینیان زیاد لە ٢٪ دانیشتوانی ئەمریکا سەردانی سایتە بەرەلاَ کان دەکەن . وە لێکۆڵەر ستیف واترز دەڵێت : زۆرجار ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی حەز بە زانینێکی پاکیزەییانە دەست پێدەکات پاشان گەشە دەکات لەدوابیدا بۆ ئیدمان و پاشان دەرئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە وەك خراپی پەیوەندی نێوان هاوسەرەکان و خراپتریش لەوە . بازرگانەکان هەستیان دەکرد کە بەدەست هێنانی پارەو ماڵەکان ئاسان نیە و گران کۆدەکرێتەوە

لەرێگای لاپەڕەکانی ئەم تۆڕە جیهانیەوە وە تاکە ڕیگای کە پارە زوو بێتە دەستت ئەویش بریتی یە لە توێژی لاپەڕەکانی بەرەلایی چونکە بازرگانیەکی زۆر بەکەلکە !!خەلکی بەلێشاو رووی تێدەکەن ئەگەر بشزانن پارەیەکی زۆری تێدەچێ لەبەرامبەر بەدەست هێنانی ئەو خزمەت گوزاریەدا !!

دکتۆر (براندۆن) تێبینی ئەوەی کردوە کە پروپاگەندەو راگەیاندن گەورەترین کاریگەری هەیە لەسەر ئاکار و چارەنووسی کۆمەلگاکان وە دکتۆر( براندۆن) دەلێ لەسالی ١٩٤٥ ئامێری تەلەفزیۆن هاتە ئەمریکا و کەنەداوە ، لەنێوان سالی ١٩٤٥ ١٩٧٤ ڕێژەی کوشتن لەو دو ولاتە دا زیادی کرد بۆ ٩٣٪ لەئەمریکا و ٩٢٪ لەکەنەدا . وەدکتۆرتێبینی ئەوەەی کرد کە ڕاگەیاندن ڕۆلی سەرەکی دەبینی لەبلاوکردنەوەی بیری توندو تیژی و تاوان. وەئەم لێکۆلینەوەیە لەسەر کۆمەلگای باشووری ئەفریقیا پیادەکراوە کاتێك دەولەتی باشووری ئەفریقیا رێگەی نەدا ئامێری تەلەفزیۆن بێتە ولاتەکەی لەبەر هەندێ هۆی رامیاری تا سالی ١٩٧٥ وەهۆیەکانی تری ڕاگەیاندن وەکو پەرتووك و ئێزگەو گۆڤار و.... هتد بەشێوەیەکی فراوان و پێشکەوتوو زۆر بووە بۆیە توانیویەتی نەهێلێ کاریگەری لەسەر ئەو بوارە هەبێ. بۆیە دکتۆر براندۆن تێبینی ئەوەی کرد کە ڕێژەی کوشتن لەوولاتی باشووری ئەفریقیا دابەزیوە بەڕێژەی ٧٪ وەلەهەمان کات دا لەسالی ١٩٤٥ ١٩٧٤ ڕێژەی تاوانی کوشتن لە ئەمریکا و کەنەدا لەبەرزبوونەوەدا بوو ، وەلەسالی ١٩٧٥ ئامێری تەلەفزیۆن چووە وولاتی باشووری ئەفریقیا وە دکتۆر براندۆن پێ ی باش بوو بەدواداچوونێ بکا لەسەر کاریگەری یە کانی ئەو ئامێرە (تەلەفزیۆن) لەسەر ڕەفتارو بەهاکانی ئەو کۆمەلگایە ..... دکتۆر براندۆن پێشبینی ئەوەشی کرد کەلە کۆمەلگای باشووری ئەفریقیادا ڕێژەی تاوان بەرز دەبێتەوە لەنێوان (١٠ ١٥) سالێ دا لەسالی ١٩٧٥ دوە سالی بلاو بوونەوەی تەلەفزیۆن بووە ، وەیەکەم دەستەیەك کە پێشوازی لەو تاوانەدەکا گەنجە سپی پێستەکانە. لەدوای ئەوان گەنجە ڕەش پێستەکان ... لەدوای سێ سالە هەروا دەرچوو ئەوەبووسالی ١٩٨٩ سەرژمێریەکانی قوربانی یەکانی تاوانی کوشتن لەباشووری ئەفریقیا بلاوکرایەوە . !! وەلەسالی ١٩٨٧ بینیان کە ڕێژەی کوشتن تا ئەو سالە زیادی کردووە بۆ ١٣٠٪ بە بەراورد لەگەلێ سالی ١٩٧٥ بەواتای ژمارەی قوربانی دانی کوشتن زیادی کردوە بۆ دوو ئەوەندە زیاتر لەنێوان ئەو ١٢ سالەدا، وەکاتێك پرسیارکرا لە دکتۆر براندۆن ،چۆن زانرا کە گەنجانی سپی پێست پێش گەنجانی ڕەش پێست دەکەون لەوکارەدا ؟ ووتی : چونکە دەولەمەندەکان لەکۆمەلگای باشووری ئەفریقیا لەوکاتەدا سپی پێستەکان بوون. لەبەر ئەوە دکتۆر زانیوێتی کە ئەوان یەکەم کەس دەبن باوەش بۆ ئەو ئامێرە تازەیە دەکەنەوە منداڵەکانیان یەکەم توێژی منداڵان بوون ڕووبەڕووی بوونەوە و تێربوون لێی . پاش تێپەڕ

بوونی سێ ساڵ ڕەش پێستەکانیش ئەو ئامێردیان کری و بەکاریان هێنا کەلای سپی پێستەکان بوو کاریگەری لەسەر ئەوانیش دەستی پێکرد. پاش تێپەڕبوونی نزیکەی دەساڵ ئەو منداڵانەی کەلەسەر دەستی تەلەفزیۆن گەورەبوون و بوون بەگەنج ، کاریگەری یەکان دەرکەوتن لەسەریان وەبەهەمان شێوەش لەگەڵ ڕەش پێستەکان، وەبەڕاستی ئەوە ڕووی دا کەدکتۆر براندۆن پێشبینی دەکرد. دکتۆر براندۆن لێکۆڵینەوەی تری گەورەی ئەنجام داوە لەهۆکارە کاریگەریە چاوەڕوان کراوەکان وەکو جیاوازی تەمەن ومەدەنیەت وبلاّبوونەوەی چەك و، باری ئابووری و ، خواردنەوەی ئارەق و تۆڵەکردنەوەو، ئاڵۆزی باری ڕمیاری و نەتەوەیی. هیچ یەك لەم هۆکارانە هاوکات نەبوون لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا تا وەکو هۆکارەکەی بگێڕێتەوە بۆ ئەمانە ، سەرنج دەدرێ ئەمە یەکێکە لەو توێژنەوە هاوشێوانەی کە دەری خستووە مرۆڤ کاری تێدەکرێ بەو شتانەی دەیبینێ وەچەندان باری تریش هەیە کە کاریگەری خراپی هەیە لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ وەکو تلیاك و دارمان و ئالودەبوون بە بێ ڕەوشتی و دەست درێژی نەخلاقی و نازاردانی ئەوانەی دەست درێژی یان کراوەتە سەر و لیوات و دەست درێژی کردنە سەر مناڵ و ئەنجام دانی حەرام لەگەڵ ئاژەڵ و بە کەسە مەحرەمەکان و چەندانی تر . خوا پەنامان بدات و بمانپارێزی .

## توێژینەوە

توێژینەوەیەکی تر جەخت لەسەر ئەم ڕاستیە دەکاتەوە کە هەریەکە لە ( الیزابیپ باولوتشی و .مارك جینیوس و ، کلودیوفایولاتو) لەولاّتی کەنەدا پێی هەستاون ئەویش بەدیراسەکردنی (٧٤) لێکۆڵینەوەی جیاجیا کە هەموویان دیراسەی کە کاریگەری کارەساتەکانی بەرەڵایی جنسی دەکەن نەسەر تاوانە جنسیەکان بەهەموو جۆرەکانیەوە. ئەم لێکۆڵینەوانە چەند ولاّتێکی پیشەسازی گردۆتەوە وەکو (ئامریکاو کەنەداو وولاّتانی ئەوروپا) لەنێوان ساڵی ١٩٥٣ – ١٩٩٧ .کۆی (١٢٩١٢) کەسیان ڕووبەڕووی ئەو ماددانە بوونەتەوە. لەئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە یە دا ڕێژەی داڕووخانی ڕەوشتی لە ئاستی گشتی دا بە پێی پێودرە ڕۆژئاواییەکان ڕێژەی ٢٨٪ کە ( ڕووتی و جاسووسی کردن بەسەر ناموسی خەلکەوە بەکامێرای شاراوە . لێك خشاندنی لاشەیی لەشوێنە قەرەباڵغەکاندا ...هتد) دەگرێتەوە.

هەروەها بینیان ڕێژەی تاوانی توندو تیژی و ئەتك کردن زیادی کردووە لای ئەوانەی کەرەسەکانی بەد ڕەوشتی بەکاردەهێنن بەڕێژەی ٣٠٪ . وەڕێژەی دا ڕووخانی پەیوەندی هاوسەری و توانای جنسی لەگەڵ هاوسەردا دابەزیوە بۆ لە ٣٢٪ وە ڕێژەی تاوانەکانی ئەتك کردن گوێ پێ نەدان زیادی کردووە بۆ لە ٣١٪ .

وه (دارل بوب) كه ئەفسەره لەپۆلیسی (میشیغان) لەئەمریكا ، هەستا بەلیكۆلینـــەوەی (٢٨٠٠٠) حالەتی دەست دریژی لەنیوان ١٩٥٦ ١٩٧٩ ) بینی ریژەی لە ٤١٪ ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانـە خۆی رووبەرووی ماددەی بەدرەوشتی كردوەتەوە پیش یان لـەكاتی ئـەنجامدانی تاوانەكە . وه (دیفید سكات) پشتگیری ئەو هەلویستە دەكات و دەبینی لـە ٥٠٪ دەست دریـژی كـەران پیش ئـەوەی ئـەو تاوانە ئەنجام بدەن هۆكاری بەدرەوشتی و خۆچالاك كردنـی سیكسیان گرتۆتـە بـەر . وه دەزگای هەوالگری ئەمریكی (ئیف . بی . ئای) ئەوەی روون كردوه كە لە ریژەی لە ٨٠٪ حالەتەكانی ئـەتك كردندا ماددەی بەد رەوشتی دەدۆزریتەوە لەشوینی تاوانەكەیان یاخود لە مالی تاوان بارەكەدا.
وەلیكۆلینەوەیەكی دكتۆر ( ولیام مارشال) دا دانـی بـەوەدا نـاوه كـە لـە ٨٦٪ دەست دریـژی كـەران بەریژەیەكی زۆر ماددەی بەد رەوشتی بەكار دەهینن. وەدانیشی بەوەدانا كە لە ٥٧٪ لەوانە لـەكاتی جیبەجی كردنی تاوەنەكەدا لاسایی یـەكیك لـەو دیمەنانـە دەكەنـەوە كەپیشتر لەسـەرچاوەكانەوە بینیویانە.
وەسـەبارەت بەدەست دریـژی كردنـە سـەر منـدالان پـاش لیكۆلینەوەلـە (١٤٠٠) حالـەت لـەو بابەتـە لەشاری (لویسفیل) لەنیوان سالانی ١٩٨٠ ١٩٨٤ بینرا كە وینەی رووت و قووتی هەرزەكاران لـەلای هەموو تاوان باران هەیە وەهەروەها وینەی رووت و قووتـی منـدالان لـەلای زۆربـەیان هەیـە. وەلە لیكۆلینەوەیـەكی پاشـتری هەمەلایەنـە لـەم رووداوە دل تەزینانـە لەلایـەن ئەنجومـەنی پەرلـەمانی ئەمریكا وەبینرا كەخالی هاوبەشی نیوان تاوانباران بەبی جیـاوازی ئـال و گـۆری وینـەی مندالانـی رووتن. هەر بۆیە پۆلیسی ئەمریكی زۆرجار لە ئەنتەرنیت دا كەسـیتی منـدال بـەخۆیان دەدەن تـا وەكو ئەو جۆره تاوەنبارانە دەستگیر بكەن.
دكتـۆر (مـایكل مـهتا) بەئاشـكرا لـەزانكۆی ( كویـنز ڤی كینجسـتۆن باونتـاریو) لەكەنـەدا پـاش لیكۆلینـەوە كـە (١٨) مـانگی خایـاند ئامـاژەی بـەوە كـرد كـە رەوتیكـی دیـار هەیـە ، وینـەی رووتـی مندالان دەگرن ریژەكەی لەسالی ١٩٩٤ دا ١٥٪ بوو پاشان بۆ ٢٠٪ لەسالی ١٩٩٦ زیادی كردووه .

## چەند بەلگەیەكی زیندوو

دكتۆر (فیكتۆر كلاین) دوای لیكۆلینـەوەیەكی لەكۆمەلیكی زۆر لەوانەی كـە تووشـی ئـەو نەخۆشـی یە بوونە، هەستی كرد كە كەل و پەلەكانی بەرەلایی بەئاسـانی بەردەسـتی خـەلكی دەكـەون بـەبی ریگری و سانسۆریك .سەرنجی خەلكی رادەكیشی و بەرگەگرتن و رووبەرووبونەوەی كاریكی ئاسان نیە تەنانەت ئەگەر ریژدیەكی زۆریش لەمال و سامان لەپیناوی دا ببەخشن. هەرودها گەیشتە ئەو

دەرئەنجامەی کە بوونی کەنالەئاسمانیەکان ئەوانەی زیاتر بەرەلایین لەمالەکاندا، دەبیتەهۆی لیکەوتنەوەی کاری ترسناك و دل تەزین وەکو دەست دریژی منالان لە خوشك وبرا بچوکەکانیان لەرووی لایەنی جنسی یەوە .

وەلەکۆتاییدا دکتۆر (فیکتۆر) سەرنجی ئەوەی دا کە نموونەی ئەو کەسە دەست دریژی کەرانە بەئاسانی نازانریت کە بەدرەوشتن یان شەرەنگیزن. وەکو ئەوەی کەسەکە لەبواری خویندن دا ئاستی بەرزە یا سەرۆکی کۆمپانیایەکە یا کەسیکە کاری باش ئەنجام دەدا لەدوایدا دەردەکەویت کەئەوە دەست دریژی کردوەتە سەر ئافرەتان بە چەقۆ یان دەمانچە. وەکو لەهەردوو ناوچەی (فینکس) و (توسون) بینرا. وەتاکە پالنەری سەرەکی بۆ ئەنجام دانی ئەم کارانە بریتی بووە لەوەی کە زۆر بەئاسانی ماددەکانی بەرەلاییان هەر لە مندالیەوە دەست کەوتووە و بەکاریان هیناوە .

وەدەزگای هەوالگری ئەمریکی (ئیف . بی . ئای) هەستا بەموقابەلەکردن و وەلام وەرگرتنی (٢٤) تاوانبار لەبەندیخانەکاندا دەرکەوت هەر هەموویان هەستاون بەکوشتن و ئەتك کردنی ژمارەیەکی زۆر لەتازە هەلچوان و منالان وەبینیان لە ٨١٪ لەو تاوانبارانە بەزۆری خۆی رووبەرووی ماددەکانی بەرەلایی کردوەتەوە پاشان هەستاوە بە پیکەل کردنی ئەوەی بینیویەتی بەسەر کەسانی تردا و بەشیوەیەکی زۆر درندانە .

وەیەکیك لەوتاوانبارانە کەناوی (ارپور گاری بیشوب) ەو دەست دریژی جنسی ترسناکی کردوەتە سەر (٥) منال و پاشان کوشتویانیتی وەبچوکترینی ئەو مندالانە تەمەنی (٤) سالان بووە (دانی دیرس)!. ئەم تاوەنبارە بەشیوەیەك راهاتبوو لەسەر ئەم جۆرە تاوانانە تا ئەندازەی ئەوەی هەرگیز گویی پی نەئەدا. بەجۆریك کاتیك منالەکەی دەکوشت لاشەکەی دەخستە سندووقی سەیارەکەیەوە پاشان دەچوو بۆ کار و دواتر نانی نیوەرۆی دەخوارد ، وەکاتیك دەستی بەتال دەبوو دوای هەمووکارەکانی دەچوو تەرمەکەی فری دەدا.

وەیەکیك لەو مندالە کوژراوانە ( کیم پیترسن) ی (١١) سالان بووە کە (ارپور) بەفیشەك کوشتویەتی و خنکاندویەتی و عەورەتی شیواندووە.

(دون بیل) کەئەفسەرە لەپۆلیسی (یۆتا) وەسفی ئەم تاوەنبارە دەکات کە پیاویك بووە بەروالەت لەو پەری نەرم و نیانی و قسە خۆشی و کەنارگیر بووە لەقسەی هیچ و پوچ وەبەخەیالی هیچ کەسیکدا نەهاتووە کە گومان بەریت بەوەی لەناخیدا حەشاری دا بوو.

ئەوەی کەزانراوە لەبارەی ژیانی ئەم تاوەنبارەوە ئەوەیە ئەندامیکی چالاکی دەزگای (الکشافە) بووە . وەیەکیك بووە لەکەسە ناودارە و سەرکەوتووەکان تیایدا، وەخەلاتی ریزلینانی پی بەخشراوە .

وەیەکێك بووە لە مژدە دەرانی ئایینی مەسیحی وە پاش دەستگیر کردن و زیندانی کردنی بەراشکاوی ووتی:

ئەگەر ماددەی ڕووت وقووتی و بەرەلآیی لەمندالی یەوە لێم قەدەغە بکرایە ئەوە من شەیدای جنس و لادانی سێکسی و ئەو تاوانانە نەدەبووم کە ڕوویان دا.

هەروەها لەبارەی کاریگەری کەرستە بەرەلآییەکانەوە وتی (کاریگەری ئەوانە وای لێکردووم کە زۆر درندەو قێزەون وکەسێکی شاز بم لە ڕووی جنسی یەوە ، وەدەست درێژی کردنە سەرمندالآن و کوشتنیان بوو. هیچ لەم کارانە ڕوویان نەدەدا ئەگەر ماددەی ڕووت و قووتی و بەرەلآیی زۆر نەبوو نایە. وەلە ١٠/٦/ ١٩٨٨ (گاری بیشوب) لەسێدارە درا.

وەنموونەی تری زیندوو هەیە کە دەرئەنجامی ترسناکی لێ کەوتووەتەوە بەهۆی زۆر و زەوەندەی بابەتەکانی بەرەلآیی. وەئەوەش نموونەی کەسێکی پیاو کوژی خوێن ڕێژ کەلەهەموو ئەمریکا دەنگی دابووەوە و ناسرابوو بە (تید باندی) ئەم پیاوە لەمالێکی پارێزگارا بوو ئەندامێکی ( الکشافه) بووەو قوتابی کۆلێژی یاسابووەو گەنجێی ڕووخۆش و سەرنج ڕاکێش و بەڕەوشت بووە لەڕوالەتدا.

پاش ئەوەی دەستگیرکرا ئەم خوێن ڕێژە نزیکەی (٤٠) ئافرەتی فڕاندبو و ئازاری دابوون و شێواندبوونی و پاشان کوشتبوونی .وەبەئەشکەنجەدان وازی نەهێنابوو لێیان ، بەلکو خنکاندبوونی و کاری سێکسی لەگەلدا کردبوون و زۆر درندانە لاشەیانی شێوانبوو بەشێوەیەکی زۆر ترسناك ، هەر بەوەشەوە نەوەستابوو بەلکو گۆشتەکەیانی دەخوارد و وەهەندێکیانیشی بەچەقۆ دەشێواند. بچووکترین قوربانی مندالێکی تەمەن (١٠) سالان بوو ، ئەم پیاوە خوێن ڕێژە ئەم مندالەی فڕاندبوو ئازاری دابوو پاشان دەست درێژی کردبووە سەری و نەرمایی ڕانی خواردبوو ، پاشان زۆر بەناشرینی کوشتبووی و لاشەکەی لەناو گەوری بەرازدا دانابوو بۆ ئەوەی بۆگەن بکاو کەڕوو هەلبێنێ.

ئەم کابرایە تاوەنبار کرا بەکوشتن و شوێنی ددانەکانی لەسەر لاشەی مندالە فڕێ دراوەکە دەرکەوت و بەئامێری پێشکەوتوو دۆزیانەوە کە شوێنی ددانەکانی (باندی) یە. پاش ماوەیەکی زۆر ئەم پیاوە هەر دەیووت من بێ تاوانم ، تاوای لێ هات خەلکێکی زۆر داوای ئازاد بوونی زۆر بەپەلەو بێ دوواکەوتن یان دەکرد . بەلآم لەکۆتایی دا بڕیاری لەسێدارەدانی دراو دانی نا بەتاوانەکانی دا ناو. لەدیمانەیەکی تەلەفزیۆنی تۆمارکراودا پێش لەسێدارەدانی بەماوەیەکی کەم ، ووتی:

((ئێوە خۆ هەر دەمکوژن و کۆمەلگا لەشەڕی من ڕزگار دەبێ بەلآم کەسانی زۆر زۆری وەکو من هەن ئیدمان بوون بەهەندێ وێنەی بەرەلآییەوە. وەئێوە ناتوانن هیچ کارێك بکەن بۆ چارەسەر

کردنی ئەم گرفتە هەروەها ووتی : لەسەرەتادا ئەم وێنە بەردلاَیانە ئەم بیرکردنەوانەی لادروست دەکردم وەکو خوم پێوەگرت و ڕاهاتم لەسەری . چونکە تۆ بەردەوام حەزدەکەی ئەوانە فێر ببی وبەردو گران و زۆر گرانترە دەروانی و تا بەرزترین ئاستی وروژاندن بەدی بێت دەبێ کە پلەکەی زۆر لە ووروژاندنی بەرزترە تاوای لێ دێ بەوێنەی ڕووت و قووتی ئارەزوەکان تێر نابێ. دەگەیتە قۆناغی دەست پێکردن و بەنەفسی خۆت دەڵێی ئایا دەتوانی ئەو کارە بکەیت بۆ ئەوەی ئارەزووەکانت تێر بێ بەشێوەیەك کە زۆر خۆشتر بێت لەوەی بە خوێندنەوەو تەماشاکردن )) .
ودووتی من و هاو وێنەکانی مـن بـەدڕندەیی لـەدایك نـەبووین بـەڵكو ئێمـە كـوڕ تـانین و هاوسەرتانین و لەماڵی خۆپارێزدا پەروەردە کراوین. بەڵام کەرەسەکانی بەرەڵایی دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە هەموو ماڵێك و منداڵەکانتان بفرێنێ ،وەهەروەها چەند سەعاتێك پێش [illegible] کەی ووتی :
ماوەیەکی زۆرە لەزیندان دا ژیاوم وە هاوڕێیەتی پیاوانێکم کرد کە وەکو من ڕاهاتوون لەسەر توندو تیژی وەبەبێ جیاوازی هەموویان نقوم و ڕۆچوون لەوێنەی ڕووت و قووتی داوئەو وێنانە ڕۆڵێکی کارای هەبووە بەسەریانەوە و هەموویان ڕاهاتوون لەسەری وخویان پێوە گرتووە وەبەهەمان شێوە پیاو کوژ (جیفری دامر) ژیانی بەتاوان و دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتان [illegible] . پاشان تاوەنکاریەکانی تەشەنەی کرد بۆ کوشتن ولادانی نەشاز و ، چەندان پیاو و مند[illegible] کوشتبوو وە دەست درێژی کردبووە سەریان ، ئەو قوربانیانەی زیندانی دەکرد بۆ ماوەیەکی زۆر و ڕۆژانە دەست درێژی دەکردە سەریان بەشێوازی جیاواز دەیشێواندن پاش ئەوەی نەفسی بەوانە تێری بخواردایە و بێزار ببوایە لێیان دەیکوشتن و بەمشار پارچەپارچەی دەکردن و هەندێکی دەخوارد و هەندێکی تری لەناو سەلاجەدا هەڵدەگرد و هەندێکیشی بەترشەلۆکەکان دەتواندەوە. دوای ئەوەی دەست گیر کرا ، پۆلیس ماڵەکەی پشکنی ، چەندین [illegible] لاشەیان دۆزییەوە لەناو سەلاجەو دۆلاب و شوێنی تردا . [illegible] یەکێکی [illegible] سەلاجەکەدا دۆزییەوە
پاشان پرسیاریان لێ کرد سەبارەت بەوتاوانەی [illegible] پاریزم بۆ ئەوەی دوایی بیانخۆم ئەم تاوانبارە کرێکی [illegible] بەشداریان تێدا دەکرد. وەپۆلیس پاش دەستگیرکردنەکە[illegible] دیان لەکاسێت و وێنەی بەد ڕەوشتی دۆزییەوە کە لەژماردن نەدەهاتن.
جیفری لەساڵی ١٩٩٦ لەگەرماوی بەندینخانەدا مرد لە بەرئەنجامی پێداکێشانی یەك لەدوای یەکی ئاسنێك کە بەندیەکی تر بۆی داگرتبوو.

# سەرئەنجامی داوێن پیسی و کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا

سەرژمێریەکانی وەزارەتی دادی ئەمریکی دەری دەخات بڵاو بوونەوەی هۆکارەکانی بێ ئابرۆیی ئەهۆکارە سەرەکییەکانی بڵاوبوونەوەی جۆرەکانی تاوان و نەهامەتی یەکانی کۆمەڵگایە لەوانە:

لەیەکێك لەلێکۆڵینەوەکانی وەزارەتی داد دا کەلەساڵی ۱۹۷۹ ئەنجامی دابوو لە ( فینکس اریزۆنا) بینرا لەو گەڕەکانەی کە کۆگاکانی بەزرگانی و ئاڵوگۆڕ بەهۆکارەکانی بێ نابرۆییەوە دەکەن تاوانی شت و مەك لە ٤٠٪ زیادی کردوە وەتاوانی دەست درێژی لە٥٠٠٪ زیادی کردوە ئەگەر بەراوردی بکەین بەگەڕەك و ناوچەکانی تر.

وەبەهەمان شێوە لێکۆڵینەوەیەکی تر لە (تکساس) کرا بینرا کە تاوانی جنسی لەو گەڕەکەدا زیادی کردووە لە ١٧٧٪ دوە بۆ ٤٨٢٪ بەبەراورد لەگەڵ گەڕەکەکانی تردا.

زانایان وا دەبینن هەموو ئەوانە تایبەت مەندیەکی دیاریکراویان هەیە لەکوشتنی بەکۆمەڵدا، بەزۆری ئەوانە کە یەکەمجار دەست دەبەن بۆ تاوان هۆکارەکەی جنسی یە پاشان تەشەنەدەکات بۆ تاوانەکانی تر. لەدوایدا لە ئالودەیی سێکسیەوە دەچێت بۆ ئازاردان و کوشتن و داوێن پیسی لەگەڵ لاشە مردوەکانداو وەجۆرەها تاوانی ترسناکی تر . یان ئەوانەی کە ڕەواج بەهۆکارەکانی بەد ڕەوشتی دەدەن زۆربەیان پەیوەندیان بەوتاوانانەوە هەیە کە بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو ئەنجام دەدرێ ، هەروەها بانگی بڵاوکردنەوەی تاوانی تر دەدەن.دەزگای (yobyalp )لەساڵی ١٩٦٦ بانگی ئەوەدەکات کە ماددە بێهۆشکەرەکان ڕێگەی پێبدرێت و بڵاوببێتەوە . ئەم دەزگایە ساڵانە چەندین بابەت و نووسین دەردەکات و بانگەشەی ئەوە دەکات پاڵپشتی بکەن بۆ ئەو داوایە کە ڕێگەدانە بەبڵاوکردنەوەی ماددە بێهۆشکەرەکان و لەساڵی (١٩٧١) دوە ساڵانە بڕی (١٠٠) هەزار دۆلار زیاتر دەبەخشێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی قەدەغەکردنی ماددە سڕکەرەکان .

ئالودەبوون بەهۆکارەکانی داوێن پیسی یەوە وەك لەپێشەوە باسمان کرد خێزان ڕادەکێشێتە نێو چەندین کێشەی هاوسەریەوە. هاوێنەی لاوازی سێکسی پیاو لەگەڵ هاوسەرەکەی و بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی(زینا) و چەندین دەرئەنجامی زۆر خراپی کۆمەڵایەتی و خێزانی تر.

سەرژمێریەکان دەری دەخەن کە ٣٣٪ لەقوربانیانی ئەو دەست درێژی یانە بیر لەوە دەکەنەوە کە خۆیان بکوژن یان بکوژرێن. وەلەهەمان کاتتدا ڕێژەی لە ١٢٪ ئافرەتانی ئەمریکی ڕووبەڕووی یەکێك لەجۆرەکانی دەست درێژی جنسی دەبنەوە لەژیاندا . لە ٨٠٪ لەقوربانیانی دەست درێژی جنسی لەکوڕان ئالودە دەبن بەکێك لە ماددە بێهۆشکەرەکان و ٥٠٪ ئەوانە بیر لە خۆشتن

دەکەنەودو لە٢٣٪ لەوانە خۆیان دەکوژن و ٧٠٪ بەنەخۆشی نەفسی و گرێی دەروونی دەمێنێتەوە.
ئەوانەی کە ڕاهاتوون لەسەر هۆکارەکانی بەد ڕەوشتی وەکو ئالودەبوونی مادده سڕکەرەکانی لێ دێ . پاش ماوەیەك هەست دەکەن نـاتوانن بەرامبـەر ئـەو بەلایـە بگرن و ئامـادەیی یـان هەیـە مـاڵ و سـامانیان لــە پێنــاو تــێرکردنی ئارەزووەکانیــان دا بەهــەدەر بــدەن. مــەودای زەرەروو زیانــە کۆمەلایەتیـەکانی نـازانرێ چونکـە زۆربـەی قوربانیـەکان تاوەنکـار دەناسـن ، زۆرجـار یـەکێك دەردەچێت کەکەسی خێزانەکەیە یان نزیکیانە یان (هاوڕێی خێزانەکەیانە). ئـەم تـاوان و دەست درێژیانـە زۆر جـار بـەردەوام دەبێـت و چـەند سـالانێك دەخایـەنێت کـە نێوەندەگـەی ٧،٦ سـاڵە لەلای کچان و یەکەم دەست درێژی لێ کردنەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی ٦ سالان.
ئـەوەی شـایەنی ئامــاژە پێدانــە ئــەم توێژینەوانــە لەلایــەن ڕۆژئاواییەکانــەوە ئــەنجام دراوە وەدەرکەوتووە ، هەربۆنموونە زیادبوونی ڕێژەی زینا لای ئەوان بـەتاوان دانـانرێ ، جا ئەگـەر لـەو ئامارانەدا پێوەری ئیسلام بەکار بهێنرایە ئەوا بارەکە بەچی دەگەیشت ؟! ئاکارو مەبدەئو ڕەوشـتی ئیسلامی زۆر جوان و گەورەو بەنرخ ترە لەئاکارو ڕەوشتی ئەوان.
وەپێغەمبەر دووردی خوای لەسەربێ ڕاستی فەرمووە کاتێ کەدەڵێ (هەر گەل ونەتەوەیەك خراپەکاری تیا دەرکەوێ ، تاڕادەی ئاشکراکردن ، ئەوا تاعون و نەخۆشی وایان تیادا بلاو دەبێتەوە کە پێشینەکانی خۆیان نەیان بینیبێ) (ابن ماجە ڕیوایەتی کردووە ، فەرموودەیەکی صحیحە)
دکتۆر(دایفدویت)هەســتا بەلێکۆڵینەوەیــەك لــەزانکۆی (اکـرون اوهـایو)بەدیراسـەکردنی بلاوبوونــەوەی بەدڕەوشتی وبەڕەلایی لەنێو لاوانی کوڕو کچان دا کەتەمەنیان لەنێوان (١٦-٢٠) سالان دابوو لەشەش دەیـەی کۆتاییدا ، هەستیان بەزیادبوونی سەرنج ڕاکیش کرد لەو دیاردەیەدا **هەروەك لەم خشتەیەدا ڕوونکراوەتەوە:**

| ساڵ | کوڕان | کچان |
|---|---|---|
| ١٩٤٠ | ٥٤٠٪ | ٥٢٠٪ |
| ١٩٥٠ | ٥٤٢٪ | ٥٢١٪ |
| ١٩٦٠ | ٥٦٠٪ | ٥٢٥٪ |
| ١٩٧٠ | ٥٦٠٪ | ٥٤٠٪ |
| ١٩٨٠ | ٥٧٧٪ | ٥٦٤٪ |
| ١٩٩٠ | ٥٨٥٪ | ٥٧٠٪ |

هەروەکو هەستان بەدابەش کردنی هەندێ ڕاپرسی وتێ بینی کردنی هەندێ لەو ڕاستی یانەی کەپەیوندی یان بە هاوسەرانەوە هەیە کەزینادەکەن لەئەمریکا.

بینی کەلە ٥٠٪ لەپیاوان ولە ٢٥٪ لەژنان دانیان بەوە داناوە کەمومارەسەی زیناگردن دەکەن لەپاش هاوسەرگیریش. خوێنینەوەمان بۆ فەرموودەکەی پێشوو وپێشبینی بڵاوبوونەوەی تاعون ونەخۆشی تازە دەکرێت کەلەناویان دا.

بەکرداریش ئەوانە تووشی جۆرەها نەخۆشی بوون لەم سلأنەی دواییدا وەك (زهری و هربس ( قوباو ) و سیلان و حرشیفە . ئایدز و جۆرەکانی تر)

بۆ نموونە بلأو بوونەوەی نەخۆشی (زهری) کە دەبێتە هۆی نەزۆکی و نەخۆشی دەماغ . لەئەمریکا لەماوەی ١٩٢٠ وە ئەم نەخۆشیە هۆکاری بلأو بوونەوەکەی تەنها بەد ڕەوشتی بووە . پێشتریش لەسەدەی پانزەدا لەرێی هەمان هۆوە بلأو بۆیەوە .

وەلەسالّی ١٩٨١ ووتەبێژی ناوەندی قەلأچۆکۆدنی نەخۆشی لەئەمریکا لەلێدوانێکیدا ڕایگەیاندکەنزیکەی ٢٢٥٠٠٠ نەخۆشی تووش بوو بە نەخۆشی (زهری) لەئەمریکا هەیە. وەسالأنە (٢.٥) ملیون حالّەتی تازە لە نێو گەنجانی قۆناغی ئامادەیی تووش بوو بەنەخۆشی جنسی جۆراوجۆر تۆمار دەکرێت وەکو (زهری . سیلان . حرشفیە . نەخۆشی هەوکردنی جگەر) بەلأم نەخۆشی ئەم سەردەمە بێ گومان ئایدزە . وە زۆربەی لێکۆڵەران ڕایانگەیاندووە کە ٨٠٪ بەنەخۆشی ئایدز دە سەرچاوەکەی بەد ڕەوشتیە بەلأم ئەمرۆ مەڵبەندی قەلأچۆکردنی نەخۆشی لەئەمریکا مەزەندەی ژمارەی تووش بوانی بەنەخۆشی ڤایرۆسی ئایدز(VIH) بە (٦٥٠٠٠٠) بۆ (٩٠٠٠٠٠) دەکەن وەنزیکەی (٢٠٠٠٠٠) کەسیان نازانن کە هەلگری ڤایرۆسەکەن . وەتا بەرواری ١٩٩٩/١٢/٣١ لەو مەڵبەنددا (٤٣٠٤٤١) حالّەتی مردن بەو نەخۆشیە دەست نیشان کرا. وە نەخۆشی ئایدز لەئەمریکادا بەپلەی پێنجەم دێ لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی مردن بۆئەوانەی لەنێوان ٢٥ بۆ ٤٤ سالّ دان. ئەم ڕێژەیە زۆر لەو مردوانە زیاترە کە ئەمریکا لەشەڕی ڤێتنام و کۆریا بەکوشتی دان. بەلأم لە (نیۆرك ) و ( لوس انجلوس ) و (سانفرانسسکۆ) نەخۆشی ئایدز سەرەکیە کە دەبێتە هۆی مردن لەنێوان کچ و کوڕی لاودا .

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ژمارەی تووشبوانی ئایدز لەجیهاندا بە ١٣ ملیۆن دادەنێن کە (٦١١٥٨٩) حالّەتیان بەرەو نەخۆشی ئایدز چووە . وەئاشکرایە کە ڤایرۆسی ئایدز بە خێراترین ڤایرۆس ناسراوە لەسەر زەوی دا، کە دەتوانێت خۆی بۆ چەند شێوەیەکی جۆراو جۆر بگۆڕێت .

هەروەکو زانراوە ئەم نەخۆشیە بۆ یەکەم جار لە ڕۆژئاوا دا سەری هەڵدا لە نێو خەڵکەشازەکانی شارەکانی سانفرانسکۆ- نیۆرك)پاشان لەڕێی زیناکەرەکانەوە گواسترایەوە.

وەلەسەرەتاوە ئەم نەخۆشی بە(دابەزینی بەرگری لای شازەکان )ناسرابوو وەپەیمانگای نیشتیمانی بۆ لێکۆڵینەوەی حەساسیەت و نەخۆشیە گواستراوەکان لەئەمریکا ، تێ بینی ئەوەی کرد کەشەش مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٩٦ نەخۆشی ئایدز لەبلاوبوونەوەدایە لەنێو گەنجانی تەمەن ١٣-١٩ ساڵ و رێژەکەی گەیشتە ٥٢٤٪ وەبەشی هەرەزۆریان لەکەسە شازەکان بووە پاشان زیناکەران، لەساڵی ١٩٨٠ خەڵکەنامۆ و شازەکان هەستان بە هەڵمەتێکی گەورەی پروپاگەندە بۆ هۆشیارکرد نەوەی کۆمەڵگا بۆگەنە تووشبووەکەیان لە مەترسی ئەم نەخۆشیە و دەرئەنجامەکەی دابەزینی رێژەی تووشبووان بوو.بەلام لەئەنجامی مردنی زۆری نەوەی یەکەمی شازەکان و دابەزینی رێژەی تووشبوان بەو نەخۆشیە لەو ماوەیەدا هەرزەکاران دووبارە دەستیان کردەوە بەهاندانی ئەو کارە خراپ و پیسە دا. وەخوای گەورە راستی فەرمووە (فَلَوْلا إِذْ جَاءهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَـكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ) واتە: ئەوانەی کاتێك تۆڵە و سزای ئێمەیان بۆهات بۆ نزاو پارانەوەی بەکوڵیان نەکرد . بەلام دڵیان رەق و رەش بوو شەیتانیش ئەو کارو کردەوە ناپەسەندانەی بۆ رازاندبوونەوە کە دەیانکرد. سورە أنعام ٤٣

وەئەم نەخۆشی یانە بۆ ماوەو شوێنەواری کۆمەلایەتی و ئابووری و رامیاری لەدوای خۆیان بەجێ دێڵن . بۆنموونە تێچوونی چارەسەرێکی کە سێکی تووشبوو بەو نەخۆشی ئایدز (نەمانی بەرگری) تا دەمرێت (١٢٠) هەزار دۆلارە وە ئەم نەخۆشی یە کێشەی خێزانی و کۆمەلایەتی دروست دەکات وەکو هەژاری و بەرزبوونەوەی بێ کاری وچەندان شوێنەواری خراپی تر . ئیتر واز بێنە لەو مەترسیە گەورانەی رووبەرووی پزیشك و پەرستیارەکان دەبێتەوە .

## هاوردەکردنی بەدرەوشتی بەبیانووی ئازادیەوە

خوای گەورە دەفەرمووێ :

(إن الذين يحبّون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب أليم في الدّنيا والآخرة والله يعلم وأنتم لا تعلمون) .سورة النور١٩

واتە: بەراستی ئەوانەی حەز دەکەن زیناو تاوان لەناو ئەوانەی باوەریان هێناوە بلاوبێتەوە ، سزای پر ئێش و ئازار لە دونیاو دوارۆژیش بۆیان ئامادەیەو خوا خۆی چاك دەزانێت.(سەرئەنجامی زیناو شەروال پیسی بەرەو کوێ دەچێت ) ئێوە نایزانن.

بەلام لەم رۆژگارەی ئێستاماندا خەڵکانی رۆژئاوا بە بەها خراپ و وە بەنەخۆشیە پیس و بیرو باوەرە نەگریسەکانیانەوە نەوەستاون و لەبلاو کردنەوەی خراپە کاری و کارە نەشیاوەکانیاندا

بەردەوامن و توڕەیی خوایان بەدەست هیناوە لەهەولی هەناردەکردنی ئەو نەخۆشیانەن بۆ ولاتانی ئیسلامی . دەبینین کۆمەلەی ( چاودیری مافەکانی مرۆڤ) زۆر بەتووندی ئیدانەو رەخنە دەگریت لەهەر هەولیك کە وولاتانی کەنداو بیکەن بۆ ریگە گرتن لە پیگە خراپەکانی ئینتەرنیت و ، بانگمان دەکەن بۆ کرانەوەو ئازادی.

## ئابرۆ چوونەکانی تیکەلی و بەناو ئازادی

### ( مالی رۆژئاوایی لەناوەوەدا )

نزیکەی نیوەی دەست دریژی لیکراوانی بەریتانیا کە دەست دریژیان کراوەتە سەر سەرەتا لەناو مالەوە دەستی پیکردووە لەلایەن باوکەوە یا لەلایەن هاوری ی دایکەوە ، تەنانەت لە یەکی لەگۆڤارەکان دا بلاوکردەوەو دەلیت : مەترسی دارترین شوین کە مرۆڤی ئەوروپی تیایدا بژی ناو مالەکانیانە .گۆڤاری تایم باس لەوە دەکات نیوەی سکالاکەرە ئافرەتەکان لە مالە ئەمریکیەکاندا ئەتك دەکرین .

لەنیوان لە (٥٠٪ ٧٠٪) لەپیاوانی ئەمریکا خیانەت لە هاوسەرەکانیان دەکەن و (٣٢٪) ی ژنانیش خیانەت لەپیاوەکانیان دەکەن .وەلە ٩٠٪ ی ئەو ئافرەتانەی کە شوویان کردووە کچینیان نەماوە وەریژەی کچینی لەبەریتانیا لەنیوکچان دا گەیشتووەتە لە سەدا سفر (٠٪). هەروەکو گۆرینەوەی هاوسەریش زۆر باوە، وە نزیکەی (٢،٥) دووملیۆن و نیو لەپیاوانی ئامریکا ژنەکانیان دەگۆرنەوە بەشیوەیەکی نەخشە بۆکیشراو یابەچاوی بازرگانەکانەوە ، وەریژەی (٥٠٪) لەمنالانی کچ و کور پیش ئەوەی تەمەنیان بگاتە (١٥) سالی مومارەسەی جنسی دەکەن . وەزۆربەی تەلاق لەرۆژئاوا هەروەکو (دول ستریت جورتال) نوسیویەتی لەنیو هەردوو ئەمریکی یەکدا یەکیکیان تەلاق دەدریت . وەراپۆرتیك کە وەزارەتی تەندروستی ئەمریکی بلاوی کردەوە لەسالانی ١٩٨٥ -١٩٩٤ تیایدا هاتووە دەلیت :

ژمارەی ئەو ئافرەت و کچانەی کە بوونەتە قووربانی توندو تیژی لەسالی ١٩٩٤ زیاد لە (٥ملیۆن)ە. وە دەلی لەنیو هەر ٨ ئافرەتیك کە تەمەنی بالغ بوونی تی پەراندووە لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لانی کەم یەك جار لەژیانی دا رووبەرووی دەست دریژی دەبیتەوە. ئەمەش یەکسانە بەیەك ملیۆن ئافرەتی ئەمریکی کە دەست دریژی بکریتە سەر . ئەم بارو دۆخەش لەئەمریکا لەژیر سیبەری ئاشتی و ئازادیدا دەکریت .

(ئافرەتان )لە سالی ٢٠٠٠ ناونیشانی کۆنگرەیەکی نیشتمانی بوو لەپاریس کە تیایدا هاتووە کە لە ٧٠٪ کچانی لاوی فەرەنسا بەتەنها دەژین ، وەژن هینان و زەواجی شەرعی رووی لە دابەزین کردووە بەئەندازەی (٦٨٠٠٠) ئافرەت وە لە ٢٠٪ لەدایك بووان لەریگەی زیناوەیە. پەنا دەگرین بەخوا .

وە لەئەمریکا بەتەنها سالانە ملیۆن و نیویك کۆرپەلە لەریگەی لەباربردنەوە دەکوژریت .کوا مافەکانی مرۆڤ؟!

(أندروشاییر) دەلیت نزیکەی (١٠) هەزار کچی ئەمریکی منالی بی شەرعی یان دەبیت کە تەمەنیان نەگەیشتوەتە ١٤ سال . ئەمە لەگەل بوونی هۆکارەکانی ریگەگرتن لە سکپری (حەمل) ..!!

ئەی ئەوانەی بانگەشەی ئازادی و پیشکەوتن دەکەن ، ئایا کۆمەلگەیەکی لەم شیوەیەتان دەویت ؟!

# قوربانیانی ئەتکردن( اغتصاب )

ئامارەکان ئاماژە بـەوە دەکـەن کـە قوربانیـانی ئـەتکردن (اغتصـاب) بـاس لەئەزموونـەکانی خۆیـان دەکەن..زۆریك لەئافرەتان دەستیان کردووە بەگەیاندنی ئەو باری داگیرکەرییـە سیکسیەی تووشی هاتوون ئەوان دلنیان کە لایەنە پەیوەندی دارەکان. گرفتـەکانیان بەشـیوەیەکی جدی وەردەگـرن وکار لەسەر دەکەن ئەمانە کۆمەلە هەوالیکی باشن یاخوود دروستن کە بەرگری کەرانی قوربانیانی (اغتصاب) لیی ئەکۆلنەوە بەپشت بەستن بەئامارەکانی حکومەت لەسالی (٢٠٠٢م)ی دا.

﴿ویمنزئی نیوز﴾ دەلیت :نوسینگەی لیکۆلینـەوەی فیدرالـی ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە تیکـرای ئەتکردنەکان زیاد یان کردووە بە ریژەی (٤ ٪)کە ئەمەش بیدەچیت هەوالیکی باش بیت. وەبەپیی لیکۆلینەوەیـەکی نـوی کەنوسـینگەی ئامارەکـانی سـەربەوەزارەتی داد ئـەنجامی داوە ئـەوە دەردەخات،کە ئافرەتان بەریژەیەکی پیوانەیی هەوال دەدەن و لەو داگیرکارییەسیکسیانەی تووشـی دەبن.

وەهەروەها خەمخورانی زەوت کردن دەلین ئەم زیاد هەول دانە _ نەك زیادبوونی پرۆسەی ئەتك کـردن لـەخودی خۆیـدا ئەمەیـە کـە ژمارەکـانی نوسـینگەی لیکولینـەوەی فیدرالـی (أف بـی أی) بەرزکردۆتەوە لەگەل ئەوەی نوسینگەکە تەنـها ئـەو تاوانانـە تۆماردەکات کـە بەشـیوەیەکی راسـت ودروسـت بەدەسـتیان دەگـات. ئەمـە ئـەوە دەردەخـات کـە لایەنـە پـەیوەندی دارەکـان کیشـە وگرفتەکانیان بە باشی و لەجیگای خۆی وەردەگرن وەهەروەها قسەکەر (جیمـی زویبـاك) بـەناوی تۆری نیشتیمانی بۆ زەوتکردن ودەست دریژیە جنسی یەکان و خوین رشتنی نزیکان .لەوا شنتۆنی پایتەخت ، لەپەیوەندیەکی تەلەفۆنیدا ووتی (خەلکی دەلخۆشن بەوەی کە کیشە کانیان بە جدی و بەر پرسیاری یەتی یەوە وەردەگیرین).

زیاتر لەنیوەی قوربانیـانی دەسـت دریژیـە جنسـی یـەکان بـۆ جـاری یەکـەم دەسـتی پیکـرد کـاتیك نوسینگەی ئامارەکان هەستا بەکۆکردنەوەی زانیاری یەکان پیش (٣٠) سال .بەلام ئەم ئامارە پەرەی سەندوە تا لەسالی (١٩٩٩م ) .وە لەسالی (١٩٩٣)ەوە تـا سـالی ١٩٩٥ پـی راگەیاندنـەکان گەشـتە (٨،٣٠ ٪)ئـەوە بـەپیی لیکۆلینەوەیـەکی نیشـتمانی بـۆ قوربانیـانی ئـەم جـۆرە تاوانانـە کەسالانە ئـەنجام دەدریت .کەدەرچووە لەو نوسینگەیەوە، لە (٢٤)ی اغسگس .بەلام سالا پیشوتر زیادیکرد بـۆ (٥٣٪ ) سکوت((بیرکوو یتز)) سەرۆك ودامەزرینـەری تـۆری نیشـتیمانی (زەوتکـردن ودەسـت دریـژی یـە جنسی یەکان و کوشتنی نزیکان .کە گەورەترین ریکخراوی بەرهەلستکاری دەست دریژی یەجنسـی یەکانە لەو ولاتەدا .دەلیت:زۆری گەیاندنی هەوالی دەست دریژی یەکان دەرهاویشتەی ئەوسیاساتە توندانەن کە پەیوەندیان بەتاوانەکانەوە هەیە .هەرودها هۆشیاری خەلکی زیـاتر بـووە ، نەودیـەك لە ئافرەتان پەیدابووە لەسەر دەربرینی نەخیر ، دەزانی نەخیر چی دەگەیەنی.

لەڕاستیدا ڕێژەی ساڵانەی پەیوەندییە مانگانەکان بەهێڵی ڕاستەو خۆی تۆڕی نیشتیمانی داگیرکردن و دەست درێژی یە جنسی یەکان وکوشتنی نزیکان ، تاوە کو ئیستا بەرێژەی لە(٢٧٪) بەرزبووەتەوە لەساڵی (٢٠٠٢)دا ئەمە ئاماژەیە بەگەیاندنی تاوانەکان لەلایەن ئەو ئافرەتانەی وەکو دەست درێژییان کراوەتە سەر .

## (چەند گومانێك لەئامارەکان)

ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەی ساڵانەی قوربانیان وا ئەخوازێت بەشێوەیەکی نا ئاسایی سەرنج بدەین لەو ژمارانەی نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ،وزۆری پەیوەندی یەکان لەسەرهێڵە ڕاستەوخۆکان .بەلاّم شارەزایانی ئەم بوارە ئاگاداری دەدەن لە ژمارەکانی ئەم ساڵە چونکە زۆر نائاسایین.

((ئایا جێی باوەڕە بەرزبوونەوەیەکی بێ سنور لەم ساڵدا ونزم بوو نەوەیەکی نائاسایی لەمناڵی داهاتوودا ؟بە دڵنیایەوە نەخێر))

ئەمەی باسمان کرد ئەوەیەکە((باتسی کلۆس)) جەختی لە سەردەکاتەوە کەیەکێکە لەگەورە شارەزایانی ئامارەکان کەسەر بەلقی ئامارەکانی وەزارەتی (داد) ە ، لەپەیوەندی یەکی تەلەفۆنی تازەدا دەڵێت ئەگەر تۆ لاربونەوەی ڕێژەکەدای ، ئەوابەکورتی، ئەوا قسە لەسەر جوزئیاتی مەکە ئەگەر تۆ بەهەمان ڕێچکە دا نەڕۆشتووی بۆماوەیەکی زۆر) .

بۆیە ئەم دڵنیا نەبوونەلەڕاستێتی ئاماری دەست درێژی یەکان کێشەی دروست کردووە بۆ ئەوانەی کەئەیانەوەی بەشێوەیەکی دیاریکراو ژمارەی ئەو تاوانانە بزانن،بەلاّم بەشێوەیەکی ڕاست ودروست هەواڵەکان ناگەن.

هەروەها (شارەزایانی لێکۆڵینەوەی نیشتیمانی قوربانیان ) چەند دیمانەیەکیان ئەنجام داوە لەگەڵ ئەوانەی کە نوێنەرایەتی خەڵك دەکەن دەربارەی ئەوکێشانەی تووشیان دەبینین کە ساڵانە دەگەنە چەند کەس؟ پاشان ئەم ژمارانەی دابەش دەکرێن بەشێوەیەکی گشتی بەسەر دانیشتواندا .لەساڵی (١٩٩٣م) تاساڵی (١٩٩٩م) ڕێژەی سەدی دەست درێژیەکان لە(٣٠٪)دا ڕادەوستێت پاشان بەرزبووەوە بۆ (٤٥٪)لەساڵی (٢٠٠٠م)پاشان دابەزی بۆ (٤٠٪) لەساڵی (٢٠٠١م).

هەروەها ڕێژەی چەند تاوانێکی خراپتر لەم حاڵەتانە لەساڵی (١٩٩٣م)بەرزبوویەوە،بۆ نموونە لەساڵی (٢٠٠٢م) هەواڵەکان ڕایان گەیاند کەڕێژەی دزی لە(٧١٪) بەرز بووەتەوە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (١٩٩٣م) کەلەصەدا (٦٠٪)بووە.

بەشێوەیەکی گشتی گەیاندنی هەموو جۆرە تاوانەکان بەرێژەی لە(٦٪)بەرز بووە کەلەساڵی (١٩٩٣م) لە(٤٣٪) بۆ (٤٩٪).

بەشێوەیەك كە زۆر بوونی ڕێژەی هەواڵ دان لەئەتككردن بەرز تر بوودتەوە بەرووی گشتی تاوانەكاندا .

لەساڵی(١٩٩٣م) تا ساڵی (٢٠٠٢م) بۆ نموونە ڕێژەی هەواڵ دان لە ( اغتصاب) گەیشتودتە (٢٠٪) زیاترە لەڕێژەی دزی كە لە(٨٪) كە ئەوەبەرزترین ڕێژە لە جۆری خۆی كە( لێكۆڵینەوەی نیشتیمانی قوربانیانی تاوانەكان) لەساڵی (١٩٧٢) دەستی پێكردووە كەساڵانە (١٥) ملێون دۆلاری تێچووە .وەهەروەها دیمانە كراوە لەگەڵ (٦٠،٠٠٠ ،٧٠،٠٠٠)خێزان كەهەموو شەش مانگ جارێك ،لەو ئەندامانەیان كە تەمەنیان (١٢) ساڵی تێپەڕاندووە پرسیار كراوە لەجۆری تاوانەكان وموڵك و سامانەكانیشیان دەگرێتەوە وە ئەم خێزانانە بۆماوەی سێ ساڵ لە ژێر لێكۆڵینەوە دەمێننەوە .

وەهەروەها لەنێوان ساڵی (١٩٩٣م) و ساڵی ڕابردووی ژمارەی دەستدرێژی بە ڕێژەی لە (٥٥،٦٪) كەم بووەوە . وەهەروەها ئاماركراوە كە (٧٣٠) اغتصاب و (٢٤٧) دەست درێژی جنسی ڕوویداوە لەهەموو دوو خولەك دا دەكاتە یەك دەست درێژی كە ڕوویداوە لە ساڵی (٢٠٠٢م) و ئەم ڕێژەیە زیاترە لە (٨٧٪) ی بەرانبەر ئافرەتان كراوە.

سەرەڕای ئامازە بەڕاپۆرتی ساڵانەی تاوانەكان كە نوسینگەی لێكۆڵینەوەی فیدراڵی ئەنجامی داوە ،دەتوانین بڵێن لێكۆڵینەوەی قوربانیانی (اغتصاب) ئامازەیەكی بایەخدارن بۆدیاری كردنی ئاراستەی تاوانەكان . وە ڕاپۆرتەكە بە شداری دەكات لەڕاستكردنەوەی ستراتیژی یەتی جێ بەجێ كردنی یاساكان و سیاسەتە گشتی یەكانە ، كەدیاریدەكات كە باجەكان لەكوێ خەرج دەكرێت ، سەرف ئەكرێت لە خزمەت گوزاری قوربانیان و پاراستنیان لەرووی ئاسایش و سیستەمەوە. وەلە پەیوەندی یەكی تەلەفۆنیدا كە ئەنجام دراوە لەگەڵ (بنیامین إی سوندرز) لە ناوەندی نیشتمانی بۆ چارەسەر كردن و ئەنجامدانی لێكۆڵینەوە لەبارەی قوربانیانی (اغتصاب) و تاوانەجۆراو جۆرەكانەوە لە( تنشارلستون) لە ویلایەتی (ساوپ كارولینا) كەبەرنامەی منداڵ و خێزان دەباتەڕێوە، بەهاوارێكەوە و دەڵێت((لەگەڵ ئەوەی ئێمە خاوەن بۆچوونێكی تایبەتین سەبارەت بە دیاریكردنی ئەو هۆكارانەی كە ئافرەتان والێدەكەن ئەم جۆرە هەواڵ نەبگەیەنن ،بەلأم هێشتا زۆرمان لە پێشە تا فێریان بكەین چۆن بەزووترین كات ئەم هەواڵانە بگەیەنن ،بۆیەگرنگ ئەوەیە ئێمە بەردەوام بین لەسەر تێگەیاندنی ئەو هۆكارانەی وا لەئافرەتان دەكەن لەم ڕووەوە بچنە پێشەوە وسود لەو خزمەتانەیان وەربگرین كە ڕای دەگەیەنن .

## ئاماری تەواو لەبارەی منداڵانەوە نی یە

لێکۆڵینەوە چەند عەیبێکی تێدایە وا دەکات دۆزینەوەی دەستدرێژییەکان قورس بێت و ئەوانەش دەگرێتەوە کە تەمەنیان لەسەرووی (١٢) ساڵییەوە.

ڕینماییەکانی حکومەت ئاماژە بەوەدەکەن کەمناڵانیخوار تەمەنی (١٢)ساڵ زۆر ترینی قوربانیانی ئەم دەست درێژی یەن کە لە(٣٠٪) زیاتری لە خۆدەگرێ وەهەروەها ئەوەی کۆسپە لەبەردەم پەردە هەڵماڵین لەسەر ئەم تاوانانە ئەویە کەئەندامانی ئەو خێزانەیان خزمانی کەسی دەست درێژی لێکراون بۆیە هەواڵەکان ناگەیەنن (سوندرز)دەڵێت ((بەڕاشکاوی پێتان دەڵێم کەبەڕاستی باسکردن و پەردە هەڵماڵین لەسەر هەموو یان زۆربەی ئەم جۆرە دەست درێژییانە باش نین یاخود بەقازانج ناشکێتەوە))وە هەروەها ڕاڕایی خۆی باس دەکات بەرامبەربەرزبوونەوەی ڕێژەی ئەم دەست درێژییانە.

((بڕوام نی یە کە ڕێژەکە بگات بە(٥٠٪) بەڵکو ئەو پێی وایە کەتەنها کەشبینێتە(٢٥٪).

لەگەڵ ئەمشدا پێی وایە کەدابین کردنی خزمەت گوزاری بۆ قوربانیان ومەشق پێ کردنی پۆلیس لەسەر ڕێگرتن لەم دەست درێژییانە و هاوشێوەکانی .یەکێکن لەو هۆکارانەی کەوایان کردووە ئافرەتان بێ لێپێچانەوە ئەم ڕووداوانە بگەیەنن گەر پێش (٣٠) ساڵ ڕوویدابێ.بەڕاستی ئاستی زانستی وئاڵاوی ڕۆشنبیرکردن لەزانکۆکان .زیاتر لەمەش حاڵەتە بەناوبانگەکان وەکو (اغتصاب) کردن لە (ئەکادیمی جەکی ئاسمانی ) وە هەروەها ئابڕوو چوون ودەست درێژی یە سێکسیانەی لەنێوان پیاوانی ئاینی و ڕفاندنی کچانی گەنج ی بەناوبانگ.زانیاری باشی بەخشیوە بەڕای گشتی دەربارەی (اغتصاب) و دەست درێژی یە جنسی یەکان بە شێوەیەك کەنموونەی نی یە لەڕابوردوودا.

وەهەروەها (زویباك) لە تۆڕی نیشتیمانی (اغتصاب) ودەست درێژی یە جنسەیەکانەوە دەڵێت ((ئەوە جەخت ئەکا وئەی سەلمێنی کە (اغتصاب) تاوانێکی کوشندە وترسناکە وسەرزەنشت تەنها بەشی قوربانیەکەیە))

﴿ئەجلین لودر))نوسەرێکی سەربەخۆیە.لەشاری نیۆرك دادەنیشێ﴾.

## ( وەك ئەوەی شۆڕە سوار بێ )

زدنگ لێیدا..ئەلو....ئەلو....

ئاگاداربە ئەی ئەو کەسەی فرمێسکەکان نزیکە لەلە چاودکانتەوە ڕۆندك بکات.

ئاگادار بە تۆ هەرزان نیت ئەی گەوهەری نێو گەوهەردکان..

ئای خوای گەورد ئازاری داوم ودئازاری هەموو خاودن هۆشێکی داوە حالی ئەو کچە گەنجەی کە لەگەڵ ئەو بەناو شۆڕدسواردا ژیاود.

ئەئەو بەناو شۆڕدسواردی ئەمی بەبریندای فرێ دایە نێو ئەشکەنجە و ئازاردود . وای لێ کرد لە خەونی خۆیدا ئەملاو لابکات بەڕاستی ڕێگاو ددوری عاشقانی بەجوانی تێگەیشتبوو ،لەقسەکردندا لەگەڵی زۆر ڕوون بوود ،بەووشەی جوان و زدردو سوور بەندی کردبوو ،بەووتەی ناسك بەستبوویەود، بەستایشی شیرین دایپۆشیبوو . ود لە نێوان دڕکەکاندا گوڵی جوانی پێشکەش ئەکرد. ئەم کچە پاکە دڵ سافە بەهیواکانی تەلاری جوانی دروست کردبوو بەخەوانەکانی ماڵی جوانی ڕێك ددخست . بورجی لەجیهانی خۆیدا بۆ بەرز ددکرددود لەگەڵ شۆڕدسواردکەیداململانێ ی شەپۆلەکانی ددکرد.

حالی ئەم بریندارد چەند مانگێك درێژدی خایەند . بنیاد نرابوون لە سەرلم. لەو دیوی سێبەری تراویلکە گەرماود هەناسە برکێی بوو. هەست و سۆزی خۆی بۆ خەرج کرد . بتا توانی لێ ی پاڕایەود و هانای بۆی برد . شتێکی لەژیانی پێ بەخشی کە نابەخشرێ . هەموو شتێکی پێشکەش کرد.

چەندە خەیاڵی ئەکرددود کە لەودی چەند ددستە جل بکرێت ود ئەو بۆنانەی کە پێشکەش بکرێت . ودئەونامانەی کە پێی بدرێت.

چەند ... نامە بنوسێو بینێرێ

وددڵ خۆشیبکا بە چەند گوڵێك پێشکەشی بکات .

چەندین جار چووم بۆ بەڵێنێك کە بوونی نەبوو

وچەند خەونم بینی بۆ ئەو جلانەی کە بیکڕم ....

کچەکە گومانی نابرد ڕۆژێك لەڕۆژان . تەنانەت قسەیەکی زبریش بەرامبەری بەکاربێێت. ئەم کچە ڕۆشناییەك بوو کە ئەدروشایەود و خۆرێ بو بەڕوویدا هەڵددهات. ودسفی کوڕدکە سەری لێشێواندو سەرخۆشی کرد . بەچەشنێك ئەفری بەئاسماندا بەڵام! ئەودندی پێنەچوو هەموو خەونەکانی بابردی هیواو ئاواتەکانی سەربڕان خەیاڵەکانی لەت لەت بوون.

هەموو شتێك لەیەك ساتە ودخت دا کۆتایی هات .

بەڵێ .... لەیەك ساتە وەختدا کاتێك کە خۆی خستە بەردەستی . لەکاتێکی بێئاگایی و لاوازیدا .
بانگی کرد هاواری کرد : ئەی ئەو کەسەی کە خوێنم دانا لەسەر تۆ کاتێك کچێنیمت شێواند ، مێینەیەتیمت زڕاند.

لەدوای ئەوە وازت لێهێنام و سوکایەتیمت پێ کرد ، لەدوای ئەوەی کە بەرۆشنایی تۆ ئەمبینی پاشان ئەم (فارسە) گوێی لەدەنگێکی تر بوو .....

دەنگێك لەوانەی جاران شیرین تر و بەپیت تر. دەورەکان لەگەڵیدا بەسەردەبات . ڕۆژەکان ئێوارەکانیان دەگێڕنەوە تا تێردەبێت لێیان پاشان سەماعەیەکی تەلەفۆنی بەگوێدا دەکا و دووبارەی ئەم دێڕە دەکاتەوە دەڵێت:

ئەڵێیت خۆشەویستی شتێکی جوانەئایا هۆنراوەکەی (قیس)ت نەخوێندۆتەوە ئایا خوشکان شوێنێك ماوە لەگوێتان جێگەی ئەم فرۆفێلانە ی تێدا بێتەوە وەهەستان دەجولێت بەرامبەر قسەگەلێکی لەم جۆرە؟ خوشکی خۆم عاقڵ و ژیر ئەو کەسەیە پەند کە لەکەسانی تر وەربگرێت، وە سەرگەردانیش ئەو کەسەیە ئامۆژگاری لەخۆیەوە وەربگرێ، دووبارەی ئەکەمەوە و ئەڵێم جارێکیان پرسیارم لەگەنجێکی تەوبەکارکرد کە ئەم جۆرە تاوانانەی زۆر ئەنجام دابوو ووتم : ئایا ئەمە یەکەم ئافرەتە بەدەستی تۆ کچێنی لەدەست دابێت ، ووتی نەخێربەڵکو ئەمە (٢٥) هەمین کچە.

# جوانترین ئافرەت

## (گفتو گۆی کۆڕێك لەگەڵ خۆیدا)

ڕۆژێکیان .. لایەنی شەڕی نەفسی خۆم پێی ووتم ئەی گەنج تا کەی ئافرەت لەچاوەکانتا جوان دەبن؟ بەخۆمم ووت. ئەم پرسیارە نەفرەت لێکراوە بۆ؟ نەفسم ووتی: گەر ڕاستت پێ بڵێم باوەڕ دەکەی ؟ ووتم بە نەفسم: بەڵێ إنشاو الله . ووتی: مامۆستای گەورەمان ئیبلیسی نەفرەت لێکراو ڕادەوەستێ و ڕادەمێنێ لەسەر خوێندنەوە لەسەر گرنگ ترین ئەو هۆکارانەی کەوا لە ئافرەتان دەکەن جوانتر بن لەچاوی پیاواندا! پێم ووت: باشە ئەم بایەخ دانە بۆ؟! ووتی: ئەو ئەیەوێ کارێکی فراوانی مەوسوعەیی، مەنهەجی داڕێژراوی دەست بکەوێ و دابەشی بکات بەسەر شەیتانەکانی مرۆڤ و جین دا بۆ یە مامۆستای گەورەمان (ابلیس)ی نەفرەت لێکراو ئەیەوێت ئیش و کارەکانمان بەشێوازێکی کرداری وا بێت کە هیچ هەنگاوێکی بەهەڵەدا نەچێت، دەیەوێت ئەو چەکە بەهێز بکات کە دەبێتە هۆی شێواندنی ڕەوشتی ژن و پیاو . ئێستا پێم بڵێ ئەی گەنج چ کاتێك ئافرەت لەچاوەکانی تۆدا زۆر جوانن؟ پێم ووت : ئایا چ ڕێگاو شێوازێك هەیە لای تۆ وا لەپیاو بکات ئافرەتی زۆر بەلا وە جوان بێت ؟

پێی ووتم : بەڵێ : ڕێگاو شێوازی زۆر هەن بەشێوەیەك کە هەر پیاوێك شێوازێکی تایبەتی هەیە کە وای لێدەکات سەرنج لەئافرەتان بدات و بکەوێتە سەرپێچی خواوە بەشێوەیەك کە ئەقڵی کار ناکات لە بەرامبەرهێرش هێنانی ئارەزووەکانیدا ..

بەنەفسی خۆم ووت: ئەی نەفسی بەد کارم ئەڵێی چی ئەگەر هەندێ لەو ڕێگاو شێوازانەم بۆ باس بکەی بۆ ئەوەی منیش شێوازێکی گونجاوی بۆ خۆم هەڵبژێرم ؟ نەفسم ووتی: ئاساییە.. ئایا ئافرەتی ڕەش یان سپی کارت لێدەکات ؟ ووتم: نە ڕەش نە سپی هیچ کامیان!! ووتی ئافرەتانی قژ درێژ یان کورت کارت تێ دەکەن؟ ووتم : نەدرێژ نەکورت! ووتی ئایا (لاواز) یان (قەڵەو) کارت تێدەکەن؟ ووتم :هیچ کامیان ! ووتی : ئەمانە بەناوبانگ ترینیانن. ئێستاش دەچینە سەر ڕێگاو کارەکان کەئافرەتان دروستیان دەکەن لەسەر ڕێگای زۆربەی پیاوان ... ئایا ئافرەتی پرچ رووت و مل ڕووت کارت تێدەکەن ؟ ووتم : نەخێر کارم تێناکەن.. پێی ووتم : ئایا ئافرەتی پانتۆڵ تەسك یان جل کورت کارت تێدەکەن ؟ ووتم : هیچ کامیان کارم تێناکەن.. پێی ووتم : ئایا ئەوانەی باڵ و قاچیان دەردەکەوێت ؟ ووتم : نا...نا... ووتی :ئەی ئەوانەی لەڕۆیشتنا لەنج ولار ئەکەن و بەپێیەکانیان لەزەوی دەدەن دەنگی پێیان دێ ؟ ووتم : نەخێر ئەمانە کارم تێناکەن. پێی ووتم: ئەی گەنج ! شتێك لەمانەی پێشوو کاری تێت

نەکرد کە باسم کرد!! هیچم لانەماوە کە باسی بکەم !! پێم ووت : ئەمە گونجاوە !!! بیر بکەرەوە!!! شێوازی ترم یاد بخەرەوە لەبارەی ئافرەتانەوە !! بێدەنگ بوو پاشان پێکەنی و زەردەخەنەیەکی کرد .. پێی ووتم ئەی بەد بەخت !! پێم ووت: ئەوە چیە شتی ترت کەوتەوە بیر ؟ پێی ووتم : ئایا ئافرەتی بێ جل و بەرگ کارت تێدەکات کەهەمووو لاش و لاری دەربخات ؟! ووتم : نا...نا... نەخێر کاریان نەکردوەتەسەرم نەفسم. پێ کەنی ، پێکەنینێکی پیس و پێی ووتم: ئەی هیچ و پوچ !! ووتم : بۆ؟ ووتی : کەواتە ئافرەتێك کارت تێدەکات دەرگاکە دابخات و بڵێ فەرموو ؟! پێم ووت: خوا ناشرینت کات ئەی نەفسی بەد کار ... چەند ئاکارو ڕەوشتت پیسە! ووتی : وەڵاهی هیچ شێوازو ڕێگایەك نەماوە ئیلا بۆم باس کردی !! پێم بڵێ سوێندت دەدەم بەخوا چ کاتێك ئافرەت لەچاوەکانی تۆدا جوانە ؟ ووتم : ئێستا پێت دەڵێم ...جوانی ئافرەت کاتێ زیاد دەکات لەچاوەکانی منداشەوکاتەی دەم وچاویان زیاتر سوور دەبنەوە !! .... ووتی : چی !! سوور بوونەوە !؟!تێناگەم؟ پێم ووت : ئافرەتان لام جوان تر دەبن کاتێك سەریان نەوی دەکەن . ووتی : نەوی کردن ؟ !! ئەوە چیتە ئەی گەنج بە ڕوونی قسە بکە داوات لێدەکەم . پێم ووت: ئافرەت جوانیەکەی زیاد دەکات بەپێی زیادبوونی شەرم کردنەکەی . ووتی : شەرم کردن!! ئەوە گاڵتەم پێدەکەی ئەی گەنج!! پێم ووت : نەخێر بەخوا . من و زۆربەی پیاوان ئەوڕێگەو شێوازانەی تۆ کەباست کرد کارمان تێناکەن ، ئەمانە شێوازی ڕێگایەکی پوچن بەو بۆیاخە دەچێت کە ئافرەتان دەیدەن لەدەم وچاویان ئەوەی لەگەڵ یەکەم دەست نوێژ بۆ نوێژ کردن لادەچێت و نامێنێت!!

بەڕاستی شەرم کردنە لەئافرەتدا کەکەسەرنجی زۆرێك لە من و سەر ڕاستانی ڕاکێشاوە نەك پیاو خراپان . وە بۆزانینت سەرنجی پیاو بۆ ئافرەت شەرم کردن بەڕێوەی دەبات ... هەرچەندە شەرمی ئافرەت زیاد بێت سەرنجی دەدەن و زیاتر پێی سەرسام دەبن ... ئێستا تێگەیشتی ئەی نەفسی بەد کار کام جۆر لەئافرەتان جوانن وباشن!؟

## جیاوازی لەنێوان ئافرەتاندا لە ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوادا

ڕەنگە ئافرەتانی پاریس و لەندەن و نیۆرك و مۆسکۆ حەقیقەت و ڕاستی ئەو ڕێز گرتنە نەزانن کە ئافرەتانی موسڵمانان لە ڕۆژهەلآت بە دەستیان هێناوە ، لەبەر ئەوەی ئەمان دوورن ، کاتێکیش هۆکارەکانی ڕاگەیاندن شێوەیەك ئەگوازنەوە باس لەحەقیقەتی ئەو ڕێزگرتنە ناکەن.

بەلآم کاتێك ئافرەتێکی ڕۆژئاوایی دێت بۆ ڕۆژهەلآتی موسڵمانان و نزیك دەبێتەوە لەئافرەتانی موسڵمان ئەنجا هەست بەو ڕاستیە دەکات کە ئەوان نەیان بووە پاشان ئەو خۆشیە ئەچێژێ کە لە ڕۆژئاوا ئافرەتان لێی بێ بەشن.

ئەمەش ڕووداوێکە کەبەسەر کچە پارێزەری فەرەنسی دا هات (کریستین) کە (یاسر عبدربە) چیرۆکەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە لەگۆڤاری (یاسمین)دا ئایا حەز بەخوێندنەوەی ئەم چیرۆکە دەکەی کەڕاستیەکی سەر سوڕهێنەرە؟!

بەدرێژایی دوو سەدە ئافرەتی فەرەنسی لەجەنگێکی کوشندەدا بوو لەگەڵ پیاوو دەوڵەت و یاساکان.

کاتێك بینیان پیاوان ناوەندە حکومیەکانیان بۆ خۆیان قۆرخ کردوە بۆیە ئەمانیش داوای یەکسانیان کرد، وە کاتێك بینیان پیاوان کارئەکەن لەهەموو کێلگە بازرگانی و ئابووری و سیاسیەکاندا ئەمانیش دەنگیان بەرزکردەوە و تێکۆشان بۆ دابین کردنی یەکسانی . وەکاتێك بینیان پیاوان فرۆکە و ئۆتۆمبیل بەکار دەهێنن هاواریان کرد و وتیان : بۆچی ئێمەش فڕۆکە و سەیارە بەکارنەهێنین؟

حکومەتەکانی فەرەنسا قۆناغ قۆناغ داوا کاریەکانی ئافرەتانیان بەجێهێنا . ئەمرۆ ئافرەت لەفەرەنسا بەپێ ی یاساکانیان بەتەواوی یەکسانن لەگەڵ پیاواندا بەشێوەیەك هیچ پیشەیەك نیە لە فەرەنسا لەدام و دەزگاکاندا کە پیاوان قۆرخیان کردبێت بەڵکو ئافرەتان داوای هەمان پلەوپایە دەکەن و بەدەستیشیان هێناوە.

دەبینیت ئافرەت لەفەرەنسا وەزیرە هەروەها نوێنەرە لەپەرلەمان و ئەفسەر و پۆلیسە و دادوەرەو شۆفیری ئۆتۆمبیلە گشتی یەکانە ، جووتیاری کێلگەکانە، پۆلیسەو سەرپێچی کەران دەست گیر دەکات لەپیاوان و لەئافرەتان، وەهەروەها نوسراوی سزادانیان لەسەر دادەنا، ئایا ئافرەتان ئایا بەڕاستی ئافرەتان بەختەوەرییان هێناوە ؟

(کریستین) کچێکی جوانی فەرەنسی بوو لەپاریس لەدایك بوو لەباوکێکی پاریسی و دایکێك خەڵکی شاری (مەرسیلیا) وەلەبەر ئەوەی کچێکی گەنج بوو لەلایەن خێزانەکەیەوە گرنگی پێ دەدرا و حەزەکانی ڕەچاو دەکران ، توانی بەسەرکەوتوویی بڕوانامەی زانکۆ بەدەست بهێنێت لەکۆلیژی ماف، وەپێویست بوو لەسەری لەنووسینگەی یەکێك لەپارێزەراندا ئیش بکات ، پلەپلە بەرزبووەوە وەتاوەکو توانی لەنوسینگەیەکی تایبەت بە خۆی ئیش بکات .

(کریستین) دەڵێت: بەیانیەك کاتژمێر شەش هەستام ، لەکاتێکدا کارەکانم کاتژمێر نۆ دەست پێ دەکرد دوای خۆشتن وقاوەخواردنەوەیەکی بەپەلە ، وبەخێرایی بەڕێ کەوتم بەرەو شوێنی سەرکەوتنی شەمەندەفەر کەبچم بۆ شوێنی کارەکەم . ئەم ڕۆشتنە زیاتر لەکاتژمێرێك دەخایەنێت ، کاتێك گەیشتمە نووسینگەکەم بینیم مامۆستاکەم حازرنیە مەبەستی ئەو پارێزەرە بو کە کاری لەلادەکرد دەستم کرد بەڕۆژنامە خوێندنەوە و گوێ گرتنی هەواڵی کەسانی زیادە ڕەو

تاوەکو مامۆستاکەم هاتەوە ، ئەو وەك عادەتی خۆی بە تورەیی و گرژیەوە فەرمانی پێم دەکرد ، کە ڕوو بکەمە ئەم مەحکەمەیەو ئەو مەحکەمەیە بۆئەوەی بچمە سەر کێشەیەك کە گرنگ نی یە بەلامەوە کێ سەرکەوتوو ئەبێ و کێ خەسارەو مەندە.
لەکاتی نیوەڕۆدا بەرەو خواردنگەیەکی شەعبی ڕۆیشتم تاوەکو چەند شتێك بخۆم پاشان بڕۆمەوە بۆ نووسینگەکەم هەندێك لەوکێشانە بخوێنمەوە کەمامۆستاکەم خستبوویە بەردەستم . لەئێواردا و لەکاتی گەڕانەوەدا بۆ سەرکەوتنی شەمەندەفەر لەوێستگەی بیست و شەش قۆناغی و تەحەمولی ئەم سەرخۆشی یا ئەویتر بکەم کە جاری وا هەیە پرسیاری بێ عەقلانەم ئاراستە دەکات بەمەبەستی سەرنج ڕاکێشانم ، وە پێویستیشە وەلام بدەمەوە سەرەڕای ئەوە هەر لەسەردتاوە نیازەکانی دەزانم .
دوای ئەوەی ئەگەمە ماڵەوە هیلاك و ماندوو سەیری بەرنامەکانی تەلەفزیۆن دەکەم ، بێ ئەوەی بەتەواوی بەبەرنامەیەکەوە خووبگرم پاشان نانی عیشا دەخۆم و پاشان ..... ئاخ لەدوای ئاخ پاشان ئەنووم.
بۆ ڕۆژی دوای هەمان سیناریۆی ڕۆژی پێشوو دووبارە دەبێتەوە ، تاوەکو پشووی هەفتە دێت کە دوو ڕۆژە .... پاشان چی بکەم؟؟
لەماڵەوە سەرقاڵی ئیشی گرانم لەڕۆژی شەممەدا پێویستە ئەشیا بۆماڵەوە بکڕم کەپێویستی هەفتەیە وەهەروەها ڕێك خستنی هەندێ شت ، ڕۆژی یەك شەممەش پێویستە جلەکانم بشۆم کە بەدرێژایی هەفتەیەك پیس ببون وەهەروەها گسك دانی ماڵ و پاك کردنەوەیباخچەو ئیش و کار لەباخچەی ماڵەوەدا .... ئەمە دارێکە و پێویستە لقەکانی ڕیك بخرێت ، ئەوەش گوڵێکی ترە پێویستی بەپەینی تایبەتی هەیە .... ئەمەش دارێکی ترە کە پێویستی بەچاندنە .... ئیش و بازاڕ .... وەئەم باخچەیە کەمن بایەخی پێ دەدەم دارێکی تیادا نابینم کەبەروبووم بگرێ وگوڵێ نابینم کە بپشکوێ ژیان ناچارمی کردووە بەبەردەوامی ڕابکەم ....ئەپرسم بۆ؟ وەلامێك نابینم....
ڕاستەمن هەندێك پارەو سامان بەدەست دەهێنم بەلام ئایا پارەو سامان بەتەنها خۆشی و شادی دەستەبەر دەکەن؟ لەساڵی ڕابردودا (کرستین) دەڵێت: مۆڵەت نامەیەکم بەدەست هێنا و بڕیارم دا سەردانی وولاتانی ڕۆژهەلاتی عەرەبی بکەم ، هەندێك لەبرادەران ئامۆژگارییان ددکردم کە ئەم سەفەرە ئەنجام نەدەم...! چون دەچیت بۆ ولاتێك کە تائێستاش ئافرەت تیایدا کۆیلەیە ، پیاویش تیایدا گەورەی ماڵە و خێزانەکەم، بەم شێوە ئامۆژگاریان دەکردم.
بەلکو چۆن دەچیت بۆ ولاتێك کە تائێستا ئافرەت مافەکانی خۆی تیا ناناسێ؟ بەلکو ناشیبینێ مەگەر تەنها لەچاوی پیاواندا...

(کرستین )دەڵێت بەڵام من بڕیام دابوو وەلەبەر ئەوەی بڕیارم دابوو بەڕێ کەوتم حەوت هەفتەم بەسەر برد لە بەیروت و دیمەشق و عەممان و بەغداد پاشان گەڕامەوە بۆ پاریس ، چیم بینی؟
پیاوێکم بینی بەردو کاردکەی ئەڕۆشت لەبەیانیدا ،هیلاك ئەبوو ....ماندووو ئەبوو.... تائێوارە کاری دەکرد پاشان نەگەڕایە بۆ لای خێزانەکەی ... ئەگەڕایەوە و نانی بەدەستەوە بو وەلە گەڵ نانەکەشدا خۆشەویستی و سۆزو هەستی ناسك و زەوقێکی بۆ خێزانەکەی و منداڵەکانی دەبردەوە...
مێینە لەو ولاتەدا زیاتر هیچ ئیشێکی نیە تەنها پەروەردەکردنی منداڵ و گرنگی دان بەوپیاوەی خۆشی ئەوێ بەلایەنی کەمەوە ئەو پیاوەی بووە هاوڕێ و لەگەڵی دایە....
لەڕۆژهەڵاتدا ئافرەت ئەنوێ و خەو دەبینێ و خەونەکانی دێنەدی ... پیاوانیش پێداویستی ژیان پەیدا دەکەن و خۆشەویستی و ئارامی و ژیانی ڕاستەقینە دروست دەکەن . بەلام لە وولاتی ئێمەدا کاتێك ئافرەت هەوڵی دا بۆ یەکسانی چی بەدەست هێنا ؟...
سەیری ئافرەت بکە لەڕۆژ ئاوای ئەوروپا هیچ نابینێ لەبەر دەمی خۆی تەنها ئەوە نەبێت وەك شمەکێك مامەڵەیان پێوەدەکرێ . پیاوان پێیان دەڵێن هەستە نانی خۆت پەیدا بکە چوونکە تۆ داوای یەکسانی دەکەی هەستە وەکو چۆن من هەوڵدەدەم دەبێ تۆش هەوڵ بدەی بۆ ئەوەی یەکسان بی لەگەڵ مندا ... لەگەڵ هیلاکی و ماندوێتی دا بۆ پەیدا کردنی نان ، ئافرەت مێینەیی خۆی لەدەست داوە پیاوانیش بەهەمان شێوە هاوڕێیەتی خۆی لەدەست داوە، ژیانیش بەبێ واتا و بەبێ ئامانج ماوەتەوە . ئافرەت لە ڕۆژئاوا ناچاری کارکردنە بۆ پەیدا کردنی نان تەنانەت وەکو لەماڵەکەی خۆی وەلەماڵی پیاوەکەشیدا بژی.
ئافرەت لەڕۆژئاوادا ڕەنگە هەندێك یەکسانی بەدەست هێنابێت بەلام ژیان و مێینەیی خۆی لەدەست داوە. ئێستاش ئافرەتانی ڕۆژهەلات .... جوانترین سلاو.... ئایا حەزتان بەیەکسانی هەیە؟!

# ئافرەت لەوڵاتی ئێوەدا پادشایە

هاوسێکەمان پیرەژنێك بوو تەمەنی لەسەرووی حەفتاساڵەوە بوو. کاتێك دەتبینی . کاری تێدەکردی و بەزەییت پێدا دەهاتەوە . کەسی لەگەڵ دا نەبوو لەخزم و کەس و کاری کەیارمەتی بدەن .

خۆی خواردن و جل و بەرگی بۆ خۆی دەکڕی . ماڵەکەی زۆر کش و مات بوو بێجگە لە خۆی کەسی تری تێدا نەبوو کەسیش لەدەرگاکەی نەدەدا ! ڕۆژێك لەڕۆژان بەردو رووی ڕۆشتم بۆ ئەرکێك لەئەرکەکانی کە ئیسلام دایناوە لەسەر هاوسێیەتی . واقی وڕما لەوەی کەبینیمی . لەگەڵ ئەوەی کە هیچ کارێکی سەیرم نەکردبوو . بەڵام ئەو لەوکۆمەڵگایەدا دەژیا کە هیچ کارێکی خێری تێدا نەبوو ، هیچ بەزەیی و سۆزێکی هەست پێ نەکردبوو لە لایەن هاوسێکانی یەوە . ئاشکرایە کە پەیوەندی هاوسێ یەتیش لەوێ لەبەیانی باشێ و سڵاوێ بەیانیان و ئێوارانێ زیاتر تێناپەڕێ . لە ڕۆژی دووەمدا هات بۆ ماڵمان و هەندێ شیرینی منداڵانی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو . هەروەها بلیتێك لەو بلیتانەی هێنابوو کە لەیاد و بۆنەکاندا دەبەخشرێ . لەسەر بلیتەکەش هەندێ سوپاس و پێزانین نوسرابوو لەوەی کەسەردانیم کردبوو. هانم دا سەردانی مێردەکەم بکا بۆ پێداویستیەکانی . جارجارە سەری لێ دەدا لەوەندەی لەگەڵماندا دانیشت و مامەڵەی کرد تێگەیشت کە پیاو لای ئێمە بەرپرسە لەماڵ و منداڵی و خێزانەکەی وە لەپێناویدا ئەکۆشێ و خواردن و خوادنەوە و پێداویستی ژیانیان بۆ پەیدا دەکات . هەروەها بۆی دەرکەوت کە لەناو موسڵمانانی ڕاستەقینە دا چەند ڕێزی ئافرەت دەگیرێ ژن بێ یان کچ یان دایك. بەتایبەتیش کاتێك کە کەسەکان لەخۆی گەورەتربن لەتەمەندا . بەشێوەیەك کوڕو کوڕەزا ،براو برازا هەروەها خوار زا کاتێك پێش بڕکێ دەکەن لەخزمەت کردنی ئەنك و داپیرەکانیاندا . وەکەسێك کە خزمەتی دایك و باوکی نەکات ڕێزی نامێنێت لەناو کۆمەڵگەدا .

پیرەژنەکە تێبینی کرد کە چەند پەیوەندی خێزانەکە توند و تۆڵە بەتایبەتی مامەڵەی باوکەکە لەگەڵ منداڵەکانی ، وەچۆن لەدەوری ڕێز بوون و کۆبوونەتەوە . وەچۆن ئەم ئافرەتە تواوەتەوە لەخزمەتکردنی مێردەکەیدا.

بۆیە پیرەژنەکە باسی ئەو قورسایی و ناخۆشییانەی بۆ خێزانەکەم دەکرد کە ئافرەتانی ڕۆژئاوا تووشی دەبن ڕۆژانە. لەکڕینی پێداویستی و خۆبەخێوکردن لەپێناو هیچدا . قسەکانی کۆتایی پێ هێناو وتی: ئافرەت لەووڵاتی ئێوەدا وێنەی پادشایە. وەئەگەر کاتم بەدەستەوە بمایە و تەمەنم

ئەرۆشتایە ئێستا شووم بە پیاوێکی وێنەی پیاوەکەت دەکرد و لەگەڵیدا دەژیام ، هەروەکو چۆن ئێوە دەژین.

نموونەی ئەم چیرۆکە زۆرە لای ئەوانەی لەرۆژئاوا خوێندوویانە یان ژیاون . لەگەڵ ئەمەشدا زۆر هەن لەووڵاتی ئێمەدا شەرم ناکەن لە لاسایی کردنەوەی رۆژئاوادا لەهەموو ئیش و کارەکانیاندا ، تا ئێستاش لە گۆڤارو رۆژنامەکانی جیهانی ئیسلامیدا باس لەگرنگی و بایەخ بە مۆدیلاتی رۆژئاوا دەدرێت...

خوایەگیان سوپاس بۆ تۆ کە نیعمەتی ئیسلامت پێ بەخشین. خوای گەوردو میهرەبان ئەفەرمێ(يمنّون عليك أن أسلموا قل لا تمنّوا عليّ إسلامكم بل الله يمنّ عليكم أن هداكم للإيمان إن كنتم صادقين)

## چیمان داوە لە رۆژئاوا

ئەی کچی خۆم گوێ لەقسەی زەردو سوور و فریودانی بێ هۆشان مەگرە ، ئەوانەی چاو دادەگرن و لێو دەقرپێنن. بۆ ئەوەی پۆشاکی ئیسلامیت لێ داماڵن و بتکەن بەهۆکاری رابواردنی خۆیان ، ئایا بەمە رازیت؟

نەخێر . بەراستی دابەزینە سەر جلەکان . تاوەکو لێردوە پەنجەیەك و لەولاوە پەنجەیەکی تر ، تاوەکو گەیاندیانە کەناری دەریاکان بەرووت و قووتی کە هیچ بەلاشەیەوە نەبێ ، تەنها ئەوە نەبێ مرۆڤ ناشرین دەکات. پاشان وازت لێ دێنن لەشەقامەکان بڕۆیت بەرپێدا بەرووت و قووتی و بەلەنجەولار کەسیان لێناگەرێن کە یەکێکیان بگرنە خۆیان تەنها بەدەست نەبێت کە ئیشارەتی بۆ دەکرێت . پاشان لێ ی وورد دەبنەوە . هیچ شتێك دێنێ رێ ی لێناگرێ و هیچ عورفێك بەربەستی ناکات و هیچ شەرمێك نایگرێتەوە . بەراستی سوکایەتی پێ کرا هاوار بۆئەولەناو ئاگردا ...هاوار بۆنەو....

ئایا ئەمە لەکوێی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوادایە(دروودی خوای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ(ضفان من أهل النار لم ارهما: قوم معهم سياط كاذناب البقر يضربون بها الناس ونساء كاسيات عاريات مملات مائلات ، رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة ، لايدخلن الجنة ولايجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا) رواه مسلم

بەلام خەلکی فریویان دەدەن .... پێیان دەڵێن : ئەمە شارستانیەتە و مەدەنیەتە ئەمانیش بەراستیان دەزانن ... والله درۆیان لەگەڵ دەکەن ، ئایا پاکی و نەنگی ، شورەیی یە ؟ چاکە

خراپەیە؟ ، و ڕۆشنایی تاریکی یە؟ ئایا لەم ڕوودوە چیمان داوە لە ڕۆژ ئاوا. ڕۆژئاوا ئافرەتـەکانیان بەرەو دۆزەخ دەبەن، ئایا بەسمان نیە ؟ئابرۆ چون بەچاوی خەلکی سـەیر بکـەین ؟ ئایا شـوردیی نی یە لاسایی مەیمون بکەینەوە، ئافرەتانی ڕۆژئـاوا چییـان پێنـاکرێ لەلایـەن پیاوانـەوە؟ هـەرچی یان بوێ بەسەریاندا ئەهێنن ، چی یە لێرەو ؟ چی یـە لـەڕۆژئاوا؟ تـۆش دەتـەوێت ئـاوا بـژی ئـەی کچی خۆم؟ ...نەخێر بەشێوەیەك بە کە موسڵمانان و خوا دەیانەوێت.

لەجیهاندا لە تۆ پاك تر و بەڕێز تر نی یە ئەگەر دەست بگرێت بەدینەکەتەوە وەدیارێزگاریت کرد لە حیجابەکەت و بەرەو ڕەوشـتی جـوان خـۆت ڕازانـدەوە. ئـافرەت لـەوێ لەماڵەکـەی خۆیـدا سـوك کراوە ، ئیهانە کراوە، پارەو سامان بەدەست دێنن تاوەکو جوان بێت . کەی جوانیەکی ئـەما فرێـی دەدەن ، هـەروەکو لیمـۆ دوای مژینـی ، فـڕێ دەدرێ بـەلاَم بەداخـەوە کـە لاسـاییان دەکەینـەوە . باشمان واز لێهێناو خراپمان وەرگرت لە شانۆ لەگۆرانی و لەهونـەر و لەسـەما . وەك ئـەوەی تەنـها بۆ گۆرانی و تەپل و سەما دروست بوبێتن.

**لەکۆتایی دا**: ئەی کچی خۆم ووتەیەکت پـێ دەڵێـم کـە زۆر پێویستە پێـت بوتـرێ پێـش ئـەوەی گورگەکان پێت بزانن ، پێـت دەڵێـم: ئێستا تـۆ منداڵێکـی جوانـی وە تـۆ تاتەمـەنی (٢٥) ساڵی داوا کراوی ، دوای ئەوە هەرکەسێك لە دەرگاتانی دا گەر لە ڕەفتارو دینی ڕازی بوون دوو دڵ مـەبن لـە ڕازی بـوون ڕێگری لێمەکەن و دوای مەخـەن . پێتـان دەڵێـم جوانـی و منداڵـی بـەردەوام نـابێت یاناڕەحەتی و نەخۆشی یان چاوەڕوانی گۆڕ. بەڵێ گۆڕ پێویسـتیەکی حەتمیـە هـەموو زیندوویـەك تێ ی دەچێ . کچی خۆم گۆڕ ئەو شوێنەیە کەوا ڕۆژانـە نوێنـەرانی ئێمـەیان بـۆ دەچـێ کەلەسـەر دەسـتی خۆشەویسـتان و دایکـان و باوکـانی و خۆشەویسـتانی خۆیـان هـەڵ گـیراون . کـە وەك دیارییەکی بەنرخ بۆ ناو مـارو دووپشکەکانی ژێـر زەوی دەبـەن . بـێ گومـان ئـەوانیش خوێنیـان دەمـژن و گوشـتەکانیان دەخـۆن و کون و کەلەبـەر کـانی لەشـیان دەکـەن بەهێلانـە و بـەناردزووی خۆیان و بێ ترس . کەسـیش لەوشـوێنە دا خـاوەنی خـۆی نیـە وە نـاتوانێ هیـچ بەرگریـەکیان لێ بکات . بەڵێ کچی خۆم..؟!

## ئاگاداربە ئەی بوکی گەورەکچ

خوا ئاگادارە کەکاتێ قەیرە کچێ دەبینم لەخزم و کەس و کارو ناسراوان یان هەواڵی قەیرە کچێ دەبیستم چەند ئازار دەچێژم و دلگران دەبم بۆیان و بۆ داهاتوویان .
ئەوەی لەم بوارەدا زانیاری زیاد کردم سروشتی کارەکەم بوو وەك ڕێپێدراوێك لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا سەردرای پێش نوێژ و ئیمامی مزگەوت . لەگەڵ ووتنەوەی چەندین وانە لەم بارەیەوە لێردو لەوێ ... وێڕای ئەو پرسیارە زۆرانەو پەیوەندی تەلەفۆنانەی لەم بارەیەوە لێیم دەکرا بۆیە پاش پشت بەستن بەخوا بڕیارم دا بەنووسین دەربارەی ئەم بابەتە هەستیارە .
جگە لەوەی لەدەیان ناوچەو پارێزگادا ووتومەتەوەو جێگەی سەرنج و سەرسامی ئامادەبووان بووەو هەندێکیان داوای ئەوەشیان لێکردووم کە بەردەوام بم بابەتە گرنگی بەم بابەتە بدەم .بۆ یە زیاتر دەستە کرد بەگەڕان و خوێندنەوەو پرسیار کردن دەربارەی هۆکارەکانی دواخستنی بەشوودانی کچان پاشان بیرکردنەوە لە چۆنیەتی چارەسەر کردن .... وە تاوەکو ئێستاش بەدوای زیاتری ڕاستیەکانیدا دەگەڕێم بەشێوای یاداشتی زیاتر و سوود گەیاندنی زیاتر بە موسڵمانان و ئەستۆپاکی . وە بۆجێ بەجێ کردنی فەرمانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت).

**قەیردیی کچان**

هۆکارەکانی - چارەسەری هەلویستی کچان زەروزیانەکانی
وا دەبینم باشترین تەمەن بۆ شووکردن (١٧) ساڵە لەڕووی لاشەییەوە ، بەلاَم ئەگەر تەمەنی گەیشتە (٢٢) ساڵ لای هەندێ لەخەلکان پێی دەوترێت گەورە کچ یان ( قەیرە کچ) تا دەگاتە (٢٥) ساڵ ئیتر لەم تەمەنە بەدواوە هەموو کەسێك پێی دەڵێت قەیرە کچ ، بەبۆچوونی من ئەم پۆلێن کردنە تایبەتە بەم بارودۆخ و سەردەمەوە وە ئەگەرنا لەسەدەکانی سەردەمی پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت ) و هاوەڵانی زۆر سوربوون لەسەر بەشوودانی کچان لەتەمەنی منداڵیدا

**خوشکان برایان**

گومان لەوەدا نیە کە قەیرە کچی نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتیەو هەندێك لەخێزان و کۆمەڵگاکان بەدەستیەوە دەناڵێنن و شوێنەواری خراپ بەجێ دەهێڵن لەسەر کچان و خزم و کەس و کاریان ، هۆکارو چارەسەریشی هەیە .

## ( بەشی یەکەم )

## ئەو هۆکارانەی تایبەتە بەکچانەوە

أ - تەواو کردنی خوێندن :

هەندێك لەکچان بەهەڵە دەڕوانن خوێندن شوکردن . گوایە شوکردن ڕێگرە لەبەردەم خوێندندا یان هۆکاری دواخستنی خوێندنە ، ئەمەش بێگومان تێگەیشتنی هەڵەیەو پێویستی بەڕاست کردنەوە هەیە . بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕاستە ، چونکە شوکردن یارمەتی باشتر تێگەیشتن و یەکلابوونەوە دەدات بۆ خوێندن . لێکۆڵینەوەکان لەبواری پەروەردەو زانستی دەروونیدا دەیسەلمێنن کە زۆرێك لەگەنجانی کوڕو کچ لەتەمەنی بالغیدا تووشی ئالۆزیدا پەرت و بلاوی و زۆری بیرکردنەوەو زۆری بیرۆکەو بیرقاڵ بوون دەبن . ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر دابەزینی ئاستی زانستیان . کاتێك شوودەکەن یان ژن دەهێنن سەرجەم ئەو بیرۆکانە نامێنێت و ئاستی تێگەیشتن و تەرکیزیان زیاتر دەبێت . تا دەگاتە ئەو پلەیەی کەسی سەرکەو تـوو بەتوانایان لێدەربچێت لێرەدا پرسیار دەکەین بۆ ئەم گۆڕانە لەلاوازیەوە بۆ هێزی سەرکەووتن ؟ لەوەڵامدا دەڵێین : کاتێك گەنجان دەگەنە تەمەنی شووکردن یان ژن هێنان غەریزەی جنسیان دەجوڵێت و ئەمەش ئەگەر بەڕێگەیەکی شەرعی و حەلاڵ تێرکرا ئەوە ژیری بیرو هۆشیان دەحەوێنێتەوە و دەست دەکات بەبیرکردنەوە لەشتانی تر وەك خوێندن و بەرژەوەندیەکانی تریان چی ئایینی بێت یان دونیایی .

بۆ یە دەڵێم بەخوشکانی ئازیز دەکرێت سوپاس بۆ خوا دەتوانن خوێندن و شوکردن پێکەوە کۆبکەنەوە . خۆئەگەر پێکەوە بۆت کۆ نەکرایەوە ئەوە شووکردن پێش بخەو . ئەمەش داوایەکی شەرعەو گرنگ ترە لەخوێندنەکەت تا تووشی قەیرەکچی نەبیت.

زۆر جار دەبیستینەوە دەربارەی هەندێ لەوکچانەی کە بوونەتە قوربانی قەیرەیی بێزارەو دەڵێ : چی لە بڕوانامە بکەم چی لە پیشە بکەم هەمووی بۆ ئێوە تەنها منداڵێکم بدەنێ بابە پێکەنین و گریان دونیام لێ پڕ بکات .

نموونەیەك دەهێنمەوە تەنها بۆ ئاگادار بوون و تووش نەبوون بە قەیرە کچی بە هۆی بەردەوام بوون لە خوێندن . کچێك پاش تەواو کردنی خوێندنی ئامادەیی لەتەمەنی ١٩ساڵی هاتنە داوای بەڵام ڕازی نەبوو شووبکات و ووتی من شووناکەم تا زانکۆ تەواو نەکەم بەڵام کاتێك خوێندنی تەواو کرد تەمەنی بوو بە ٢٣ ساڵ (چووە قۆناغی قەیرەییەوە ) پاش هاتنە داوای ووتی : ساڵێ

دووان دەمەوێ بحەوێمەوە تا تەمەنی گەیشتە ٢٥ ساڵی لە دوای ئەوە کەس نەهاتە داوای ، ئەوانەش کە داوایان دەکرد وازیان لێ هێناو لە شوێنێکی تردوە کاری خۆیان کرد کاتێك بەئاگا هاتەوە بینی تووشی گرفتی قەیرەیی بووە.

هیوای دەخواست کەسێك بێتە داوای بەلاّم گەنج کچێکە ناوێت لەخۆی گەورە تربێت ، ئەمیش پیاوێکی ناوێت لەخۆی گەورە تربێت یان سەر بەهەوێ شووناکات . بەم شێوە یە خۆی دەخوات و خۆی دەخواتەوەو نازار دەچێژێت و داهاتووی ڕاستەقینەی خۆی دەکوژێت و گوڵی گەنجێتی خۆی لە دەست دەدات و خۆی دەگەیەنێ بەکاروانی قەیرە کچان بەهۆی خوێندن و بەردەوام بوون لەخوێندن.

باوکانیش بەشێك لەو تاوانانە هەڵدەگرن کە کچەکانیان لە سەر خوێندن هان دەدەن شووکردنیان پێ دوا دەخەن یان بێ دەنگ دەبن لێیان بۆ یە ئامۆژگاری سەرجەم کچان دەکەم ئەگەر کەسێك هاتە داوایان بەدڵیان بوو لە ڕێکی خۆیاندا بوو با شوو بکەن دوای نەخەن لەبەر خوێندن و بڕوانامە یان نەیکەن بەمەرجێك بۆ دواخستنی شووکردنیان .

ب بەرزڕوانین و زیادە ڕەوی لە سیفەتەکانی مێردا :

هەندێك لەکچان زیادە ڕەوی دەکەن لەو مەرجانەی کە دەبێت لە هاوسەرە کانیاندا هەبێت . زۆر گەنج و پیاو دەچنە داوای کچێك کەچی دەست دەنێت بەڕوویانەوە هەرجاری بەبیانوویەك ... ئەمەیان بالاّی بەرزەو ئەوی تریان کورتە بالاّیەو ئەمەیان کەسایەتی نی یەو ئەوەیان جوان نی یە . فەرمان بەر نیە ... کارەکەی لەگەڵ مندا ناگونجێت .... مووچەکەی کەمە .... لەوانەیە هەندێك لەکچان ( خوا ڕێنماییان بکات ) دەست دەنێت بەڕووی گەنجانەوە لەبەر ئەوەی ( مولتەزیمەو ئیسلامی یە) بەگومانی ئەوەی ناتوانێت هیواو ئاواتە تایبەتەیەکانی بۆ بەدی بهێنێت لە تەلەفزیۆن و سەتەلایت . یان پیاسەی دووقۆڵی سەیرانگاو بازاڕو ..... هتد.

لەوانەیە پیاوێکی ( کامل مواصفات) بە بۆچوونی ئەو بێتە داوای بەلاّم دەست دەنێت بەڕوویەوە چوونکە ژنێکی تری هەیە . یان پیاوێکی تایبەتی دەوێ ت کە ئەم پێی سەرسامە .... جگە لەوەش کەسی تری ناوێت . ئەو کەسەش لە ڕووی شەرعەوە ڕێگەی پێ نادرێت یان باوکی و دایکی بەدڵیان نی یە .

بەلاّم کچی عاقڵ و سالار ئەو کچەیە کە پلان و نەخشەی واقیعی دەکێشێت بۆ خۆشی دنیای و سەرفرازی ئاخیرەت کە بەدوای سیفاتی شەرعیدا دەگەڕێت لە هاوسەرەکەیدا لە دین و ئامانەت و ڕەوشت و ..... بۆیە کە بینیەوە ڕازی دەبێت – خواش سەرکەوتنیان پێ دەبەخشێت . بۆیە ئامۆژگاری سەرجەم کچان دەکەم کە شوێنی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ( درووودی

خـوای لێبێـت ) بکـەون . کـە زۆر بـەجوانی سـیفەتەکانی هاوسـەری بـۆ ڕوون کردووینەتـەوە دەفەرمووێت (إذا أتاكم من ترجون دينه و أمانته فانكحوا) واتـە : ئەگـەر هاتـە لاتـان و لـە ئـاین و ئامانەتی ڕازی بوون کچەکانتانی لێ مارە کەن .

ئەم مەرجانە خۆش گوزەرانی بۆ کچان بەدی دەهێنێت ئەمەش قسەی کەسێکە هەموو ووتـەکانی وەحی بووە .

ج – چەند وەهم و دڵە ڕاوکێیەك کە بەدڵی کچدا دێت :

بۆ نموونە ترسان لەشکستی. لە هاوسەرگیری. یان ڕەش بینی بەرامبەر بە پیاوان بە هۆی دڵ ڕەقی و توند و تیژی و بێ بەزەیی . یان ترسان لەبەڕێوەبردنی ماڵ و نەدانی مافەکانی هاوسەریان جێبژ وەرگرتن لە دونیاو حەوانەوەو دوورکەوتنەوە لە بەر پرسیارێتی ماڵ و مێرد .

گومانی تێدا نیە زۆرێك لـەو شـتانەی سـەرەوە وەهمـەو هیچی ڕاسـت نـی یـە بـەڵکو دڵـە ڕاوکێ و وەسوەسە داوی شەیتانە تووشی کۆمەڵێك لەکچان دەبێت و قەیرەییان دەکات و بـێ بـەریان دەکـات لەخۆشیەکانی هاوسەرێتی و ماڵ و منداڵ .

کچی ژیر ئەو کچەیە کە ئەم وەهم و داو و تەڵەی شەیتان دەناسێتەوەو خۆی لێ لا دەدات و گوێی پێ نادات و دژایەتی شەیتان دەکات و گوێ ناگرێت بۆ ئەم وەسوەسانەو بەردەوام دەبێت لـە بـەدی هێنانی دونیاو قیامەت .

د. تووش بوونی کچان بەهەندێك نوقستانی یان شوێنەواری هەندێ ئەخۆشی:

لەوانەیە هەندێ لەکچان لە خواوە تووشی هەندێ نووقستانی بوبن وەك ئەوەی دەستی ئەبێت یان ئەفلیج بێت یان زۆر درێژ بێت یان زۆر کورتەباڵا بێـت یـان زۆر لاواز و ئێسك نـەرم بێـت یـان زۆر قەڵەو بێت یان تووشی بەڵەکی بوبێت بەتایبـەتی لـە دەسـت و دەم وچـاویدا کـە ئەمانـە هـەمووی لەسەر ووی دەسەڵاتی کەسەکان خۆیانەوەیە لەوانەیـە خـوا بیکـا کـە کـەفارەتی گوناهـەکانیان یـان پلەیانی پێ بەرز بکاتەوە یان نیشانەیەکی خۆشەویستی خوا بێ بۆیان ئەگـەر ڕازی بـن و سـەبر و ئارامی لەسەر بگرن . هەروەك پێغەمبەری ئازدار ( درووودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرمووێت (ان عظم الجزاء مع عظم البلاء . وان الله اذا احب قوما ابتلاهم فمن رضی فله الرضاء . ومن سخط فله السخط) بۆیە هەندێك لەکوڕان لێیان ناچنە پێشەوە – ئایا بمێننـەوە بـەبێ شـووکردن تـا تووشـی قەیرەیی دەبن ؟! لەوەڵامدا وام پێ باشە پیاوان لێیان بچنە پێشەوەو ئەگەر چـی ژنێکـی تریشـیان هەبێ وا باشە ئەو کچانەش ڕازی بن ئەگەر لەتەمەنیشدا گـەورە تـر بـن لـەخۆیان ئەگـەر تەنـها لەبـەر خـواش بـێ ئـەجرێکی گەورەیـە و دڵـی کەسـێك خـۆش کردنـە خـواش بـەو بۆنەیـەوە

لەهەموویان خۆش دەبێت . یان پێویستە ڕازی بێت بەو پیاوەی وەکو خۆی نوقستانیەکی هەیە ئەگەر زانی داتوانێت لەژیانی هاوسەری لە گەلیدا . یاخود پەیوەندی هەبێت بەو لیژنانەی لەڕێکخراوە فێر خوازی و داد گاکاندا کەسی شیاوی بۆ دەدۆزنەوە .

ه‍ ڕازی نەبوونی هەندێك لەکچان بەشووکردنی سەربەهەوێ و چەند ژنە:

دەبینین و دەبیستین زۆر جار کە کچێك دەستی ناوە بە ڕووی پیاوێکەوە لەبەر ئەوە ژنێکی تری هەیە ئەگەر چی کەسکە زۆر چاك و سالح و ئەمین و بەڕەوشت و بەئاکار بوبێت .

لەسەرە تاوە دەڵێم لەوانەیە هەندێ لەکچان بیانووی خۆیان هەبێت لەم ڕەت کردنەوەیە لەبەر دوو هۆکار :

**یەکەم** : هەندێ لەپیاوان ناتوانن هاوسەنگی و دادوەری بکەن لەنێوان هاسەرەکانیان هەرئەوانیش فرەژنیان ناشرین کردووە – دەبیستین هەندێ بەیەکجاری دەکەون بەدیوی ژنە تازەکەیان و ژنە گەورەکەو دایکی منداڵەکانی لەبیر دەچێت بەهەر هۆیەك بێت وەك پیربوون یان زۆری منداڵ هەندێکیان بەڕادەیەك پشت گوێ دەخرێن تەنانەت ئەرك و مەسرەفیشیان ناکێشن ئەو کەسانەش لەکەناری مەترسیەکی گەورەدان خوای گەورە سزای کوشندەی بۆ داناون هەروەك پێغەمبەری ئازیزمـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــان

( دروودی خوای لێبێت ) دەفەرموێت (من کانلة أمراتان فمال الى احداهما جاء يوم القيامة وشقية مائل) بەواتای ئەوە لەڕۆژی قیامەتتدا دەیان هێنن بەکەوتویی بەسەر لایەکیاندا کەوتوون ، پەنا دەگرین بەخوا . بۆیە ئامۆژگاری پیاوانی فرە ژن دەکەم کە لەخوا بترسن یەکسانی و داد پەروەری بپارێزن لەنێوان ژنەکانیاندا چی لەڕووی خەوتن و دانیشتن و مانەوە و هەڵس و کەوت لەگەڵیان ، ئەگەر چی خۆشەویستی دڵە لەناخەوە جێگەی لۆمەو گلەیی نی یە ، خوای گەورەش دەفەرموێ ( ولن تسطيعوا ان تعدلوا بين النساء ولوحرصتم) ، بەواتای خۆشەویستی دڵ و دەروون ... بەڵام نابێت ئەم خۆشەویستیە بەڕادایەك بێت لەگەڵ یەکێکیان و ئەوانی تر لەبیر بباتەوە زوڵم ستەمی لێبکەوێتەوە . بۆیە پێغەمبەری ئازیز ( دروودی خوای لێبێت) کاتێك هاوسەنگی دەکرد لەنێوان هاوسەردکانیدا لە هەموو ڕوویەکەوە دەیفەرموو ( اللهم هذا قسمي فيما املك فلا تلمني فيما تملك ولا املك ) .

ئایا کچان هەڵویستیان هەیە لەبەرامبەر ئەمەدا ؟

بەڵێ هەڵوێستی هەیە پێش شووکردن تا وەکو پیاوێك هەڵبژێرن خاوەنی ڕەوشت و دەست و دڵ پاك و ئەمین بێت و لەخوا بترسێت لەهەر ستەم و زوڵمێك دەیکا بەرامبەر بە ژنەکانی بەڵام

ئەگەر بۆی دەرکەوت پاش شووکردن کەپیاوێکی نا دادگەرو خراپە پێویستە ( ئامۆژگاری ) بکات و ترسی خوای وە بیر بخاتەوە کتێب و نامیلکەو کاسێتی تایبەتی بداتێ دەربارەی دادگەری و یەکسانی وەکەسانی گونجاو لەخزم و کەس و کاری رابسپێرێ بۆ ئامۆژگاری کردنی . لەبەرامبەریشدا ئارام بگرێت مامەڵەی جوان

بێت و ڕووی خۆش و قسەی شرین بێت و بەجوانی بێشوازی لێبکات و بەنەرمو نیانی و دانایی وە ڕای دەکێشێت بۆ خۆی پشت بەخوا .

ئەگەر چی هەندێك کەس فرە ژنی بەتاوان ستەمێکی گەورە لەقەڵەم دەدەن بەرامبەر ژنی یەکەم و دەیانەوێ فرەژنی لای کچان ناشرین بکەن تەنانەت زۆرێك لەڕووبەری گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بەئاشکرا دژایەتی ئەم جۆرە شوکردنە دەکەن و بەڵکو بەلایانەوە پەیوەندی ژن و مێردایەتی ژێر بەژێر لەگەڵ خۆشەویست و هاوڕێ دا بەلاوە باشترە لەفرەژنی دووەم و سێ یەم . خۆنەگەر پێیان بکرێت دەیدەن بە دادگا هەروەك چۆن لوولاتانی خۆرئاوادا دەکرێت .

بێگومان کەسانێك دژایەتی فرەژنی دەکەن یان نەزانن یان سەرکەشن یان کین لەدڵن بەرامبەر بەئیسلام و موسڵمانان یان دوژمنی ژنانن . ئەو جۆرە کەسانە تۆمەت بارن بەرامبەر بەخراپەکانی خۆیان چونکە هەرکەسێك دژایەتی فرەژنی بکات لەکاتێکدا خوای گەورە مۆڵەتی پێ داوە وەك ئەوە وایە دژایەتی فەرمانەکان ی خوا بکات کە لە قورئاندا هاتووە . خوای گەورە دەفەرمونێت (فانکحوا ما طاب لکم من النساء مثنی وثلاثة و رباع ) . بەلام ئەو غیرە و غەم و دلگرانیەی کە تووشی ژنی یەکەم دەبێت لەسەردتای هێنانی ژنی دووەمی مێردەکەیدا شتێکی ئاساییەو ئەگەر لەسنوری گونجاودا بێت . تەنانەت ئەم جۆرە غیرەو دلگرانیە لای ژنانی پێغەمبەریش (دروودی خوای لێبێت ) دروست بووە کاتێ ژنی تری هێناوە . خوای گەورە لە‌ هەموویان ڕازی بێت . ئەمەش فەزڵ و ڕەحمەتی خوایە بە بەندەکانی کەوا فرە ژنی بوار پێدراوە بەستویەتی بە مەرجی یەکسانی و داد پەروەریەوە بێ گومان گەورەترین ڕێگە چارەیە بۆ نەهێشتنی قەیرەیی لەم سەردەمەدا کە ژمارەی ژنان زۆر زۆرترە لە پیاوان – بۆ یە ئامۆژگاری کچان دەکەم دەست نەنێن بە ڕووی ئەو پیاوانەی کە ژنی تریان هەیە بە مەرجێك کەسانی چاك و ئەمین و ڕەوشت بەرزبن .... ئەمەیان باشتر و خێر ترو چاکترە بۆ ئەوان لەوەی بەقەیرەیی بمێننەوە یان شووبکەن بەکوڕێك کە نازانێت مافەمانی دابین بکات یان هەڵس و کەوتی باش نەبێت .

## (بەشی دووەم)

### ئەو هۆكارانەی تايبەتە بە بەخيوكەرو باوكانەوە

١- ئەو كەسە هاوشانی خۆت نی يە ( كەواتە دانيشە لەماڵەوە تا خوا دەينيری ) :

هەنديك لەباوكان ( خوا ری نيشاندەريان بيت ) رازی نابن بە كورانەی دينە داوای كچەكانيان بەبيانووی ئەوەی هاوشانی ئيمە نين تا تەمەنی كچەكانيان دەگات بە سەرووی بيست ساڵی و زياتريش هەر كە باسی ئەوەشيان لەگەڵدا دەكری دەڵين : با دانيشی تا كەسی خۆی دی ، (قسمەت و نسيبە) .

بەو باوكە دەڵين ( تاكەی دانيشيت لە ماڵا)؟!

ئايا بەم قسانە گەردنی خۆی لای خوا پاك دەكاتەوە ئەگەر كچەكە لەخوار تەمەنی ١٨ ساڵيەوە بوايە باشە بەڵام ئەم تەمەنی تی پەری و بوو بەقەيرە كچ هەر سەيری دەكەيت و دەستەوەستان ئەم قسانە دەڵييتەوە ئايا نازانی گەران بەدوای كوريكی چاكدا بۆ كچەكەت بەشيكە لەو قسانەی كە دەيكەيت ، خۆ تاوانيكی گەورەيە بلی بەدوای كوريكی باشدا بگەری بۆ كچەكەی . تورە دەبيت دەچيت بە گژتا دەڵيت من بەدوای كورا بگەريم بۆ كچەكەم خەڵكی چيم پی دەڵين ؟ خۆم لی زيادە پيم بەخيو ناكری چەندەها قسەی تر لەوەلامەدا.

بۆهەر بەخيو كەرو باوكيك شەرمزا بيت لەئيسلام و بەرنامەی قورئان سوننەتەكانی پيغەمبەری خوا ( دروودی خوای ليبيت ) و هاوەڵانی دەزانی ئەمە ئەركيكە لەسەر شانی نەعەيبەو نەعار . كوريكی باش بۆ كچەكەت بدۆزەرەوە ئەوەندەش بەسە ليرەدا باسی بكەين كە خوای گەورە لەسورەتی (قصص) دا باسی ( شوعەيب)(سەلامی خوای ليبيت)) مان بۆ دەكات . كاتيك دڵنيا دەبيت لە ئەمين داری موسا و رەوشتی بەرزی ، بەئاشكرا پيی دەڵيت دەمەويت لەبەرامبەر ئەو چاكەيەدا يەكيك لەكچەكانمت لی مارە بكەم (قال إني أريد أن أنكحك إحدى ابنتي هاتين على أن تأجرني ثماني حجج فإن أتممت عشرا فمن عندك وما أريد أن أشق عليك ستجدني إن شاء الله من الصالحين)

ئەوش عومەری کوری خەتابە حەفسەی کچی دەدات بە ئەبوبکر و علی و پاشان عوسمانی کوری عەفان خوا لییان رازی بیت . بەلام بی دەنگ بوون .... پاشان دای بە پیغەمبەری خوا ( دروودی خوای لیبیت) .

دەلیم و ئامۆژگاری سەرجەم باوکان دەکەم بەتایبەتی ئەوانەی کچەکانیان خۆش دەویت بەدوای خۆشگوزەرانی دونیاو قیامەتدا دەگەرین کچەکانیان زوو بدەن بەشوو بە دوای کەسی گونجا و چاکدا بگەرین بۆیان ، تا تووشی قەیرەیی نەبن و گەردنی خوتان لە دیوانی خوا ئازاد بکەن .

بەبی گوی دانە ئەوەی کە کچەکەیان توشی قەیرەیی دەبیت و پیردەبیت . لەوانەیە بیریان لە بەشوو دانی کچەکانیان هەر نەکردبیتەوە تاتەمەنی (٢٧) سالی و زیاتریش لەوانەیە هەندی لەم خیزانانەش خویندەوارو رۆشنبیریش بووبیتن و هەندیکیشیان پابەندیش بن بەشەریعەتی ئیسلامی کەچی دەبینی گیرۆدەی ئەم دابوو نەریتەن و دەستەوەستانن لەبەردەمیدا....

بەمەش خەلکی لە ناموسیان دەکەوی بزانن یان نا ، بیگومان هەرکەسی بەتوندی ئەم عادەتە بگری وچاوو بیری خۆی لەئاست دا کویر بکات ئەوە کەسیکی خۆپەرستەو دادگەری و ویژدان نازانی .

دادوەری لەکویدایە باوکی یان برایەك کاتی نووستن هات دەچنە باوەشی هاوسەرەکانیانەوە ئەم کچە قەیرەبەسەزمانەش وەتابەیانی چاوەکانی بەئەستیرەکانی ئاسماندا دەگیری تەپاوتل دەکات و سکالای خۆی بۆلای خوا دەباتی . دادوەری ئینساف ئەوەیە کەخۆتان بخەنە جیگەی ئەو کچە قەیرەیەو هەست بکەن بەئازارەکانی و چیتان بۆخۆتان پیخۆشە بۆئەویش پیتان خۆش بیت .

تەوبە بکەن و بگەرینەوە بۆلای خوا لەم تاوانە گەورەوخراپە وداوای لیبوردن و لی خۆش بوون بکەن لەکچەکانتان و خوشکەکانتان کەداتان ناون و بوون بەقەیرە و پەلە بکەن لەبەشوو دانیان پیش ئەوەی کاتیان لەوەزیاتر بەسەربچی.

٢- فەرمانبەری و دەولەمەندی

هەندیك لەباوکان کاتیك کوریك یان پیاویك دیتە داوای کچەکانیان ئەگەر زانیان هاوکوف و هاوشانی خۆیانە خاوەنی دین و ئامەنەت و رەوشتی بەرزە پرسیار لەئیشەکەی دەکەن ، ئیشەکەی چی یە ؟ مووچەکەت چەندە ؟ دەست دەنین بەرووویانەوە لەبەر ئەوەی فەرمانبەر نی یە مووچەکەی کەمە کچەکەمان لەبرسان دەمریت یان دەبیت بەزەکات و خیرو خیرات بژی .

ئەمەش تیروانینیکی هەلەیەو کورت بینی یە . ئایا ئیوە نازانن خوای گەورە دەفەرمووی (وأنكحوا الأيامى منكم والصالحين من عبادكم وإمائكم إن يكونوا فقراء يغنهم الله من فضله والله

واسـع عليـم) بـاوكی بـەریزم شـووكردن و ژن هینـان گـەورەترین دەرگـاو كلیلـی رزق و رۆزی دەولەمەندیە .

٣- بەشوودانی كچی یەكەم پیش دووەم پاشان سی یەم

هەندیك لەباوكان لەبەر خاتری كچەگەورەكەی كچە بچووكەكانی بەشوو نادات ، ئەكریت لەكچە گەورەكەدا هەندی هۆكار هەبیت ریگر بیت لەوەی بینە داوای یان هەر حەز نـەكات شووبكات . كەچی باوكەكە جەخت لەسەر بەشوودانی دەكاتەوەو دەلی تا ئەمـەیان بەشـوو نـەدەم ئـەوانی تـر دەبیـت شـوونەكەن دەبـن بـەقوربانی دەسـتی خوشـكە گەورەكـەیان بـەلام ئەگـەر بەشـیوەیەكی زانستیانە بروانینە بابەتەكە دەزانین شوكردن قسمەت و نسیبە بەلكو یـەكیك لـەهۆكارەكانی ئـەم بواركردنەوەیە بۆ خوشكەكانی تری تـا شـوو بكـەن ئەگـەر كەسـیك گونجاو هاتـە داوایـان . گومـان لەمەشدا نی كە كچان هەلویستی خۆیان هەیـە دەكریـت كچەگەورەكە راستەوخۆ بـی پیـچ و پـەنا بەدایك و باوكی بلیت بە خوشكەكانی ترم شووبكەن و ئـەم نـەبیت بـەریگر لـە بـەردەم قسمەت و نسیبی ئەواندا نەهاتنە داوای ئـەویش قـەدەری خوایـە و دەبیـت پیـی رازی بـین ، بـەلام ئەگـەر رازی نەبیت لە بەشودانی خوشكەكانی تری ئەوا ئەوانیش وەكو ئەمیان لیدیت و دەبـن بەقـەیرەو كیشەكە گەورەتر دەكەنەوە بۆیە دەبیت دایك و باوكی رازی بكـات بـۆ بەشـوودانی خوشـكەكانی تری بە فەخر و شانازیەوە .

٤- ریگەنەدان یان بەزۆر بەشوودان بەخزم و كەس و كار

ئەگـەر گـەنجیك بچیتـە داوای كچیـك لـە خـیزانیك و عەشـیرەتیكی تـر ئـەوا باوكـان رازی نـابن و نایدەن بەشوو بەلكو هەر دەیانەوی بیدەن بەخزم و كەس و كاری خۆیان .

هـەندی لـەباوكان زۆر لەكچـەكانیان دەكـەن بـۆ ئـەوەی شـووبكەن بـە فلانـەكەسـی خزمـی خۆیـان كچەكـەش رازی نـابیت ئەمـەش كـاتیكی زۆر دەخایـەنیت تـا وای لیدیـت كچەكـە دەچیتـە تەمـەنی قەیرەیی یەوە و داخوازی لەسەر نامینیت ئەمـەش پیچەوانـەی سـوننەتەكانی پیغەمبـەری خوایـە كە ئەمرمان پیدەكات راویژ بەكچان بكەین لەكاتی بە شوودانیان رایان وەربگریـن ئەگـەر كـچ بـوو بیدەنگی واتای رازی بوونەو ئەگەر بیوەژنیش بوو ئەوا قسەی خۆی دەكات بە رازی بوون یان رازی نەبوون .

پیویستە لەسەر باوكان لەخوا بترسن زۆر نەكـەن لەكچـەكانیان لـەكاتی شـوكردندا مەگـەر كچەكـە بەدوای كەسیكی خراپەكاردا بگەری و رازی نەبی بەكەسی چاك و پاك .

پێویستە لەسەر باوکان لەخوا بترسن زۆر نەکەن لەکچەکانیان لەکاتی شوکردندا مەگەر کچەکە بەدوای کەسێکی خراپەکاردا بگەڕێ و ڕازی نەبێ بەکەسی چاك و پاك .

٥- سوود بینبنی باوك لەکچەکەی بۆیە نایدا بەشوو

خەڵکی لادێ و گوند نشینەکان کچەکانیان بۆ ئیش وکار بەکار دەهێنن و بۆ شوانی یان ئیش و کاری تری کشت و کاڵی ئەمە لەکرێکاری تر باشترە بۆ ئەوان ئەگەر یەکێك بچێتە داوای کچەکانیان ئەوا بەچەند قسەیەك بەڕێیان دەکەن وەك ئەوەی دەڵێت : کچەکە هێشتا منداڵە ، مارە بڕاوە بۆ کوڕی مامی ، کچەکە ئێستا شووناکات دەیان عوزری تر .

بەلأم کچانی دانیشتووی شار مامۆستا بێت یان فەرمانبەر باوکان دەیانەوێت سوود لەموچەکەیان ببینن لە بەرامبەر ئەم چاکەیەدا دایاندەنێن و نایان دەن بەشوو پەنا بەخوا خۆ ئەگەر یەکێك بێتە داوای کچەکەیان بەچەند قسەیەکی دوور لەڕاستی لە چەواشەکاری بەڕێیان دەکەن لە ترسی ئەوەی کە ئەو سوودەی لە کچەکەی دەیبینی لە دەستی بچێ و نان بڕاو ببێت بەلأم ئەم بەخێوکەرە ئان ئەم باوکە ناوانێ بەم کردارەی کەوتوەتە بازنەی چەندین تاوانەوە **لەوانە** :

١.لەبەرامبەر چاکەی کچەکەیدا خراپەیەکی لەگەڵدا کردووە خوای گەورەش دەفەرمووێ (هل جزاء الإحسان إلا الإحسان)

٢.ئەم سوود بینینە بەم شێوەیە حەرامەو دروست نی یە چونکە بەزۆردو بەڵکو دەبێت تۆ کچەکەت بژێنی و بەخێوی بکەیت .

٣.دەبێتە هۆی مانەوەی کچەکەی و وێرانکردنی ژیانی و سیس کردنی گوڵی تەمەنی بەفرت و فێڵ و تەڵە کە بازی و تەماح .

٤.ئەم باوکە خۆی تووشی ستەم کرد لەنزیکترین کەسی کە کچەکەیەتی لەوانەیە خوای گەورە سزاکەی پێش بخات هەر لەدونیادا پێش ئاخیرەت – پێغەمبەری ئازیز دەفەرمووێت ( درووەی خوای لیبێت) ( واتقوا الظلم فإن ظلم ظلمات يوم القيامة). باوك دەتوانێت سوود لەکچەکی ببینێت بەڕێگەی ڕاست و دروست و بە حەلاڵی ئەگەر هەژار بێت و نەدار بێت هیچ ڕێگرێك نی یە لەبەردەمیدا ... دەتوانێت بەجوانی لەگەڵ کچەکەیدا ڕێك بکەوێ کە بەشێك لەڕاتبەکەی بدات بە ئەو ئەگەر شووی کرد ، ئەمەش هیچ شەرمەزاریەکی تێدا نی یە ، چونکە بارودۆخی گوزدرانی ماڵی باوکی دەزانێت ، بێگومان ئەگەر ئەمە بکرێت ئەوا هەر لەیەکەم کەسەوە کە دێتە داوای کچەکەی دەیدات بەشوو نای هێڵێتەوە ئەمەش لەگرێ بەستەکەدا دەکرێتە مەرج .

وە پێویستە لەسەر کچان کە بەئاشکرا لەگەڵ باوکیان قسە بکەن ئەم خاڵە هۆکاری بەشوو نەدانیانە . زۆر بەجوانی بڵێت باوە گیان لەبەر ئەوەی تۆ زۆر ماندوو بونت بەمنەوە چەشتووە وەك وەفایەك بۆ بەڕێزتان نیوەی موچەکەم دەکەم بەدیاری بۆ بەڕێزت .

## ( بەشی سێ یەم )

## ئەو هۆکارانەی تایبەتە بە خێزانەوە:

(١) زۆری ماردیی :

لەمەشدا هەموو بەشدارن دایك و باوك و خوشك و براکانی تریشی هەریەکە لەمان پشكێکی لەتاوانەکە بەردەکەوێت ئەگەر چی زۆر جار باوك لەهەموویان تاوان بارترە .

منیش دەڵێم هەندێك لەباوکان ماردیەکی زۆر دادەنێن لەسەر کچەکانیان بەو بڕوایەی مافی ئەویشی تێدایە دایك و منداڵەکانی تریش هەروەها بە تایبەتی لەهەندێ لادێ دوورەکاندا بەم شێوەیە هەموو رێك دەکەون لەسەر زۆریی ماردیی و لەوانەیە هەندێ لەباوکان وا بیر بکەنەوە لەم رێگەیەوە قەرزەکەیان بدەنەوە یان خانوویەك دروست بکەن ، لەمەش خراپ تر ئەوەیە هەندێ لەباوکان کچەکانیان دەفرۆشن هەروەك چۆن کەل و پەلْ دەفرۆشن بەت سەدان هەزار دینار ، یان دۆلار .....

بەلآم لە راستیدا ئەم ماردییە مافی ئەوکچەیە کەس بۆی نی یە هیچی لێ لابەرێ مەگەر بەرەزامەندی خۆی . ئەم ماردییە چەند کەم بێت هێند ئەم بەشوودانە پیرۆز و سەرکەوتوو دەبێت هەروەك دەبینین لە فەرموو دەیەکی پێغەمبەری ئازیزدا ( درووودی خوای لیبێت ) هاتووە کە دەفەرمووێت (أقلهن مهرا اعظمهن بركة) بەداخەوە هەندێك لەباوکان دەڵێن مارمیەکەی زیاد دەکەین تا بەچاوی سوکەوە سەیری کچەکەمان نەکات و تەلأقی بدات بێگومان ئەمەش شتێکی هەڵەیە ... من وا دەبینم زۆری ماردیی هۆکارە بۆ زۆرێك لەکێشەو گیرو گرفتەکانی تەنانەت جیابونەوەو تەلأقیش . چونکە مێردەکە تووشی قەرزاریەکی زۆر دەبێت و شەو و رۆژ بیری لێدەکاتەوە خۆ ئەگەر وا دەبنێن ئەم کورە دەیەوێت ژنەکەی تەلأق بدات لەبەر ئەم هۆکارە ئەوا تەلأقی نادات مەگەر زۆر بێزار بێت و لەو هاوسەرییەی بەتایبەتی لەم سەردەمەدا دەیان پیلان و تەڵەکەبازی و درۆکردن هەیە.

ئەوەی وتویەتی:( ئەگەر دەستی ریزت لەریزداران نا ریزت دەگریت ئەگەر ریزت لەناکەس گرت لیت یاخی دەبیت ) راستی ووتوە.

پیویستە لەسەر کچان باوکیان رازی بکەن بەوە کە مارەیەکەیان کەم کەنەوە مەگەر کەسیک زۆر دەولەمەند بیت و بلیت مارەیی لای من شتیکی پلە دووەو ئەوەی گرنگ بی لام چاکی کچەکەیە .

(٢) مارەیی دووەم دیاری و هۆلی ئاهەنگ گیران :

ئەمەش ئەرکیکی ترە لە بەر دلی خەلکی و چاولیکەری وەك کۆکردنەوەی خەلکی لەباشترین هۆلی ئاهەنگ گیران و دابەش کردنی دیاری بەسەریاندا خواردنیکی باش و تیپی مۆسیقاو گۆرانی و دەیان شتی لاوەکی تر کە ئەرکەکە لە شەر شانی کورە قورس دەکات بەبی گوی دانە زیادەرۆیی و بەفیرۆ دان . ئایا تۆ دەتەوی خوا رازی بکەیت یان نا؟ ئایا ئەمە حەلالە یان حەرام ؟ ئایا ئەمە سوننەتە یان بیدعەو داهینراو؟ یایا کورە دەتوانیت یان نا؟ هەموو ئەمانەیان بەلاوە گرنگ نیە و خۆیان ناکەن بەخاوەنی بۆچی ؟ لەبەر ئەوەی رەچاوی باو و داب و نەریت دەکەن یان ئەوەی ئەم کارانە دەکەن ژنانن یان مندال و هەرزەن بەلگەیان تەنها ئەوەندەیە خەلکانی تر وا دەکەن یان دەلین چی لە کچی خەلکی کەمترە.؟

(٣) داب و نەریت وایە شوکردنی کچان دوابخریت :

ئەم داب و نەریتە سەرەتا لای هەندی خیزانە موسلمانەکان دروست بوو پاشان بلاو بوەوە وردە وردە بوو بەداب و نەریت و نەوە لەدوای نەوە لەگەل خۆیاندا هینایان تا وای لیهات گەورەو بچوك ژن و پیاو پیی ئاشنا بوون و بووبە بەشتیکی ئاسایی و باو لایان .

٤-خراپی ناوبانگی خیزان:

دەکری باوك بەناوبانگ بیت بەهەندیك تاوان و (کاری خراپ) یان یەکی بیت لەوانەی کەتووش بووبیت بەبەکارهینانی ماددە سرکەرەکان یان ماددە بیهۆش کەرەکان یان بەزۆری لەسجن دا دا تەمەنی بەسەر بردبیت ،یان یەکی لەمندالەکانیان بەناوبانگ بیت بەیەکیك لەوانەی باسمان کرد یان خەریکی کاری لیواتەو زیناکردن بیت لەهەموو ئەمانەش خراپ تر ئەوە دایکیان خەریکی ئەم جۆرە کارانە بیت .و بۆ ئەمەش زۆر لەمال دەربچیت ، یان هەلسووکەوتی باش نەبیت لەگەل خەلکی.

بیگومان ئەمانە کاریگەری خراپی دەبیت لەسەر کچەکانیان چونکە کچ زۆرتر هەلسووکەوتی لەگەل دایکی دایە خەلکیش پرسیار لەدایکی دەکەن لەرووی سرشتی مامەلەکردنی وسومعەو رەوشت و چۆنیەتی پەروەردەکردنی مندالەکانی بۆیە لەناو خەلکی دا باوە دەلین(دایك ببینەو دۆتە بخوازە) بیگومان ئەم خالانەی سەرەوە کاریگەری دەبیت لەسەر ناوبانگی خیزانەکەو

بێگومان ئەمانە کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر کچەکانیان چونکە کچ زۆرتر هەڵسووکەوتی لەگەڵ دایکی دایە خەڵکیش پرسیار لەدایکی دەکەن لەرووی سرشتی مامەڵەکردنی وسومعەو رەوشت و چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵەکانی بۆیە لەناو خەڵکی دا باوە دەڵێن(دایك ببینەو دۆتە بخوازە) بێگومان ئەم حاڵانەی سەرەوە کاریگەری دەبێت لەسەر ناوبانگی خێزانەکەو پاشانیش ئەوانەی دەچنە داوای کچان زۆر سوورن لەسەر پاراستنی ئابروویان و توخنی ئەو جۆرە خێزانانە ناکەون بەهیچ شێوەیەك.

(زەرەروزیانەکانی قەیرەیی کچان)

ئەگەر لەماڵدا کچێ یان چەند کچێکی قەیرە هەبوو بێگومان زەرەرو زیانی دەبێت بمانەوێت یان نەمانەوێت ئەم زەرەروو زیانەش بەپێ ی حاڵەتی کچەکانە.

لەوانەیە باوەڕی لاواز بێت و شەرمی کەم بێت یان لەوانەیە بەپێچەوانەوەبێت باوەڕی بەهێزو زۆربە شەرم و حەیا بێت هەمووڵایاکیان تووشی زەرەروو زیان دەبن دەڵێن چۆن؟!

(١) کچی یەکەم:

بەهۆی لاوازی ئیمان باوەڕو کەمی شەرم و حەیا وخۆجوان کردن و زۆر چونە دەرەوە و خۆخستنە ڕوو وەك ئەوەی بڵێ ی من فلانی کچی فلانم .باوکم بەشووی نەداوم تاوەکوئێستا.. ئەگەرچی لەسەرەتاوە کاری فاحیشەوخراپە بەخەیاڵی دا نەهاتووە بەلام بەهۆی زۆرچوونە دەرەوە و خۆجوان کردن و خۆ بۆن خۆش کردنەوە باری ئیمانی زیاتر لاواز دەبێت وشەرم وحەیای لاهەڵدەگیرێ و خۆی تووشی فیتنە دەکات یان خەڵکی تووش دەکات.

بەتێپەڕ بوونی کات خۆی تووشی بەد ڕەوشتی و زینا دەکات و تاوانی ئەو زینایەش دەگرێتە ئەستۆ کەخوای گەورە لە لەگەڵ هاوەڵ قەراردان بۆخۆی داباسی کردوە، لەوانەیە ئەم تاوانە بکەوێتە گەردنی باوکیشی چونکە هۆکارێك بوود لەمانەوەیدا و بەبەرچاوی ئەوەوە دەرۆیشتە دەرەوە لەماڵ بەو شێوەیە ئەویش لێ ی بێدەنگ بوو.

(٢) کچی دووەم :

باوەڕی بەهێزو بەشەرم و حەیایە. سروشتیە کەوەك کچێ پێشوو هەڵسوو کەوت نەکات. کەواتە ئەم زەرەروو زیانەکانی چیە؟!

لەبەربەهێزی بیرو باوەڕو زۆری شەرم وحەیا هەرچی لەناخ و دڵ و دەروونی دابێت لەغەم و هەم دەری نابڕێ .

زەرەروو زیانەکانی .کاتێ دەبینێت ئێواردو بەیانی هاورێکانی کەلەتەمەنی ئەودایە هەریەکە چوار منداڵ و دوو منداڵ یان هەیەو ئەویش تائێستا شووی نەکردووە و ئیمان و باوەڕەکەشی ڕێگای پێنادات باسی بکات چونکە کچان لای ئێمە شەرمە داوا لەباوکیان بکەن بیان دەن بەشوو. بۆیە تووشی خەمۆکی و نەخۆشی نەفسی و لاشەیش دەبێت .لەوانەیە بیدات بەزدوی دا و نەتوانی لەسەر پێیەکانی خۆی ڕابگرێ هیچیشی بێ ناکرێت جگەلەوەی دەستەکانی بەرز بکاتەوە بۆلای خواو بلێ "حسبي الله ونعيم الوكيل"

لەوانەیە دووعا لەباوکی بکات ئەگەر بەخێوکەر و سەرپەرشتیاریەتی بەئاشکراو بەنهێنی چیرۆکیش دەربارەی کچی قەیرە زۆرە لەوانە چیرۆکی شێخ محمد کوری عوسەیمن ورۆزیکی تر لەزانایان دەیگێڕنەوە پیاوێك کچەکەی نادات بەشوو تادەگاتە تەمەنی ٢٧ ساڵی کچەکە تووشی نەخۆشی نەفسی و لاشەیی دەبێت تائەو ڕادەیەی دەیخات لەجێگەدا . کاتێ هاتە سەرەمەرگ ئەم بەسەزمانە ووتی – کوا باوکم ؟ باوکی هات پاشان کچەکە ووتی باوە دووعایەك دەکەم بلێ ئامین . ووتی ئامین کچەکە ووتی جارێکی تریش بلێ ئامین جارێکی تریش ووتی ئامین هەتا چوار جار پێ ی دووبارە کردەوە ئەوجا کچەکە ووتی خوای گەورە بەهەشتت لێ حەرام بکات وەك چۆن لەهاوسەرگیری بێ بەشت کردم .پاش ئەم قسەیە کچەکە مرد.

هەندێك قەیرە کچانی تریش لەسەرەمەرگدا بەباوکیان ووت .من وتۆ لەبەردیوانی خوای گەورەدا ڕامان دەگرن لەڕۆژی قیامەتدا من لێت خۆش نابم چونکە ئەمت دا بەشوو.

ئایا باوکان ناترسن لەدوعای ستەم لێکراو کەپێغەمبەری خوا ئاگادارمان دەکاتەوە دەفەرمووێ (وأتق دعوة المظلوم فإنه ليس بينها وبين الله حجاب) پەنا دەگرین بەخوا لەتەوەدی . پەنا بەخوا لەستەم و دووعای ستەم لێکراوان .داوای لێخۆش بوون دەکەین لەوەی کەکردمان پەنا بەخوا دەگرین لەو ئەمانەتە گەورەیەی بەسەرشانمانەوەیەو بریتی یە لە منداڵەکانمان "هەرخوا بیسەروو وەلام دەردەوەی دووعاکانە"

﴿نووسینی / حەمەد کوری عەبدوڵا دووسەری بەدەستکاریەوە﴾

## چیرۆکەبەئازارەکانی واقع

ئەو کچە بەستەزمانە پەیوەندی نێوان کوڕ و کچی لەڕێی کەناڵە ئاسمانیەکانەوە زانی .بۆیە هەر کە کەس و کاری دەنووستن ئەو هەڵدەسا بۆتەماشاکردنی ئەوەی کەخوا حەرامی کردووە لەدیمەنی

ڕووتــی و بــەردلایی لەبەرنامــەی کــەناڵی بــێ ئابروەکانــەوە، کــە ئارەزوەکــان دەوروژێنـــێ ، بەتێیەڕبوونی کات کچە خۆی پێ نەگیرا ئەوە بوو هاودڵ و خۆشەویستێکی پەیداکرد بۆ دەرخستنی ئەوەی کەلەناخی دا قوڵ دەدات .بۆیە ویستی بچێتە ئەم تاقی کردنەوەیەوە ڕۆژێکیان گەنجێکی ناسی ئەردگەری گورگ و لەبینستی مرۆڤدا کەبەزەیی نازانێ ئەمەش تیکەیەکی چەور بوو بۆیەوە لەم ڕۆژگاردی خۆشماندا لەم کەسانەزۆرن ئەم کچە بەسەزمانە دەبێ چی لێ بەسەربێ !؟

بێگومان ئەوەی بێگومان لەدەست دانی کچێتی و سك پڕبوون بەمنداڵێك ،دوای چیرۆکێکی دوور و درێژی پڕ ئازار.!...!!!

باس ئەوەی دەست گیر دەکرێن لەلایەن پیاوانی ئاسایشەوە ناردمیان بەدوای باوکی کچەکەدا بۆ ئەوەی کاردساتی کچەکەی بەچاوی خۆی ببینێ!!

باوکە ڕاوەستا لەبەردەم کچەکەیدا و هیوای دەخواست کەبمردایە پێش بینینی ئەم کارەساتە .هاواری کرد لەبەردەم سەرجەم پیاوانی ئاسایش دا ..وازم لێ بێنن !بابیکوژم!! ئابرۆی بردین ، شەرەف و ناموسی بۆ نەهێشتین . ڕووی ڕەش کردین لەبەردەم خەڵکیدا!!!

لەم کاتەدا کچەکە سەری بەرزکردەوە ووتی باوکە تۆ هۆکاربوویت سەتەلایتێکت هێناوەتەوە ماڵەوە بێ ئەوەی چاودێری بکەیت وەك ئەوەی کەبێ ئەخلاقێت هێنابێتە ماڵەکە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەیت تۆهۆکاربویت لەهەموو ئەوانەی ڕووی دا لەمن .ئێستاش دەگریت بەسەر من دکچیی و پاکێتی مندا!

## ئەوشریتە ڤیدیۆییەی کەژیانی ویران کردم

کچێك لەقۆناغی زانکۆ لەکۆلێژی ئاداب . بەشی دەروون ناسی سێ خووشکی هەیە یەکێکیان دەخوێنێ لەقۆناغی دواناوەندی و ئەو دوانەی تریشیان لەناوەندی دەخوێنن... باوکیشیان وورده

فرۆشە لەهەوڵی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵیدایە ... ئەم کچە لەخوێندنەکەی دا زۆر سەرکەوتوود ، ناسرابوو بە بەڕەوشتی بەرزوو قسەی خۆش وسەرجەم هاوڕێ کچەکانی خۆشیان دەویست و حەزیان بەلێ نزیك بوونەوەی دەکرد چونکە کەسێکی سەرکەوتوو بوو .

ئەم کچە لە چیرۆکەکەیدا دەڵێت:

رۆژێ لە ڕۆژان لەدەرگای دەنیشگا هاتمە دەردوە کوڕێك بەکەل و پەلێکی ڕێك و پێکەوە هاتە بەردەمم . واسەیری دەکردم وەك ئەوەی بمناسێت هیچ گوێم پێ ی نەدا .بەدوامدا هات و هەندێك قسەی منداڵانە لەبەر خۆیەوە دەکرد وەك ..ئەی کچی جوان.....ئەمەوێ بتخوازم ...ماوەیەکی زۆرەچاودێریت دەکەم دەزانم کچێکی بەڕەوشت وئاکاری .... منیش پەلەم کرد لەڕۆیشتن قاچم بەیەکدا دەهات ئائەو ڕادەیەی خەریك بوو بکەوم ئارەقێکی زۆرم کرد چونکە یەکەم جاربوو تووشی ئەم هەڵوێستە ببم .گەیشتمە ماڵەوە وە زۆر هیلاك و ماندوو شەکەت بووم. ئەوشەوە تا بەیانی نەنوستم لەدووودڵی و لەترسانا.بۆڕۆژی دووەم کەدەرچووم لە زانکۆ بینیم چاودێرم دەکات لەبەر دەرگا بەڕوویەکی گەشەوە ئەم حاڵەتەدووبارە دەبوەوەتاوای لێهات نامەیەکی بچووکی فڕێدایە بەردەم دەرگای ماڵەوە .سەرەتا دوودڵ بووم لەهەڵگرتنی بەلام لەدوایدا هەڵم گرت دەستەکانم دەلەرزی ، کردمەوەو خوێندمەوە.پڕی بوو لەقسەی خۆشەویستی و داوای لێبوردن لەو شوێن کەوتن و ڕێگە لێگرتنەی.

نامەکەم دڕاند فڕێم دا پاش چەند کاتژمێرێك تەلەفۆن لێ ی دا و هەڵمگرت ئەو گەنجە بوو کەشوێنم دەکەوت بەقسەی جوان پێ ی ووتم نامەکەت خوێندەوە یان نا؟

ووتم بێ ئەدەب ئەگەر وازنەهێنی ماڵەوە ئاگاداردەکەم و ئەوجا خۆت دەبینیت. پاش سەعاتێکی تر تەلەفونی کردەوە .. دووبارەی دەکردەوە کە مەبەستی پیاوانەو شەریفەو. ئەیەوێت بیخوازێت و زۆر دەوڵەمەندەو کۆشکێکی بۆدروست دەکات وهەموو هیواو ئاواتەکانم بۆدێنێتە دی هەرخۆیەتی و کەسو کاری نەماوە و....و.....و.....و....

دڵم نەرم بوو دەسم کردە قسەکردن لەگەڵیدا وورده وورده چاودێری تەلەفۆنەکانیم دەکرد هەمووکات هاوچاویم دەکرد کەلە زانکۆ دەهاتمە دەردوە بەلام هیچ سوودێکی نەبوو تارۆژێك لەکۆلێژ هاتمە دەرەوە هاتە بەردەمم لەخۆشیاندا خەریك بوو بفڕم .بەوشێوەیە ئیتر دەردەچووم لەگەڵیدا بەئۆتۆمبیلەکەی هەموو شار دەگەڕین واهەستم دەکرد هەموو ئیرادەیەکی لێ سەندووم دەستە وەستان بووم لەبیرکردنەوە وەك ئەوەی دڵی لەلاشەم دەرکردبێ هەرچی دەووت بڕوام پێدەکرد بەتایبەتی کاتێ دەیوت دەبیت بەهاوسەرم ولەماڵێکی قەشەنگ ژیان بەسەردەبەین...

بڕوام پێدەکرد کاتێ دەیوت خۆشتمەوێ ئەمیردەکەم... کاتێ ئەم قسانەی دەکرد خەیاڵم دەفڕی بێ

سنور. رۆژێ لەرۆژان نای چی رۆژێکی رەش بوو ...کەژیانی کاول کردم داهاتوومی لەناوبرد رسوای کردم لەبەردەمی هەموو خەلکی دا.

رۆژێك هەروەکو رۆژانی تر لەگەلێدا دەرچووم بردمی شوقەیەکی داخراو چوینە ژوورەوە دانیشتین ولەبیرم چوو کەشەیتان سێ یەمی ئەو ژن وپیاودیە کەبەتەنها بن لەشوێنێکا . بەلام شەیتان دلمی ناوددان کردەوە دلی پرکردم لەقسەی ئەو گەنجە. دانیشتم سەیریم دەکرد و سەیری دەکردم پاشان باوەشمان لەیەك دا بێ ئاگابووم کاتێ بەخۆم زانی بوومە نیچیری ئەو گەنجە و بەنرخترین شتی خۆمم لەدەست دا. هەلسام وەکو شێت و پێم وت چیت لێ کردم ؟

•ووتی مەترسە تۆ ژنی منی

•ووتم چۆن من ژنی تۆم نیمە گرێ بەستی هاوسەری مان لەنێوانماندانیە..

•ووتی بەم نزیکانە گرێبەست ئەنجام دەدەین .

رۆیشتمەوە بۆمالێ .بەملا و لادا دەکەوتم قاچەکانم لەدوام نەدەهات وام دەزانی لاشەم ئاگری تێ بەربووە. خوایە چیم بەخۆم کرد؟ من شێت بووم.... چیم لێ هاتووە... دنیا لەبەرچاوم تاریك بوو ..دەستم کرد بەگریان گریانێکی زۆر. وازم هێنا لەخوێندن حالم زۆر خراپ بوو تائەوپەرێ . ئەم هێشت کەس پێم بزانێ لەکەس وکار .تەنها هیوایەك کەمابوو بەلێنەکەی بوو کەبم خوازێت رۆژگار رۆیشت و منیش رۆژێکم بەسالێك لی دەرۆیشت ....

چی رووی دا دوای ئەمە ...

ئەو شتە سەرسورهێنەرە روویداکە ژیانی ویران کردم ... زەنگی تەلەفۆن لێیدا دەنگی لەدوورەوە دەهات ووتی دەمەوێت چاوم پێت بکەوێت بۆشتێکی گرنگ ... دلم خۆش بوو هەلێ هەلم لێ دا گومانم برد ئەوشتە گرنگە جۆرکردنی کاری ژن هێنانەکەیە.... کەبینیم... نیشانەی دلێ رەقی بەدەم و چاویەوە دیاربوو... دەستی کرد بەقسەکردن و وتی پێش هەموو شتێ بەهیچ شێوەیەك بیر لەکاری هاوسەرگیری مەکەرەوە. ئەمەوێت بێ کۆت و بەند پێکەوە بژین..

دەستم بەرز کردەوە هەتا توانیم زلەیەکم لێدا . ئەگەر چی ئاگر لەچاوەکانی دەباری ووتم وام زانی هەلەکەت راست دەکەیتەوە بەلام دەرکەوت تۆ پیاوێکی بێ قیمەت و بێ رەوشتی دابەزیم لەسەیارەکەو بەچاوی گریانەوە رام کرد. بانگی کردم و وتی لەسەرخۆ بێزەحمەت.. شریتێکی ڤیدیۆیم بەدەستیەوە بینی بەرزی دەکردەوە .بەگالتە جارێ و بەدەنگێکی بەرزەوە وتی: وێرانت دەکەم بەم کاسێتە... ووتم چی تێدایە ووتی بابچین بزانین چی تێدایە، دەبێت بە موفاجەئەیەك بۆت . چوم لەگەلی بۆبینینی کاسێتەکە بینیم ئەوەی بەیەکەوە ئەنجامان دابوو بەحەرامی هەمووی تێدا تۆمار کراوە.

ووتم چیت کردووه ئەی ترسنۆك ... ئەی بێقیمەت...
ووتی چەند کامێرایەکی شاراوە هەموو شتەکانی تۆمار دەکرد. وەئەم کاسێتە چەکێکەبەدەستمەوە بۆلەناوبردنت ئەگەر بەگوێم نەکەی ... دەستم کرد بەگریان چونکە کێشەکە بەتەنها کێشەی من نەبوو بەڵکە کێشەی خێزانێك بوو ... بەلأم کاسێتەکەی نەدامێ .... بەوشێوە بووم بەئەسیرو و دیلی ، ئیتر ئەو هەر ڕۆژە دەیدامە دەستی زەلامێ و کرێکەی وەردەگرت کەوتمە ئەو داوەوە ژیانم بوو بەکاری داوێن پیسی خێزانەکەشم هیچ بەم کردەوە نەدەزانی بەڵکو متمانەی تەواویشیان پێم بوو.
کاسێتەکە بلأو بوویەوە ... کەوتە دەستی کوری مامم کێشەکە تەقیەوە باوکم و هەموو کەس و کارم بەکێشەکەیان زانی بلأ و بویەوە تاهەموو کەسی ناوچەکە زانیان نابرۆ و حەیای خێزانەکەمان چوو..... هەلأتم و چووم بۆشوێنێکی نادیار تالەبەرچاوی خەلکی نەبم باوکم و براکانم وولأتیان بەجێ هێشت کاسێتەکەشم گەنجان دەستاو دەستیان پێ دەکرد ئەو بێ قیمەتەش چۆن ویستی ئاوای پێم کردم منیش هیچم پێ نەکرا ، هەرئەوگەنجە دەیان ماڵی بەم شێوە وێران کرد ، گوڵی تەمەنی دەیان کچی گەنجی هەڵوەراند بۆیە بڕیارمدا تۆڵەی لێ بکەمەوە.
ڕۆژێ لەڕۆژان هات بۆلام سەرخۆش بوو زۆری خواردبوەوە هەلەکەم قۆستەوە چەقۆیەکم کرد بەسەر دلێدا خەلکیم لە دەست کردارە ناشرینەکانی ڕزگار کرد.داهاتووی خۆشم ئەوەبوو لەسجندا تالێ سەرشۆڕی و بێ بەری بوون لەژیان دەچێژم زۆر پەشیمانم لەو کردەوانەی کەکردم لەوژیانەی بەسەرم برد.
هەرکاتێ ئەو کاسێتەم بیر بکەوێتەوە وەدەزانم لەهەموو شوێنێکدا کامێرا بەدوامەوەیە.
ئەم چیرۆکەم نووسیەوە تاببێتە وانەوپەند بۆ هەموو کچانی کەدووای قسەی بریقەدارو نامەی ڕەنگاو ڕەنگ و ڕازاوە و بەناو خۆشەویستی نەکەون ئاگاداربە ...خوشکم لەتەلەفۆن....ئاگاداربە.....
خوشکەکەم ژیانی خۆمم خستە بەردەستت کەکۆتایی بەچی هات . خێزانەکەمان چۆن وێران بوو. باوکیشیم لەداخاندا مرد پێش مردنیشی بەردەوام ئەمەی دووبارەدەکردەوە ( حسبی الله ونعم الوكيل) ...... من لێت خۆش نابم هەتاڕۆژی قیامەت چەند گران بوو ئەو وشەیەی : بەڕاستی ژیانم وێران کردە بە دەستی خۆم گیانی خۆم کێشا .
ئەم ڕووداوە شێخ ئەحمد ی کوری شێخ عەبدول عەزیز حوسەین باسی کردوە لەنامیلکەیەکی بچووك دا بەناونیشانی ( شريگ فيديو الذى دمر حياتى) ئەم ڕووداوە لەکۆمەلگایەکی موسلمان و

دەوڵەتێکی ئیسلامی ڕووی داوە . ڕووداوێکی واقیعی یە ئەو کچە بەسەزمانە بەقسەی ئەو گەنجە بێ ڕەوشتو نەخلاقە دەبێتە قوربانی و خۆی و خێزانەکەشی تیا دەچێ .

ئەم ڕووداوە لەساڵی (١٤٠٨ﻫ) ڕویداوە شێخ ئەحمد دەڵێت کوڕی مامی ئەم کچە بۆی گێڕامەوە ، زۆر داخی دەخوارد کەچۆن حەیاو ناموسی خێزانەکەیان چوو بەهۆی هەڵەشەیی ئەم کچەوە ئەم ڕووداوەش یەکەم ڕووداو نیە لەو جۆرە بەڵکو لەخێزانی زۆر گەورەدا شتی وا ڕووی داوە ......

نای کەچەندەها کچ کوژراوە بەهۆی ئەم جۆرەکارانەوە.... یان خۆیان کوشتووە..... یان دواجێگەیان نەخۆشخانەی دەروونی و عەقڵی بووە.

ولاحول ولا قوة إلابالله العلي العظيم

## یادەوەریەکانی پیرەژنێك لەگەڵ خۆشەویستەنا پاکە کەی دا:

پیرەژنەکەی هاوسێمان لەبەر پەنجەرەکەوە وەستابوو فرمێسکی حەسرەت بەچاوانیدا خوَن خوَن دەهاتە خوارەوە. چاوەکانی داخست بوو وە لەناو دڵە پر لەزووخاوەکەی هەناسەیەکی پر لەپەشیمانی حەشاردابووو.

لەپەنجەرەی ماڵەکەیەوە سەیری ئەو ئاهەنگی ژن گواستنەوەی دەکرد کەلە کۆڵانەکەیاندا بوو. ئاخۆ ئەم ئاهەنگە چەند دڵ گرانی کردبێت. پیرەژنەکە لەگەڵ سەیرکردنی ئەم ئاهەنگە بیرو هۆشی گەڕایەوە سەردەمێکی ڕابردووی دوور.ئاخۆ ئەم پیرەژنە لەلاویدا چەند جوان و سەرنج ڕاکێش بووە. لەوکاتەدا ئاواتی دەخواست کە ئەمیش ئێستا خاوەنی پیاو و خێزان و ماڵ بێت بەڵێ ئاواتی بۆ ئەمانە دەخواست.

بەڵام کاتێ بەئاگا هاتەوە گەڕایەوە بۆ ئەو بارو دۆخە تاڵەی ئێستای. جارێکی تر لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی جل و بەرگی بوکێنی بوکەکەی کرد. بیری هاتەوە کەچەند کەچەند گۆڤارەکانی پەرە پەرە دەکرد و بەدوای ئەو جل و بەرگەدا دەگەڕا کەبەشایەنی خۆی دەزانی. بۆیە چاوەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و فرمێسکی گەرم کەوتە خوارەوە کەلەگەرمیدا گۆناکانی سوتاند.

بیرەوەریەکانی گەڕایەوە بۆ ڕابردووی سەرلەنوێ بیری لەوە دەکردەوە کەبووە هۆی هەموو ئەم مەینەتی و خەم خەفەتە بۆی.

بیری لەو ڕۆژەدەکردەوە کەبەهاربوو. باوکی و دایکی و خوشکە بچووکەکەی لەماڵ دەرچوون بۆ بازاڕ. ئەم نەچوونە لەگەڵیاندا. لەم کاتەدا زەنگی تەلەفۆن لێیدا ... ئەمیش بەپەلە هەڵی گرد.... هاوڕێکەی بوو قسەی لەگەڵ کرد کەبانگی کردبوو بۆ دەچوونێکی کورت و گەڕان بەناو بازاڕدا.

بەبێ دوو دڵی ئەمیش ڕازی بوو.

کچەکەی هاوڕێی هاتوو پێکەوە ڕۆیشتن ... لەڕێگا کەوتنە قسەکردن. هاوڕێکەی لێی پرسی. ئایا هاودڵی کورت هەیە ( یۆی فرێند)؟!!!

ئەمیش زۆر بەدڵ پاکی ووتی : چۆن ئاپاکی بەرامبەر ئەو متمانەیە دەکەم کە کەس و کارم بەمنیان داوە!!!

هاوڕێکەی ووتی : ئەوە قسەیەکی کۆنە و نامەوێ بیبیستم.

تارۆژیکیان پارچە کاغەزیکی هەلگرد کەیەکیك لەو گەنجانە بۆی هەلدا . بینی ژمارەی تەلەفۆنەکەی تیدایە . هاوری کچەکەی پیرۆزبایی لیکرد بۆ دروست بوونی ئەم هاوری تازەیە

بەلام ئای نەی زانی ئەم هاوری تازەیە چ گورگیکە

سەردان و گەران تەواو دەبوو هەردوو کچەکە دەگەرانە مالەوە

بەلام ویژدانی ئەم زۆر ئازاری دەدا

لەم کاتەدا تەلەفۆنیکی بۆکرا . کی بوو ؟ هاوری کچە شوومەکەی بوو .. کەبەم شیوەیە کەوتنە گفتوگۆ :

کچەکە: چۆنی ؟

هاوریکەی : تائیستا پەیوەندیت نەکردووە بەهاوری کورەکەت؟

کچەکە : نەخیر ناتوانم!

بەلام دوای چەند جار هەولی کچەکەی هاوریی خۆی دا بەدەستەوە و پەیوەندی کرد بەکورەکەوە بەتەلەفۆن

گفتوگۆکانیان لەسەرەتاوە کورت بوو بەلام دووەم جار زۆرتر بوو ئەوە سی یەم جار کۆتایی هات بەدانانی مەوعیدیك لەگەل یەکتریدا کچەکە چوو بۆ بینینی کورەکە لەکاتی دیاری کراودا بەلام ( خۆزگە نەچووبایە). بەناموس و سەربەرزی و شەرەفەوە رۆیشت بەلام کاتی گەرایەوە ناموس و شەرەفی لەدەست دا .

تازە چی بکات؟ بەکەس و کاری چی بلیت ؟ وەچی بەدایك و باوکی بلیت؟ رۆژو مانگ رادەبوورد پاش ماوەیەك هەستی بەجوولەیەك کرد لەسکیدا . ئەی خوایە گیان ئەم جوولەیە بەرهەمی ئەو هەلەو تاوانە یە بەرهەمی ئەو زینایەیە کەکردم . لەترس حەیا چوون ناچار بوو لەمال رایکرد.

رۆژو مانگ رابورد تاکاتی مندال بوونی هات.

چوو بۆلای ئافرەتیکی شارەزا لەمامانی بۆ ئەوەی لە مالدا مندالەکەی ببیت چ مندالیك ؟ مندالیك لەزینا لەویش رایکرد و منالەکەی لەباش خۆی بەجی هیست ئەو کاتەدا بریاری دا پەیوەندی بکات بەکورەکەوە کە بووە هۆی ئەم مەینەتی و بەردلا ییە بۆی. پەیوەندی کرد بەلکو خۆشەویستەکەی رزگاری بکات !! کورەکە بەپیکەنینیکی گالتە جاریەوە . تەلەفۆنەکەی بەسەردا داخست ، چونکە ئەم یەکەم کچ نی یە کە لو مندالی ببیت بەریگای زینا

ئەی ئیتر چی بکات ؟؟!! خۆ خۆشەویستەکەی گالتەی پی دەکات .

بۆیە بەناچاری پەنای بردە بەر سوال کردن.

ودلەکاتی وون و بوون و دیار نەمانی لەماڵی خۆیان باوکی هەواڵی وون بوونی دا. بۆیە دۆزرایەوەو خرایە بەندیخانەی چاکسازیەوە لەبەندیخانە دەرچوو پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتە سی ساڵ .
دەستی کرد بەکاری بەرگ دووری و بەتەنیایی مایەوە بەدرێژایی ئەم هەموو ساڵە دوای ئەوەی کەس و کاری دەستیان هەلگرد .
فرمێسك یەك لەدوای یەك لەچاوی ئەم پیرەژنە لاوازە دەکەوتە خوارەوە ، کاتێ سەیری جل و بەرگی بووکەکەی دەکرد. وەیادی ئەو هەموو بەلێنانەی دەکردەوە کە خۆشەویستە درۆزنە تەڵەکە بازەکەی پێیدابوو ..
دنیا لەبەرچاوی دەسوڕا هەل هەلەی شایی و ئاهەنگ گێڕان و هاوارو گریانی ئەم تێکەل بووبوو.
دوای هاوارێکی خوێناوی کەوتە سەر زەوی ، هاوارە دەکرد و دەیووت ( بەزەیی ئەی پەروەردگار بەزەیی ئەی پەروەردگار). پاش ماوەیەك پیرەژنەکەی هاوسێمان مرد
نێژرا بەبێ ئەوەی چاوێك هەبێت بۆی بگری و فرمێسکی بۆ برێژێ .
بێبەش کرا لەو ژیانە هاوسەریە ئارامە.
بێبەش کرا لەمناڵ و سۆزی و بەزەیی دایکایەتی.
بێبەش کرا لە ووشەیەك کە گەورەترین ووشەیە .. ووشەی (دایە).
بێبەش کرا لە هەموو ئەم شتانە تەنها لەپێناوی بەیەك گەیشتن . بەڵێ تەنها لەپێناوی تام و چێژێکی چەند خولەکی . جاتۆی میهرەبان بەزەییت پێدا بێتەوە ئەی پەروەردگاری بەخشندە تازە ئەم ژیانی دونیای دۆڕاند و لەدەستی چوو . بەلاّم باژیانی قیامەت و دواڕۆژی نەدۆڕێ و لەدەست نەچێ .
جا ئەی خوشکی بەڕێزم بەراورد بکە لەنێوان سەنگی ئەو دۆڕان و لەدەست دانە کە تووشی ئەم پیرەژنە هات ،کاتێ بە پێی خۆی چوو بۆی ئەو هاوڕێ ناپاکەی .
ئەم بەیەك گەیشتنە قەدەغەکراوە . تام و چێژی خۆش هەموو ژیانی لێ قەدەغەکرد بە درێژایی هەموو تەمەنی وە هەموو شتێکی دۆڕاند.
لەکۆتاییدا ئەی کچی خۆم دەڵێم : بەختەوەری ئەوەیە کە پەند و ئامۆژگاری لەژیانی کەسانی تر وەربگریت وەئاگادار بە لەهاوڕێی خراپ!!!!
وەلەفەرموودەیەکدا پێغەمبەر( دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمێ( وێنەی هاوڕێی چاك وە هاوڕێی خراپ، وەك هەلگریبۆنی میسك ،و ئەو کەسەی لەکورەی ئاسنگەر کادەکات وایە هەلگری

لەکۆتاییدا ئەی کچی خۆم دەڵێم  بەختەوەری ئەوەیە کە پەند و ئامۆژگاری لەژیانی کەسانی تر وەربگریت... وەئاگادار بە لەهاوڕێی خراپ!!!!

وەلەفەرموودەیەکدا پێغەمبەر( درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمێ( وێنەی هاوڕێی چاك وە هاوڕێی خراپ، وەك هەڵگری بۆنی میسك .و ئەو کەسەی لەکورەی ئاسنگەر کاردەکات وایە  هەڵگری میسکەکە یا بەشت دەدات یالێ ی دەکڕی یاهەر هیچ نا بۆنێکی خۆش ی لێ هەڵدەمژی. وە ئاسنگەرەکە یاجلەکەت دەسوتێنێت یان هیچ نەبێ بۆنێکی ناخۆشی لێوە هەڵدەمژی)

## بەلاّم شەیتان چوارەممان بوو

(ابوعبدالله) ووتی: بەڕاستی نازانم بەچ شێوەیەك و چۆن ئەو چیرۆکە و ڕووداوەت بۆ بگێڕمەوە کەماوەیە پێش ئێستا بەسەرمدا هات . ئەو چیرۆکەی ڕێڕەوی هەموو ژیانی گۆڕی ، لەڕاستیدا نیازم نەبووە کەپەردەی لەسەر هەڵ ماڵم و باسی بکەم . بەلاّم کاتێ ناخم دەبزوێت و هەست بەبەرپرسیارێتی دەکەم بەرامبەر بەخوای گەورە ..... وەبۆ ئەئاگا هێنانەوەی ئەو گەنجانەی کە لە خوای خۆیان یاخی دەبن. وە بۆ ئەو کچە جوانانەی کە بەدوای خەیاڵێکی درۆینە دا دەکەون و بەهەڵەدا دەچن کە ئەویش ناوی ( خۆشەویستی یە).

لەبەر هەموو ئەمانە ناچار بووم ئەو ڕووداوە بگێڕمەوە....

ئێمە سێ هاوڕێ بووین ئەوەی کۆمانی دەکردەوە سەرکەشی و لەخۆبایی بوون بوو ، نەخێر ئێمە سێ چوار کەس بووین .... بەلاّم چوارەممان شەیتان بوو....

ئێمە بەردەوام لەڕاوی ئەو کچانەدا بووین کە بەقسەی لوس و جوان هەڵدەخەڵەتێن. پاشان دەیانمان بردن بۆ کێڵگەکانی دەرەوەی شار .... بەلاّم لەوێ سەرسام دەبوون کە دەیان بینی ئێمە دەبین بەگورگێك هیچ گوێ بەپاڕانەوەیان نادەین . ئەوکاتە ئێمە دڵەکانمان مردبوو هەستمان نەمابوو.

بەم جۆرە ڕۆو شەومان بەسەر دەبرد لەکێڵگەکاندا . وە لەناو خێمە و سەیارەکانمان لە ڕۆخی دەریاکان . تا ئەو ڕۆژە هات کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە .....

ڕۆژێك وەك هەموو جارەکانی تر چووین بۆ کێڵگەکە . هەموو شتمان ئامادە کردبوو، بۆ هەریەکەمان کچێك . وە خواردنەوەی نەفرەت لێکراو . بەلاّم ئەو شتەی بیرمان چووبوو خۆراك بوو.... پاش ماوەیەك یەکێکمان بەسەیارەکەی چوو بۆ خواردن.... نزیك کاتژمێری شەش بوو

کە دەرچوو.... چەند کاتژمێرێکی تێپەڕی هەر نەهاتەوە .... نزیک کاتژمێری (دە) ی شەو کەوتمە نائارامی وە بۆیە بەسەیارەکەم دەرچووم بەدوایدا .... لەرێگادا کارەساتێکی ترسناکم بینی ... کاتێ گەیشتمە سەر ڕووداوەکە بینیم سەیارەی هاوڕێکەمەو کەوتودتە سەرلا و گڕی گرتووە و دەسووتێ!!

بەپەلە وەك شێت هەوڵم دا دەری بهێنم لەناو ئاگرەکە . خەریك بوو تێك دەچووم کە بینیم نیوە ی لاشەی بووە بە خەڵوز ، بەلاّم هێشتا زیندوو بوو هێنامە سەرزەوی پاش چەند خولەکێك چاوی کردەوە دەستی گرتم و هاواری دەکرد : ئاگر!!ئاگر!! بریارمدا بەپەلە بیگەیەنمە نەخۆشخانە بەلاّم بەدەنگێکی پڕ لەگریان ووتی تازە سوودی نی یە... ناگەمە نەخۆشخانە...

لێشاوی فرمێسکم خەریك بوو دەیخنکاندم کاتێك دەمبینی هاوڕێکەم لەبەردەستمدا دەمرێت ....

لەناکاو هاواری کرد : چی پێ بڵێم ؟؟!! چی پێ بڵێم؟؟!!

بەسەر سامیەوە سەیرم کردوو ووتم کێ دەڵێت؟! بەدەنگێك وەك لەبیرێکی زۆر قوڵەوە دەربچێت ووتی (الله) خوای گەورە.

لەوکاتەدا سام و ترسێکی زۆر هەموو لاشەی داگیر کردم . لەناکاو هاوڕێکەم دوا هەناسەی کۆتایی داو مرد!!!.....

ڕۆژگار تێپەڕی بەلاّم وێنەی هاوڕێکەم بەردەوام لەبەرچاومە ، وەئەو ووتە یەی بەردەوام لەگوێمدا دەزرنگێتەوە کە هاواری دەکرد چی بڵێم؟؟!! چی بڵێم بەخوای گەورە؟؟!! لێردوە پرسیارم لەخۆم دەکرد ، ئەی من چی بڵێم بەخوای گەورە؟؟

چاوەکانم فرمێسکی دەباراند و هەموو گیانم دەلەرزی .

لەم کاتەدا گوێم لەبانگی نوێژی بەیانی بوو ( الله أكبر، الله أكبر)، کاتێ بانگ خوێن گەیشتە ( حی علی صلاة) ... هەستم کرد ئەمە بانگێکی تایبەتە بۆمن کە بانگم دەکات بۆ ڕێگای ڕووناکی و ڕەوشت بەرزی و داوێن پاکی و خواناسی...

هەستام خۆم شۆری و لاشەم لەو هەموو پیسی یە پاك کردەوە کە چەند ساڵێکە تیایدا نوقم بوو بووم وەدەست نوێژم گرت ، و نوێژم کرد.

لەو ڕۆژەوە یەك ئەرکم ( فرض) لەدەست نەچووە . سوپاس بۆ ئەو خوایە کە تەنهائەو شایەنی سوپاس کردنە . وەئێستا مروڤێکی ترم . پاك و خاوێنی بۆئەو خوایەی کە گۆران بەسەر بەندەکانیا دێنێت . بەپشتیوانی خوای گەورە خۆم ئامادە دەکەم بۆ بەجێهێنانی ( عەمرە) وە خوای گەورە یارمەتیم بدات و تەمەن بمێنێت دەچم بۆ ( حج ) یش.

ئەمە بوو ڕووداو و بەسەرهاتی تۆبەو گەڕانەوەم بۆ لای خوای گەورە. من لێرەدا بەهەموو گەنجەکان دەڵێم : ئاگاداربن ... ئاگاداربن لە هاوڕێتی ئەو کەسانەی هانت دەدەن سنوری قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە ببەزێنیت .
لەم بەرسەر هات و ڕووداوەی مندا پەندو ئامۆژگاری زۆرهەیە بۆ ئەو کەسانەی گوێ لەپەند و ئامۆژگاری دەگرن.

## ساباتی خەمباریەکان

یەکێکیان نووسراوێکی نووسی وتێیدا دەڵێت : هاوڕێکەم هەبوو خۆشم دەویست چونکە خاوەنی ڕێزو ڕەوشت بوو . شێوەو ڕەفتاری جوان و وتەی شیرینی سەرنجە ڕاکێشابووم.
ماوەیەکی دوورو درێژمان بەسەر برد بەشێوەیەك کەسمان بێ دڵی ئەوی ترمان نەکرد. تاوەکو من سەفەرم کرد ئەوم بەجێهێشت ئینجا تاماوەیەك لەڕێگای نامەوە پەیوەندیمان هەبوو دواتر پەیوەندیمان بچڕا. پاش ماوەیەکی دوورو درێژ لەسەفەردکەم گەڕامەوە ... گەورەترین ئاواتم بینینی ئەو هاوڕێیەم بوو ئەگەر بۆساتێکیش بێت . هەموو ئەو جێگایانەی پێشتر پێکەوە بۆی دەچووین هەمووی گەڕام بەلاّم نەم دۆزیەوە.
پاشان چوومە ئەو ناوچەیەی ماڵیانی لێ بوو... هاوسێکەی ووتی ماوەیەکی زۆرە باریان کردووە و لێرە نەماوە .
بەم شێوەیە مامەوە لەنێوان بێ ئومێدی و هیوایەکی کەم وە زۆر جار گومانم وابوو جارێکی تر ئەو هاوڕێیەم نابینمەوە.
شەوێکیان دەگەڕا مەوە بۆماڵ . بەبێ ئاگا چوومە ناو گەڕەك وکۆلانێکی کۆن و کەلاوەیەکم بینی کە ئەبەد بڕوات نەدەکرد ادەجنی زیاتر مرۆڤی تێدا بژی کاتێ گەیشتمە ناوەڕاستی کۆلانەکە لەیەکێك لەو کەلاوانەوە گوێم لەدەنگی گریانێك بوو. وەك لەقولاّیی شەوەوە دەهات پاشان هاوارێك... ووتم ئایا دەبێت تاریکی شەو چەند نهێنی لەگەڵ خۆی حەشار بدات .... وەمنیش پەیمانم بەخوای گەورە داوە کە هەر لێ قەوماوێك ببینم بچم بەهانایەوە....
بۆیە ڕووم کردە ماڵەکەو لەدەرگام دا بینیم دەرگاکرایەوە لەلایەن کچێکی منال کەچرایەکی بەدەستەوە بوو ، جل و بەرگێکی دڕاوی لەبەردابوو ، ووتم : نەخۆشتان هەیە ؟ بەدەم هەنیسکی گریانەوە ووتی بەڵێ ... وەرە ژوورەوە باوکم لەسەرەمەرگدایە خەریکە دەمرێت .... کچەکە

لەپێشەوە ڕۆی تاگەیشتە ژوورێکی دەرگا بچووک کەچوومە ژوورەوە وام دەزانی دەچمە ناو گۆڕەوە نەک ژوور ، وەبۆلای مردوو دەچم نەک نەخۆش .
لێی نزیک بوومەوە تاگەیشتمە تەنیشتی . کاتێ بینیم بەلآم چیم بینی؟
هەیکەیلی ئێسقانی مرۆڤ کەتەنها بەهەناسەدان زیندووە..
دەستم خستە سەر ڕوومەتی ... چاوە پڕ فرمێسکەکانی کردەوە زۆر بەووردی سەیری کردم، ئینجا لێوەکانی جوولآند بەدەنگێکی کزو لاواز : ووتی ئەحمەد!!! سپاس بۆ خوا کەساغ و سەلآمەتی . لەکۆتاییدا تۆم بینیەوە هاوڕێکەم.
لەم کاتەدا هەستم کرد و زانیم ئەوەی بەدوایدا دەگەڕام دۆزیمەوە... ئەی خوایە گیان ئەمە چ ڕێکەوتێکە ؟ ئەمە چۆن قەددەرێکە؟ خۆئەمە ئەو هاوەڵەمە کە زۆر بەدڵ بەدوایدا دەگەڕام و بێ ئۆمید ببووم کەجارێکی تر بینیم : خۆ ئەمە ئەو هاوڕێمە کە زۆر چاك دەمناسێ بەلآم ئێستا وای لێ هاتووە نایناسمەوە!!
بۆیە ووتم : هاوڕێکەم (.......) بۆ وات لێ هاتووە ، بۆم باس بکەیت چیت بەسەر هاتووە؟ بچی گەیشتوویتە ئەم جێگایە؟
ووتی: گوێ بگرە بۆ ڕووداوەکەم بەلکو بەگێڕانەوەی بۆتۆ دلم بحەوێتەوە و خۆم لەسزا و ئازاردانی ویژدانم ساتێك ڕزگار بکەم.
ووتی : چەند ساڵێك بەر لە ئێستا لەگەڵ دایکمدا لە خانوودیەکدا دەژیام و هاوسێیەکی دەوڵەمەندمان هەبوو . لەناو ماڵەکەیدا کچێکی جوان هەبوو . جوانی ئەم کچە کاری تێکردم و دڵی داگیر کردم بەشێوەیەك ئارامم نەما . بەردەوام بەدوایەوە بووم تاکەوتە داوەکەمەوە تاوام لێ کرد ئەوەی لەدڵی مندا بوو چووە دڵی ئەویشەوە... دوای بێ ئاگابوون لەخوای گەورە ... بەوەعدی ماردکردن و گواستنەوە خۆی خستە بەردەستم ڕۆژێك ئابرۆیم تکاند کچێتیم لێسەندەوە ، پاش چەند هەفتەیەك زانیم سکی پڕبووە!! منیش بڕیارم دا لێ ی دوور بکەومەوە ... کچە دامەوەکەش لەناچاریدا ئەوماڵەی بەجێهێشت و دەنگ و باسی نەما....
تاوای لێ هات ئەو ڕووداوە کاریگەری و گرنگی لەلای من نەما.
چەند ساڵێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی.
ڕۆژێك لەڕێگای پۆستەوە نامەیەکم بۆهات کەکردمەوە بینیم نامەی ئەو کچەیە تیایدا دەڵێت:ئەگەر وادەزانی ئەم نامەیەم بۆ نووسیوی تاپەیمان تازەبکەینەوە... یاخۆشەویستی جارانت بیرخەمەوە ئەوە یەك دێرم نەدەنووسی . نەك دێرێك بەلکو یەك پیتیش . چونکە باوەڕم وایە

پەیمانێك وەك پەیمانە ستەم کارەکەی تۆ، وەخۆشەویستیەك وەك خۆشەویستی یە درۆینەکەی تۆ، شایەنی ئەوە نی یە من یادی بکەمەوە . یاخەفەتی بۆ بخۆم و داوای تازەکردنەوەی بکەم ....

تۆ باش دەزانی کاتێ وازت لێ هێنام ئاگرێك لاشەی دەسووتانم چونکە کۆرپەیەك لە لاشەمدا دەجوولا . خەفەتم بۆ ڕابردوو دەخواردوو لەداهاتوو دەترسام . تۆزۆر بێ باکانە هەڵهاتی لەبەلایەك کەخۆت هۆکاربوویت. لەخۆت نەگرت بەدەستەکانت فرمێسکی چاوێ بسڕیت کە خۆت هێناتە گریان... وانەزانی من تۆ بەپیاوێکی داوێن پاك ببینم . نا نەخێر تەنانەت ناتوانم تۆ وەك مرۆڤیش سەیر بکەم ، چونکە تۆ هیچ ڕەفتارێکی دڕندانەت نەهێشتووەتەوە هەموویت لەناخت دا کۆکردوەتەوە ..... وە هەموویت لەیەك ڕووخساردا نیشانم دا. تۆ درۆت کرد لەوەی کەوتت تۆم خۆش دەوێ ، تۆ تەنها خۆتت خۆش دەوێ وە ئەوەی تۆ لەمنت دەویست تەنها بۆ تێرکردنی مەرامی خۆت بوو خیانەتت لێم کرد کاتێ بەڵێنی کردنە هاوسەرت پێدام .

بەڵێنەکەت بەسەر نەبرد چونکە وابەخەیاڵتدا هات کە چۆن ئافرەتێکی داوێن پیسی تاوان بار بکەیتە هاوسەر. لەکلتێکدا باش دەتزانی کە ئەو تاوانە بەدەستی تۆ بوو ئەگە تۆ نەبوویتایە ئەبەد ئەو تاوانەی نەدەکرد. من بەڕاستی تۆم خۆش دەویست ، بەلام وەك منداڵێك کەوتمە دەست زۆردارێکی ستەمکاری گەورە . تاداوێن پاکیت لێ دزیم . وەدوات لێ کردم سەرگەردان و لێقەوماوت کردم . بەجۆرێك کەمردنم لەژیان لاخۆشتر بێت . تازە چ تام و چێژی هەیە لەژیاندا بۆ ئافرەتێك نەتوانی ببێت بەهاوسەری پیاوێك . وەنەبێتە دایکی منداڵێك ! بەڵکو نەتوانێ بژی لەم کۆمەڵگایەدا مەگەر بەسەر شۆڕیبێت. وەسڵ لەهەموو شت بکاتەوە لەتانەو تەشەر .

خۆشی ژیانت لێ دزیم دوای ئەوەی کەلەئەنجامی ئەو ڕووداوە لەو ماڵە گەورەو خۆشە ڕام کرد . وەلەو نازوو نیعمەتە زۆرە . وەلەو ژیانە پڕ لەکامەرانی یە . بۆ خانوویەك کەکەس تیایدا نامناسێ . باوك و دایکت کوشتم چونکە لەخەفەتی دووری من مردن . وە منیشت کوشت چونکە ئەو ژیانە تاڵەی لەپیاڵەی تۆدا نۆشم کرد . وەئەو بەلا گەورەیەی تۆ بەسەر منت هێنا . کاری لەهەموو لاشەو گیانم کرد لەناو جێگای مردندام وەك مێشێکی سووتاو دەتلێمەوە . لەماڵی باوکم ڕام کرد چونکە توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی باوك و دایکم نەبوو ، پاشان چوومە ماڵێکی چۆڵ ژیام ژیانێکی زەلیلی .... ئینجا تۆبەم کرد وە داواکارم لەخوای گەورە تۆبەکەم لێ وەربگرێت و لەماڵی مەرگ و سەرکەشی بمباتەوە بۆ ژیانی کامەرانی ... وەئێستاش واخەریکە دەمرم ..... وەتۆی فێڵبازی درۆزن .... ئەی پیاو کوژی دز..... وانازانم خوای گەورە وازت لێ بێنێ تاتۆڵەی منت لێ نەسێنێتەوە....!

وەواتێ نەگەی ئەم نوسراوەم بۆئەوە بێت پەیمانێك لەگەڵ تۆ تازەبکەمەوە یا سۆزو خۆشەویستیم بۆت بجووڵێ ... تۆ زۆر سووك و ڕسوای.... مـن ئێستا لەبـەر دەرگـای گـۆڕدام ..... وەلـەکاتێکدا کەماڵ ئاوایی لەژیان دەکەم بەخۆشی و ناخۆشی ەوە .... هیچ هیوایەکم لەژیاندا نەماوە وەبۆیـە ئەم نووسراوەم بۆت نووسی کەبزانی ڕاسپاردەیەکت لای منە .... ئـەویش کچەکەتـە ..... ئەگەر لەسەرەتادا بووە هۆی نەمانی سۆزو بەزەیی لەدڵتدا بـەڵام ئێستا سـۆزو بـەزەیی باوکایـەتیت بـۆی بجووڵێ ..... جائـەو ڕاسپاردەیە وەربگـرە تـاوەکو ئـەویش وەك دایکـی لـەژیاندا بەناڕەحــەتی و مەینەتی ژیان بەسەر نەبات !! خواحافیز(والسلام)!!!!

بەڵێ ژنەکە مرد!!!! مردوو ئەم کچەی لەم شوێنە چۆڵە بـەبێ کـەس بەجێهێشت کەتەنـها خـوای گەورە نەبێت کەسی نەبوو.

ئەوەی چیرۆك و بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە دەڵێت:

کاتێ لەخوێندنەوەی ئەم نووسراوە بوومەوە .... سەیرم کرد فرمێسك بەڕوومەتیا دێتـەخوارەوە .... ئینجا کەوتووەکەم لەجێگا پێی ووتم :

سوێند بـەخوا کاتێ ئـەم نامەیـەم خوێنـدەوە هەسـتم بەلـەرزینێ کـرد کەهـەموو نـاخی هـەژاندم بەشێوەیەك وام بەخـەیاڵدا هـات کـەدڵم دەیـەوێت لەسنگم جیابێتـەوە ..... بۆیـە بەپەلـە خـۆم گەیاندە ئەم ماڵەی کە ئێستا دەمبینـی تیـایدا ..... ئـەم ماڵـە وێرانـە .... وەبینیـم لـەم ژوورە و لەسەر ئەم جێگایە لاشەیەکی ساردوو سڕکەوتووە....

وەبینیم ئەم کچـەش کـە دەبینـی لەتەمـەنی دەساڵێدا بۆدایکـی دەگـری..... لێرەدا بـیری هـەموو تاوانـەکانم کـردەوە . خـۆم وەك ئـەو دڕندەکێوی‌یانـە هاتـە بـەرچاو کـە کەڵبـەو نینۆکــەکانیان لەنیچیرەکانیان زۆر دڕندانە و بێ ویژدانانە گیردەکەن .....

کاتێ بەئاگا هاتمەوە پەیمانم دا بـەخوای گـەورە ئـەبێ ئـەم ژوورە کـە نـاوم نـاوە ژووری خەمـەکان بەجێ نەهێڵم تیایدا بژیم وەك چۆن ئەو کچە ستەم لێکراوە ....... وەتییدا بمرم وەك ئەو چۆن لێرەدامرد... وەئەوەتا ئێستا تـۆ دەم بینـی لەسـەرەمەرگدام و زۆر ڕازی و دڵم خۆشـە بـەم ژیانـە

چونکە تۆبەم کردووە وەبڕوام بـەخوای گـەورە بـەهێزە کەپـەیمانی خـۆی بەجێبـهێنێ و تۆبەکـەم لێوەربگرێـت .... بـەلکو ئـەو هـەموو سـزاو ناڕەحـەتی یـەی کـەبینیم ببێتەمایـەی لێبووردنـی گوناهەکانم ..... وەئەمەش کچی منە دەیدەمە دەستی تۆ .... تکایـە بـەڕێزو داویـن پـاکی پـێ ی بگەیەنە. وە هیچ هەواڵێکی لەبارەی باوکی و دایکی لامەدرکێنە.

# ئەوشۆخەی کەژیانی تێکدام

ڕووداوێکی بەئازارە کەخاوەنەکەی خۆی دەیگێڕێتەوە وەدڵێت:
لـەڕۆژێکی ڕەشـدا و لەیـەکێ لـەبازارەکاندا لەقاوەخانەیـەك دانیشـتبووم قـاوەم دەخـواردەوە ڕۆژنامەشم دەخوێندەوە لەم کاتەدا ئافرەتێکی چاوجوانی سـەرنج ڕاکێش کە زۆر بـەنازەوەڕێگای دەکـرد بەبـەردەممدا تێپـەڕی وو بەشـێوەیەکی زۆر تینـو بـۆ جوانـی مـن تەماشـای دەکـردم. بەشێوەیەك کەمنیش بێ ئاگا کەوتمە دوای .
چووە دوکانێکەوە منیش لەترسی خاوەن دوکانەکە نەم وێرا بچمە ژوورەوە نـەك (لەترسی خـوای گەورە ) . ڕووکردە لامەوە و بەدەست و پەنجە سپی و نەرم و جوانەکەی کەپڕ بوو لەئەنگوستیلەو ئـەڵماس ئیشارەتی بۆکـردم کـە بچمـە ژوورەوە . منیـش بـەبێ ئاگـا خـۆم کـرد بەدوکانەکـەدا.زۆر بەڕێزو شەرمەوە ووتی زەحمـەت نـەبێ ژمـارەی تەلەفۆنەکـەتم بـەرێ . منیـش پێـم ووت ئـەویش لەمۆبایلەکەی دەینووسی ئەومۆبایلەی کەبوتە هۆی مایـەی بەشـێك لەمەینـەتی و گرفـت چونکـە بەباشی بەکاری ناهێنین . پاش چەند سەعاتێك ولـەکۆتایی شـەودا تەلـەفۆنی بۆکـردم و دەسـتمان کرد بەگۆڕینەوەی قسەی خـۆش :پـێ ی ووتم مـن بێـوەژنم و ژنێکـی سـەرمایەدارم خـاوەن مـاڵ و سامانێکی زۆرم . وەتەمەنم (٣١) ساڵە . بەلاَم هەرکەس بیبنیایە دەیووت ئەمە تەمەنی (١٨) ساڵە.
وەدوای ئەم قسانە دەستمان کرد بەدانانی کاتی یەکتر بینین سـەرەتا لـە چێشـتخانەو قاوەخانـەکان یەکمان دەبینی . وەدلەم هـەموو یـەکتر بینینانـە نـەم توانـی هیچـم لێ ی دەسـت بکـەوێت تەنانـەت ماچێکیش . یادەسـتم بەردەستی بکـەوێت . ئەمـە وای لێکـردم زیـاتر خـۆشـم بـوێ چونکـە لـەدڵی خۆمـدا دەمـووت ئەمـە زۆر داوێــن پاکـەو لەگـەڵ کەسـی تـر پـەیوەندی نـەبووە..... وەدنایـەوێ پەیوەندی لەگەڵ کەسی تر ببەستێت بێجگە لەمن چونکـە منیـش گـەنجێکی جـوان بـووم. ڕۆژێـك تەلەفۆنی بۆکردم و وتی : کارێکی گرنگم پێت هەیە . منیش ووتم گیانەکـەم مـن لـەژێر فـەرمانی تۆدام . ووتی دەمەوێت.لەفلاَنە چێشتخانە پاش کاتژمێرێکی تر ئامادەبیت و بتبینم منـیش ووتم وادەکەومـە ڕێ وەك لەسـەر ئـاگربم نـەوەندە گـەرم بـووم بۆبینینـی . لەچێشـتخانەکە بەیـەك گەیشتین و کەوتینە گفتۆگۆکردن :
ووتم چیت دەوێت بۆت بکەم؟
بینیم لەجانتاکەی بلیتی سەفەری بۆشاری قاهیرە دەرکرد بەناوی منەوە لەپلەیەکەکان وەهەروەها ڕوخسەتی مانەوەی بۆسێ ڕۆژ لـەئوتێل( سمـیر أمیـس )ی پێنـج ئەسـتێرە و وەهـەروەها چەکێکی

پارەی پەسەند گراو بەناوی منەوە کەنرخەکەی (دەهەزار) ریالْ بوو پێدام ، و پێی ووتم : دەمەوێ بەیانی نا دووبەیانی بچیت بۆ قاهیرە و بچیتە ئەو ئوتێلەی لەوێ فلآنە کەس ببینیت ئەمەش ژمارەی تەلەفۆنەکەیەتی (؟!؟!؟!؟!)تا بتبات بۆ فلآنە کۆمپانیا لەجیاتی من واژووی گرێبەستێك بکەیت لەگەڵیدا بۆهەندێ جل و بەرگی جیهانی کەلە فەرەنساوە هاتووە ، وەئەمەش کاغەزی وەکالەتەکەیە. جاتکات لێدەکەم بچۆ و دوامەکەوە .

منیش ووتم بەسەرچاوەکانم گیانەکەم.

دوای ئەمسەروو ئەوسەرێکی زۆر لەگەڵ سەرۆکی کۆمپانیامەم ، ڕوخسەتم وەرگرت و لەکاتی دیاری کراودا سەفەرەکەم کرد ( خۆزگە ئەو سەفەرەم نەکردایە ) دوای ئەوەی گەیشتمە ئەوێ کاتژمێر ( چواری عەسر) بوو پاش کەمێك پشوو لەکاتژمێر شەشی تەواو مۆبایلەکەم هەلگرت و تەلەفۆنم بۆ ئەو ڕەقەمە کرد.(خۆزگە نەم کردایە).

ئایا دەزانیت کێ بوو خاوەن ئەو ڕەقەمی تەلەفۆنە؟! ئافرەتەکە خۆی بوو !!! پیش من خۆی گەیاندبووە ئەوێ.

زۆر بەحەپەساوی ووتم ، ووتی بەڵێ منم لات سەیرە خۆسەویستەکەم ووتم بەڵێ ، ووتی من هاتووم تا کارەکەت زیاتر بۆ ڕوون بکەمەوە.

خۆشەویستەکەم وەرە بۆ ژووری ژمارە (؟!؟!) منیش زۆر بەدڵخۆشیەوە چووم بینیم جل و بەرگێکی زۆر تەنکی سەرنج ڕاکێشی لەبەردایە کەهەرکەس بیبینیایە خۆی پێ ڕاگیر نەدەکرا!!

یەکسەر دەستی کردە ملم و دەستمان کرد بەماچ کردن و ڕابواردن خۆم لەبیرچودوە پەنابەخوا زینا!! زیناشم کردلەگەڵیدا!!

بەم شێوە خۆشە ماینەوەدو ڕوخسەتەکەم درێژکردەوە بۆ (دە) ڕۆژ گەڕاینەوە ...کاتێ ئێمە لەئاسماندا بووین خوای گەورە دەیبینین ، پەنابەخوا ئێمەش هەستمان نەدەکرد بەبوونی(پەنابەخوا) !!

پەیوەنیەکەمان بەم شێوەیە مایەوە بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێك.ئەچووم بۆ زیناکردن لەخانووە گەورەکەی . وەئەویش دەهات بۆماڵە بچووکەکەی من لەشوقەکەدا ، هەرچەندە ماڵەکەی من لەئاست پێشوازی کردنی ئەودا نەبوو بەلآم ئەو دەهات بۆلای جوانیەکەی من و تێرکردنی ئارەزووی خۆی و بەس.

ڕۆژێك من و براکەم لەرێگادا تووشی ڕووداوی ئۆتۆمبێل بووین ، براکەم تووشی خوێن بڕانێکی زۆر بوو ، بەلآم من سوپاس بۆ خوا باش بووم خەڵکی لەسەرمان کۆبوونەوە و مانگی سوورهات بەپەلە بردمانیان بۆ نەخۆشخانەیەکی نزیك . براکەم خرایە ژووری نەشتەرگەری وە یەکسەر،

پشکنینی خوێنەکەم دەرچوو . پزیشکەکە بەڕوویەکی خەماویەوە هات و ووتم توخوا براکـەم چـی لێ هاتووە ؟ تکایە پێم بڵێ !!

پزیشکەکە ووتی : کوڕی خۆم دەمەوێ مرۆڤێکی باوەڕداربی بەویسـت و دەسـەڵاتی خـوای گـەورە .

لەسەر جێگاکەم هەستام و هاوارم کرد ئایا براکەم مردووە ؟!؟! توخوا براکەم مرد؟!

پزیشکەکە ووتی: نەخێر ، ووتم ئەی ئیتر چی بووە ؟ پزکەکە ووتی بەداخـەوە خوێنەکـەت پیـس بووە بەمیکرۆبی ئایدزی پیس.

ئەم ووتانەی پزیشکەکە وەك هەورە تریشقە یـەك لێمـە دا . خۆزگـە زەوی شـەق بووایـە و قووتـی بدامایە پێش ئـەوەی ئـەو قسـەیەم بـۆ بکـات . یەکسـەر کـەوتم بـەزەویدا و پـاش ماوەیـەك بـەئاگا هاتمەوە . پرسیارم کرد بەڕاستی من تووشی ئەو دەردە کوشندەیە بوومە ؟! پزیشکەکە ووتی : تـۆ تووشی نەبویتە بەڵام بویتە بەهەڵگری ئەم نەخۆشی یە . تازە تامـاوی لـەژیاندا ئـەم نەخۆشـیەت لەگەڵ دایە ؟!

پاش دوو ڕۆژ لەو ڕووداوە براکەم کۆچی دوایی کرد . زۆر بۆی دڵ گـران بـووم چونکـە ئـەو هـەر برانەبوو وەك هاوڕێم بوو. بەردەوام ئامۆژگاری ئەوەی دەکردم کەلەو ( ئافرەتــە) دوور بکـەومـەوە چونکە بەپەیوەندیمانی دەزانی .

پاش دە ڕۆژ لـەمردنی براکـەم ئافرەتەکـەی هـاوەڵم تەلـەفۆنی بۆکـردم و وتـی: تـۆ لـەکوێیت خۆشەویستەکەم ؟ ماوەیەکی زۆرە دیارنیت؟

منیش بە تووڕەییەوە ووتم: چیت دەوێت؟

ووتی: چیت لێ قەوماوە؟

ووتم: براکەم مردووە لەڕووداوێکدا بۆ ئەو دلگرانم.

ووتی زێتدوو تەمـەندار تـرە لـەمردوو . وەنـەیوت خـوا عـافووی بکـات ، چونکـە زۆر دڵ ڕەق بـوو ئینجا ووتی : بەهەر حاڵ کەی بت بینم ( بێ ئەوەی گوێ بەبارودۆخی من بدات) .

ووتم : ئیتر ناتبینمەوە.

ووتی : بۆ؟

ووتم: بەڕاستی خۆشم دەوێیت و نامەوێ زیانت پێ بگەیەنم.

ووتی : بۆ؟چی تە ؟

ووتم : من هەڵگری نەخۆشی ئایدزم.

ووتی: چۆن زانیتە؟

منیش بۆم گێڕایەوە کە چۆن زانیومە.

ووتی: چویتەتە لای هیچ ئافرەتێکە تر بێجگە لەمن ؟

ووتم: نەخێر ( بەڕاستی بێجگە لەئەو بۆلای هیچ ئافرەتێکی تر نەچوومە).

ئینجا ووتی : هیچ کاتێك خوێنت لەکەسی تر وەرنەگرتووە؟

ووتم : نەخێر.

ووتی: کەواتە ئاواتەکەم هاتە دی.

ووتم: مەبەستت چی یە ؟ بەتووڕەییەوە.

ووتی : ئەمەوێ تۆڵە لەهەموو گەنجێك بکەمەوە کە ئەوان بوونە مایەی ئەوەی‌من تووشی ئەو نەخۆشیە بکەن . وەبەچاوی خۆیان دەبێ ببینن.

وەتۆ یەکەم کەسی لەو گەنجانە ... وە زۆری تر وەك تۆ بەرێگاوەیە!!!

پاشان لەتەلەفۆنەکەوە تفی لێکردم و دایخست.

منیش ووتم خوام بەسە بۆتۆڵە سەندنەوە ئەی کچە ئایدز. وە زۆر شتی ترم ووت نامەوێ لێرەدا باسی بکەم تا هەستان زیاتر بریندار نەکەم .

من ئێستا تەمەنم (٣٢) ساڵە و تائێستا بێ هاوسەرم . لەتەمەنی (٢٩) ساڵیەوە تووشی ئەو نەخۆشی یە بووم. وەلەوکاتەدا بەتەمای مارەبڕینی هاوسەرێك بووم لەوکاتەوە تائێستا دایکم و براو خوشکەکانم داوام لێدەکەن ژن بهێنم ، بەلاَم من ڕازی نابم چونکە هەڵگری نەخۆشی ئایدزم . بەلاَم ئەوان نازانن ، وەنامەوێ ئەو دەردە پیسە بگوێزمەوە بۆ هاوسەری ژیانم و منداڵەکانم . بۆ زانیاریتان من برا گەورەی براو خوشکەکانمم وەباوکم خوا لێ ی ببورێت زۆر حەزی دەکرد لەئاهەنگەکەمدا بەشداری بکات بەلاَم بەداخەوە ئەو مرد کاتێ تەمەنی من (٢٩) ساڵ بوو ، وەنەم توانی ئاواتەکەی بهێنمە دی، تەنانەت هاوڕێکانم زۆر داوام لێدەکەن کە ژن بهێنم .

ئێستامن زۆر هیلاکم لە ڕووی دەرونیەوەو کێشم دابەزیە بۆ (٥٥) کگم کەپێشتر (٦٨) کگم بووم . ئەمەش بەهۆی ئەو حالە تە دەروونیە ی کەبەهۆی نەخۆشیەکەمەوە تووشی بوومە کەنازانم کەی ژیانم لەناو دەبات .

بەلاَم تۆبەیەکی بەکارم کردووە و لەسەر نوێژو قورئان خوێندن لەبەرکردن بەردەوامم هەر چەندە کات درەنگە و زۆری تەمەنم بەفیڕۆ چوو.

من لێرەدا ئەم نامە و نووسراوە دەنێرم بۆ هەموو براو خوشکێکی موسڵمانم کە دووربکەونەوە لەهەموو ئەو کارانەی کە خوا پێ ی ناخۆشە . وەك زینا کردن و زۆر شتی تر ، وە بۆئەوەی پەندی لێوەربگرن.

من لێرەدا ئەم نامە و نووسراوە دەنێرم بۆ هەموو براو خوشکێکی موسڵمانم کە دووربکەونەوە لەهەموو ئەو کارانەی کە خوا پێ ی ناخۆشە . وەك زینا کردن و زۆر شتی تر ، وە بۆئەوەی پەندی لێوەربگرن.

وەئەمە ئامۆژگاری منە کەلەرێگای لاپەڕکانی ئەنتەرنێتەوە بلاْوکراوەکاندا دەینێرم ، کەدەڵێم : ژیان جوانەو تامی خۆشە... بەلاْم بەلەش ساغی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە کەبەتامترین شتە لەژیاندا .

تامی ژیان لەوەدا نیە کە مرۆڤ بۆ چێژی چەند خولەکێك لەبەیەك گەیشتنێکی نادروست و ناشەرعی تامی دەکات بەلکو ئەو چەند خولەکە ژیانی لێدەکاتە دۆزەخ.

کەمن ڕۆژانە لەو ژیانە دۆزەخاویەدا دەژیم . خوا یارمەتیم بدات. وەپەنام هەرئەوە (لاحول ولاقوة إلا بالله العظیم).

وەلەکۆتاییدا ئامۆژگاریم بۆ هەموو گەنجێکی کوڕ و کچ ئەوەیە : کەلە خوای گەورە بترسن . وەپەندو ئامۆژگاری وەربگرن لەم بەرسەرهاتەی من .

سوێند بەخوا تەنها لەبەر ئێوە ئەمەم نووسی تاوەکو ئێوەش خۆتان لەو نەخۆشی یە پیسە بپارێزن . وەلەسزاو تووڕەیی خوای گەورە خۆتان بپارێزن.

جاتکام لەئێوە ئەوەیە زیاتر لەخوای گەورە نزیك ببنەوە . وەباوەڕتان بەخوای گەورە بەهێز بکەن تاشەیتان زەپەرتان پێ نەبات و پەلکێشتان نەکات بۆلای کارە قەدەغەکراوەکان .

وەداوام لەئێوەش ئەوەیە دوعای خێرم بۆبکەن و لە خوا داوام بۆبکەن کە شیفام بدات . وە خوای گەورە پاداشتی هەموو ئەوانە بداتەوە کەهاوکاریان کردم بۆ بلاْوکردنەوەی ئەم بەسەرهاتە . بۆپەندو ئامۆژگاری لیْ وەرگرتن.

# قازی وقوربانیەکە

گەنجێکی سەردرۆ و داوێن پیس بوو . زانی کەلەماڵی هاوسێ کەیاندا کچێکی جوانی خاوەن سەروەت و نازو نیعمەتی لێیە . بەهەر شێوەیەك بێت خۆی پێ گەیاندوو پەیوەندی لەگەڵیدا بەست لەسەرەتا بەسەیرکردن و پاشان بەنامە ناردن و ئینجا سەردانی یەکترکردن تاگەیشتە ئەوەی کچەی کرد بەژن و دواتر پەیوەندیان بەیەکەوە بچڕا .

بەسەرهاتەکەیان کۆتایی پێ هات وەك هەموو بەسەرهاتی خۆشەویستی و ڕابواردنی منداڵەکانی ئادەم و حەوا لەم شانۆگەری بوونەدا . کچەکە گەڕایەوە بەلاّم بەخەمێکی گەورە کە دڵی دەهەژاند . وەبەکۆرپەکەیەوە کەناخی دەهەژاند . بەردەوام لەبیری شاردنەوەیدا بوو . بەلاّم هەر ئاشکرا دەبێت و دەبێتە قسەیەکی بلاّو ئەگەر ئەمڕۆش بەنهێنی مایەوە بەلاّم بەیانی ئاشکرا دەبێت.

بۆیە شەوگارو ڕۆژگاری بەم خەمەوە بەسەر دەبرد. وە پشووی نەمابوو. بۆیە هیچی لەبەردەمدا نەما تەنها ڕاکردن نەبێت . وەژیانی ڕزگاربکات . بۆیەشەوێکیان خۆی دایە دەست تاریکی شەو وو خۆی گۆڕی و لەماڵ دەرچوو تاگەیشتە خانووە کەلاوەیەکی چۆڵ . بەتەنهاو بەبێ کەس لەوێ دەژیا لەگەڵ خەمەکەی ئاوسکی.

بەلاّم گورگەکە کۆمەڵگا لێی بوورا وە تۆبەکەی قبولکرا (لەکۆمەڵگادا) وەهەڵەکەی لەبیرکا وەبوو بەدادوەر لەدادگا . بەلاّم کچە داماوەکە هەر لەو کەلاوەیە منداڵەکەی بوو . وە هەرچی هەبوە فرۆشتی . لەجل و بەرگ و ئالتون. پاشان کۆلاّن و بازار دەگەڕا بەخۆی و کۆرپەکەیەوە.

شەوێك پیاوێك هات بۆلای بۆ تێرکردنی ئارەزووی وە بۆ جێـژی تێکەڵ بوون لەگەڵدا بەلاّم ئەم ڕازی نەبوو .

پاشان پیاوەکە شکاتی لێ کردو وتی پارەی لێدزیووم وەشکاتەکەی گەیاندە لای دادوەر.

ڕۆژی دادگایی کردن هات. ژنەکە لەگەڵ کچە تەمەن حەوت ساڵەکەی بەڕێکران بۆ دادگا. تاکاتی دادگایی کردنەکەی هات. هەرکەچاوی بەدادوەرەکەوت هەموو گیانی تێکچوو وەژیری لەدەستدا . چونکە ناسیەوەی و زانی کەئەوە ئەو گورگەیە کەهەموو ژیانی لێ تێك دا زۆر بەچاوی تۆڵە سەندنەوە سەیری کرد ئینجا بەدەنگێکی زۆر بەرز هاواری کرد کەلەهۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوە و وتی: لەسەر خۆبە جەنابی دادوەر .بۆتۆنابێت ببیتە دادوەر لەکێشەکەی من چونکە هەردووکمان دزین . وەهەردووکمان وەك یەك ناپاکین . وەنابێت ناپاك و دز ببێتە دادوەر لەنێوان ناپاك و دزەکان . دادوەر ئامادەبوانی هۆڵی دادگا سەریان وسوڕما لەم ووتە نامۆو سەرسوڕهێنەرانە .

دادودر وای نیاز بوو پۆلیس بانگ بکات تاددری بکەن لەهۆڵەکە . نافرەتەکە رووپۆشەکەی لەسەر دەم و چاوی لابرد . دادودردکە کەسەیری کرد یەکسەر ناسیەوە و هەموو شتەکانی لاناشکرابوو.

ئافرەتەکە کەوتە قسە و وتی : من پاردم دزیوە . بەڵام تۆ ناموست دزیوە . وەهەموو دەزانن نامووس بەنرخترە لەپارە. بۆیە تۆ تاوانی تۆ زۆر گەورەترە لەتاوانی من . چونکە ئەوکەسەی پارەی لێ دەدزێت دەتوانێ دڵی خۆی بداتەوە بەوەی کەپارەکەی بۆ دەگێرێتەوە یا دەی بژارێتەوە. بەڵام ئەوکچەی کە ناموسی لێ دزرا بەچی دڵی خۆی بداتەوە . چونکە ناموس کەرۆیی ناگەرێتەوە . وەئەگەر تۆ نەبویتایە من دزیم نەدەکرد وەنەدەگەیشتم بەم حاڵەی کەئێستا تێیدام . بۆیە ئەو کورسی یە بەجێ بهێڵە بۆیەکێکی تر . وەرە لەلامن بووەستە تادادوەرێك بەدادپەروەری هەردووکمان دادگایی بکات لەسەریەك تاوان . کەتۆ پلان دانەری بویت ومنیش ئەنجامدەری. بینیم کەتۆ هاتی بۆئەم هۆڵە کەچۆن دەرگاوان هاواری کرد بەگەیشتنت وەخەڵکەکە هەستان لەبەرت!!! وەخۆشم بینی کاتێ هاتمە ژوورەوە چاوەکان چەند بەسووکی سەیریان دەکردم . ووتم ئای چەند جێگای سەرسورمانە چەندێ ناونیشانەکان درۆدەکەن....

تۆمنت هێناوە بۆ ئێرە کەحوکمی گرتن بدەیت بەسەرمندا . وەکو ئەوەی بەوە تێرت نەخوارد کەتەمەنێکی من لەمەینەتی و سەرگەردانیدا ژیان بەسەر دەبەم بەهۆی تۆوە ... ئایا تۆ مرۆڤ نەبویت یەك تۆز بەزدیت بەدڵ قەوماوی مندا بهاتایەتەوە!!

ـ ـ ـر ـیچ ـتێکم بەدەستەوە نەبێت پیوەندی من و تۆ بسەلمێنێت ئەوە ئەو کچەم پێیە کە هی تۆیە و تەنها شتێکە کەماوە لەنێوان من و تۆدا . لێرەدا (گورگەکە) ناتەخێر دادوەر سەری بەرزکردەوە . وسەیری کچەکەی کرد خۆی کرد و وتی ئەم ژنە ژیری لەدەست داوە و شێت بووە پێویستە رەوانەی لای پزیشك بکرێت . خەڵکەکەش باوەریان بەقسەی دادوەرەکە کردو هەستان رۆیشتن ... هەروەك ئەوەی هیچ شتێك نەبووبێت.

ئای خوایە گیان؟!

بینیتە کچی خۆم چۆن ئەو گورگە خۆی بێ بەری دەکات لەوکارە ناشرینە زۆر بەسووك و ئاسانی . ئەم کچە وەك هەموو کچەکانی تر خاوەنی دایك و باوك بوو کەخەمی بخۆن و بەختەوەری ژیانی بۆ دابین بکەن . وەخاوەنی ناموس بوو کەبەسەربەرزی لەژیاندا بژی ... وەهیوای شووکردنی هەبوو....

بەلاّم هەموو ئەمانەی لەدەستدا بۆبەلّێنێکی درۆ ، بۆ ئارەزوویەکی تەمەن کورت وەگوێی نەدا بەم فەرموودەیەی خوای گەورە ( يأيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلبابيهن ذلك أدنى ان يعرفن فلايؤذين وكان الله غفورا رحيما) الأحزاب .

ئەی کچەکەم ئەو ڕفتارە گورگانەی لەشێوەی مرۆڤدا خۆی پیشان دەدا سەرت لیّ نەشێوێنیّ ، لەگەلّ جل و بەرگی بەری ، ئەگەر نینۆکەکانی ئاشکرابکات دەبینیت خوێنی لیّ دەتکێت . وەدلّی بەردێکی رەقی ڕەشە یەك تۆز سۆزو بەزەیی تیادا نیە.

کچەکەم ئەوانە شێری دڕەندەن ، وەگورگی کێوین . زۆرێك لەکچانیان تووشی مەینەتی وا کردووە کە هیچ کەس ناتوانێت بەرگەی بگرێت.وە زۆرێك لەباوکان و دایکانیان تووشی خەم و خەفەتێك کردووە کەهیچ شتێك لەبەردەمی خۆی پیّ ناگیریّ.

وەزۆر خۆشی یان لەزاوا تێك داوە لەشەوی بوکێنی و هاوسەرگیریان پیّ هەلّوەشاندووەتەوە.

بۆیە ئاگاداربە !!ئاگادار!! ئەی کچی خۆم. چونکە گورگ هیچ کات فرمێسك نارِێژیّ بۆ نیچیرەکەی کەقووتی دەدات . چونکە گورگ هیچ کات وەفای نی یە.

# ئۆتۆمبیلی لەیموزین و ئافرەتەکەو من

نازانم لەکوێوەو چۆن دەست بکەم بەگێڕانەوەی ئەم چیرۆکە ناخۆشە، لەکاتێکدا هاوشێوەی ئەم چیرۆکە لەکۆمەڵگائیسلامیەکاندا زۆر دەبیستین ، سوێند بەخوا سەرگوزشتەی ئەم چیرۆکە نامۆ و ترسناکە زۆر خەفەتبارو دڵ تەنگی کردم .

زۆر درێژەی نادەمێ ،لێ دەگەڕێم ئەم بەرپرسە خۆی چۆنیەتی ئەم چیرۆکە ناخۆشە بگێڕێتەوە ... بەلاّم پێش ئەوەی ئەم چیرۆکەی خۆی بگێڕێتەوە ئەمەوێ چیرۆکێکی ترکە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە پێتانی بڵێم ئەویش : ڕۆژێك لەڕۆژان کەسێکی پاکستانی کە خاوەن ئۆتۆمبیلێکی لەیموزین بوو ، وەستا بۆئەوەی کاری تەکسی بکات ، کچێك کە لەیەکێك لەبازاڕەکان دەگەڕایەوە ئاماژەی بۆ کرد کە بوەستێ و شوفێرەکەش وەستا و سەری خست ئەم کچە ئاگای لەخۆی نەما ! کاتێکی زانی وا لەچۆڵەوانیەکدا و لەگەڵ سێ پیاوی پاکستانیدایەو دەیانەوێ دەست درێژی بکەنە سەری ... کچەکە دەڵێت سوێند بەخوا پێیان بوتمایە پێیەکانمان ماچ بکە وازت لێ دێنین پێیەکانیانم ماچ دەکرد ، بەلاّم هەرگیز شتی وایان نەدەکرد، ئەم کیژە هەوڵی زۆری دا بۆ ئەوەی ئەوان وازی لێ بێنن، بەلاّم ئەوان سووربوون لەسەر کاری فاحیشەکردن لەگەڵیدا ... لەم کاتەدا کە خەریك بوو کارلەکار دەترازا خوای گەورە وویستی وابوو کە ئەم کچە بێ کەسە رزگار بکات ... لەناکاو پیرەژنێك لەم بیابانە پەیدابوو ووردە ووردە لێیان نزیك دەبووەوە ... کە پیاوەکان ئەم ژنەیان بینی زۆر ترسان وایان زانی خێو و جنۆکەیە یەکسەر هەڵ هاتن و کچەیان جێ هێشت .

پیرەژنەکە ووردە ووردە لەکچەکە نزیك بووەوە.. کچەکە دەترساو ناوی خوای دەهێنا ووتی: بسم الله تۆ جنۆکەیت یان مرۆڤیت ؟ پیرەژنەکە ووتی :نەوەالله خۆزگایە جنۆکە بوومایە ..! ئەگەر جنۆکە بوومایە کوڕەکەم لەبەرخاتری چاوی ژنەکەی منی لەم بیابانەدا بەجێ نەدەهێشت خوا لەناوی بەرێت ....

بەم شێوەیە کچەو پیرەژنەکە دەستیان کرد بەیەکتر ناسین تا خوای گەورە دەرووی لێکردنەوەو پیاوێکی تەمەن چل ساڵ بە ئۆتۆمبیلەکەیەوە هات ... سەرەتا پیاوەکە ترسا ... بەم کاتی خۆرئاوا بوونە ئەم دوو ئافرەتە لەم بیابانەدا چی دەکەن ( لەبەرخۆیەوە ئەم قسانەی دەکرد) پاشان گەڕایەوە بۆ لایان ... کاتێك چیرۆکەکەیانی بیست لەگەڵ خۆی سەریانی خست و بردنی بۆ نزیکترین بنکەی پۆلیس ... بەم شێوەیە پۆلیس بانگی کەس و کاری کچەیان کرد و لێ یان پرسی ئەگەر ئێستا بیان بینی دەیان ناسیتەوە؟ کچە ووتی: ئەی چۆن نایان ناسمەوە، لەکاتێکدا من تکاو

ڕجای زۆرم لێ کردن ... بەم شێودیە پۆلیس بڕیاریاندا کچەکە بچێتەوە بۆ مـاڵی خۆیـان و داوایـان کرد لە کۆمپانیای ئۆتۆمبیلی (لەیموزین) کە وێنەی سەرجەم ئەو کەسانەی کە بەشدارن لـەکڕینی ئەم جۆرە ئۆتۆمبیلانەدا بـۆ بنـێرن بـۆ پشکنین و لێ کۆڵینـەوە ، بـەڵکو ئـەم کەسـە نـەفس نزمـە بدۆزنـەوە پیرەژنەکەش جارێ قسەی لـەبارەوە ناکـەین ... تـا ئـەم گەنجە ئــەم چیرۆکـە سـەیرو بەئازارەمان بۆ نەگێڕێتەوە ... ئەم گەنجە دەڵێت : من گەنجێکی قۆزی سپی پێست بووم ، هەمیشە حەزم بەلەبەرکردنی پانتۆڵی کابۆو(پانتۆڵی تەسك) و کراسـی و تـی شێرت بـوو ، حـەزم لـەقات و ڕبات نەدەکرد ، هەر بەبینینم یەکسەر تێ دەگەیت کە من خەڵکی وولاتی شامم ( سوریا ، لوبنان ، فەلەستین).

دەڵێت : وەکو نەریتی هەموو شەوێکم کاتژمێر دوو نیوی شەو لەپشوو ڕابواردنی خۆم دەگەڕامەوە بەرەو ماڵ ، شەوێکیان ئۆتۆمبیلەکەم پەکی کەوت و وەستا، نەم زانی چی بکەم ... بیرم کردەوە کە لەقەراغی ڕێگاکەوە دەیوەستێنم و بەتەکسی دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ... دەستم لەتەکسی یەك ڕاگرت ( شۆفرلێتێکی لەیموزین) بو سـەرکەوتم لەگـەڵیدا ، بـۆم دەرکـەوت شـۆفێرەکە خـەڵکی پاکسـتانە ... سروشتی خۆم وابوو زۆر هێمن و بێ دەنگ بووم حەزم بەگفتوگۆکردنی زۆر نەدەکرد بەڵام لـەناو سەیارەکەدا پرسیارێك بەبیرمدا هات ! پرسیم لەشۆفێرەکە تۆ سوریت یان لوبنانیت ؟ ساتێك بیرم کردەوە ، نا لوبنانیت ، بەڵام شۆفێرەکە بێ دەنگ بوو ، پاشـان ئـەو پرسـی : لـەکوێ کاریـەکـەیت ؟ ووتم : لەکۆگایەکی جل و بەرگ فرۆشتن . پاشان شۆفێرەکە پرسی : مووچەکەت چـەندە؟ منـیش وەڵامـم دایـەوە :هـەزارو دووسـەد (ڕیـاڵ)ە ... بێگومــان هــەر بــەدەمم دا هــات . نــازانم بــو هــەر لەسەرەتاوە ڕاستم نەوت ... بەڵام ئەمە قەدەری خوابوو ... یان بڵێین ئەمە بـەزەیی و میـهرەبانی خوا بوو ... شۆفێرە پاکستانیەکە ووتی : ئەم پارەیە بەشت ئەکات ؟ زۆر بەخێرایی وەڵامم دایەوە : بـەڵێ بەشـم دەکات . شۆفێرەپاکستانیەکە : ئەگـەر بمزانیایـە ئـەم پارەیـەم لـە ووڵاتەکـەی خـۆم دەست دەکەوێت ئەوە دەگەڕامەوە ...

تێنەگەیشتم مەبەستی چی یە.. بەڵام کەمێك بێ دەنگ بوو پاشان دەستی کردەوە بەپرسیار کردن : ئایا دەزانی من لەمانگێکدا دەهەزار (ڕیاڵ)م دەست دەکەوێت ؟!

ئەو کاتە تووشی سەر سوڕمان بووم ... بەپەلە پرسیارم کرد چۆن ؟! پاکستانیەکە وەڵامی دایەوە : کچانی زۆرهەن ، حەشیشە( ماددەی بێ هۆشکەر) ، مەی دەتەوێت ؟

وەڵامم دایەوە و پێم ووت : ئەشێت حەشیشە و مەی دەست بکەوێت بەڵام کـچ ؟ ئەمـە ڕاست نـی یە...

وەڵامی نەدامەوە بەگوتە بەڵام لەژێر کوشنی ئۆتۆمبیلەوە ، ئەلبومێکی پڕ لە وێنەی کچی دەرکرد و پێیدام ... ئەلبومەکەم لەدەست وەرگرت ولاپەڕە بەلاپەڕە تەماشام دەکرد تاچاوم چووە سەر وێنەی یەکێك لەکچەکان ، هەرگیز ئافرەتی وا جوانم نەدیبوو بئای خوایە چەند جوان بوو ، پێم ووت : ئەم دانەیەم دەوێت . ووتی: ئەمە بەسێ هەزار ریاڵە .... پاش هەوڵێکی زۆر کە باوەڕم وابوو بێ ئاکام بێت وەڵامی دامەوە : ووتی مادام یەکەم جارتە ئەم کچەت بۆ دەهێنم بەرامبەر بە دوو هەزار ریاڵ منیش ڕازی بووم . بردمیەوە بۆماڵ ... پێم ووت لێرە بووەستە نزیك ئەم شوقەیە ... بەگاڵتە جارێەوە تەماشایەکی کردم و وتی : ئەمە خانووەکەتە؟ پێم ووت : نەخێر (ئەمە ماڵی کەفیلەکەمە) دانشتم باسی چاکی کەفیلەکەم بۆ ئەکرد، کە زۆر گەنجانەیە وەك دەڵێن ، پێم ووت : کەی کچەکەی دێنیت؟ ووتی : بەیانی ... پێم ووت : چۆن ؟ بۆکوێ ئەیهێنی ؟ قسەکەیم بڕی و وتم لەکوێ ؟ بێ گومان دەبێت بیهێنیت بۆماڵی کەفیلەکەم دیارە بێ گومان ئەوە ماڵی من بوو ... لە سەردتاوە ڕازی نەبوو ، بەڵام کە ڕازیم کرد بەوەی کە کەفیلەکەم گەنجانەیە ... وە ئەگەر شتێکی بەو شێوەیە ڕێك بکەم بۆی ئەویش ڕازی دەبێت . شۆفێرەکە ڕازی بوو بەمەرجێك من ئەوشتانەی پێ بڵێم نەك شۆفێرە پاکستانیەکە . بەمەرجێ بەیانی کچەکەم بۆ بهێنێت چونکە کەفیلەکەم خۆی و خێزانەکەی لەماڵ نابن بەم شێوەیە شۆفێرە پاکستانیەکە ژمارەی تەلەفونەکەمی وەرگرت و منیش ژمارەی ئەوم وەرگرت....

بەراشکاوی دەڵێم لەراستیدا ئەو شەوە بەچاکی خەوم لێ نەکەوت ، لەنێو جێگاکە هەر ئەم دیوو ئەو دیوم دەکرد ... لەبەر خۆمەوە دەمووت کەی بەیانی دێت و ئەو مەبەستەم جێ بەجێ دەبێت ... هەموو هۆش و بیرم تێڕامان بوو لەو کچە ... لەنێوان ڕاستی و ناڕاستی دا هەر چاوەڕێم کرد تا بەیانی هات کە زۆر درێژ بوو بەلامەوە ... دوای عیشا هەر زوو گەڕامەوە بۆماڵ ... کەس و کار لەماڵەوە نەبوون ئەمەش هەلێکە باشە .. بەدیار تەلەفۆنەکەوە دانیشتم ... لەبەر خۆمەوە دەم ووت ئەم شۆفێرە دواکەوت ؟ تەلەفۆنی بۆبکەم یان تۆزێکی تر چاوەڕێی بکەم ... زەنگی تەلەفۆنەکە لێی داو لێکدانەوەکانی بچڕیم ... شۆفێرە پاکستانیەکە بوو ... بەخێرایی وەڵامم دایەوە دەستم کرد بە پرسیارکردن کچەکەت هێناوە یان نا وەڵامم بدەرەوە ... ئەویش وەڵامی دایەوە ئەو پارەیەی کە لەسەری ڕێك کەوتین ئامادەت کردووە ؟

منش ووتم : بەڵێ ....

شۆفێرە پاکستانیەکە ووتی: لە چی شوێنێکیت؟

منیش ووتم : لەماڵ کەفیلەکەم کەدوێنێ دات گرتم لەبەردەم ماڵیان .

ئەویش ووتی : دەرگارگاکە بەخێرایی بکەرەوە ... دەرگاکەم کردەوە تەماشام کرد کچەکەی پێیە لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا!! کەسە پاکستانیەکە ووتی : سەرەتا پارەکەم بدەرێ .. دوو هەزار ڕیاڵم بدەرێ ... دوو هەزار ڕیاڵەکەم پێ داو کچەکەم کردە ژووردەوە ... کاتێ کچە داماوە دانیشت تەماشام دەکرد، ماشاءالله لەم جوانی یە ! لەسەرەتاوە خەمم تەنها تەماشا کردنی بوو زۆر لەزەتم لەتەماشاکردنەکە دەبرد ... پاشان کەم کەم لێ ی نزیك دەبوومەوە و گفتوگۆم دەکرد لەگەڵیدا ... بەڵام هەستم بەشتێکی نامۆ و سەیر کرد! ئەم کچە ناسروشتی دەهاتە پێش چاوم ... زۆر بێ دەنگ و مات بوو دەت ووت بەزۆر ئەم کاردی پێ دەکەیت ... ئەمە زۆر جێگای تێ ڕامان بوو ، هەروەها شێوەشی وا دیار بوو کە خێزانێکی بەرێز بێت و پێویستی بەپارەنەبێت ... بە هەرحاڵ پێم ووت : لەڕاستیدا تۆ زۆر نامۆیت ... چیتە؟ ووتی : هیچم نی یە... بەڵام دەمەوێت بەخێرایی بڕوم ... سوێند بەخوا نەم زانی چیم بەسەردا هات ... شتێك لە بیرو هۆشمدا نەما کە ناوی ئاردەزووی سێکسی بێت ... هەموو بیرم لەو کاتەدا تەنها بریتی بوو لەوەی کە من چیرۆکی ئەم کچە بزانم ... ئەم کچە بەبێ دەنگی مایەوە و یەك ووشەی نەدرکاند، ئەمەش ئەوەندەی تر خەفەتی بۆ دروستکردم کە ئەم کچە بە زۆر ئەم کاردی پێ دەکەن .

پێم ووت : گوێ بگرە ، من وا دەبینم تۆ بە زۆر ئەم کاردت پێ دەکەن وە تۆش ئەم سەرگوزشتەی خۆت لەمن دەشاریتەوە ... تکایە ئەم چیرۆکو سەرگوزشتەیەم بۆ بگێڕەوە؟

ئەم کچە بەستە زمانە زۆر بێ دەنگ بوو ... بەڵام هەستم کرد کەمێك دڵ نارام بوو ... وە هەستم کرد کە دەخوازێت قسە بکات بەڵام ترسێکی زۆر لەناخیدایە ... منیش پێم ووت و سوێندم بۆ خوارد کە ئەگەر چیرۆکەکەی بگێڕێتەوە پەیمان بێت لەبەر خاتری ئەو ئەم نهێنی یە لای کەس نەدرکێنم ... وە زۆر بە پاکی مامەڵەت لەگەڵدا بکەم ... وەمن ئامادەم دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکەم .

نازانم؟ ڕاستەوخۆ کچەکە هاتە نزیکمەوە و دەستی کرد بەگریان منیش بەگریانەکەی ئەو زۆر گریام و مەردایەتی و پیاودتیم گەیشتە لوتکە ... ئەم هەڵوێستە زۆر کاری تێکردم خۆم پێ نەدەگیرا بەڵام ئارامم دەگرت ترس و گریانەکەیم ڕەواندەوە ... هێمنم کردەوە ووتم : چیرۆکەکەتم بۆ باس بکە پەیمان بێ لە لای کەس نەی درکێنم خوا شەیەت بێت ....

کچەکە دەستی کرد بەسەر گوزشتەکەی و وتی : ئەم کەسە پاکستانیەت بینی کە منی هاورد بۆ ئێرە ( شۆفێرە پاکستانیەکە) ئەو کوڕی سەگە زۆر کەسی هاوشێوەی من دەناسێت ... منیش ووتم : بێ گومان دەزانم ، چونکە ئەوکاتەی کەمن لەگەڵی دا سەرکەوتم وێنەی کۆمەڵێ ئافرەتی نیشان دام ... بەهەرحاڵ فەرموو تۆ چیرۆکەکەت بگێڕەوە ... ئەو پیاوە چی یەتی؟

کچەکە ووتی : من ئافرەتێکم شووم کردووە نزیکەی ساڵ و نیوێك دەبێت ... ڕۆژێك لە ڕۆژان کاتێك پیاوەکەم لەسەر کاربوو پەیوەندیم پێوەکردو وتم: پیاوەکە ئەچمە فلاّنە بازار هەندێ شت دەکرم ڕووخسەتم دەدەیت یان نا؟ پیاوەکەم بەخێرایی ڕازی بوو ، لەکاتێکدا ئێمە هێشتا تازە بووك و زاوا بووین و منالّمان نەبوو... بەیانی هاتمە دەردوە دەستم لە تەکسی ڕاگرت ئەم شۆفێرە پاکستانیە خیانەتکارە وەستا ، پێم ووت : بم گەیەنە فلاّنە شوێن ، ئاگام لەخۆم نەما ، کاتێك زانیم وا بەڕووتی لەشوقەیەکدام ... شۆفێرە پاکستانیەکە و هاوڕێ کەی کاری خراپیان لەگەلّدا کردووم ... منیش دەستم کرد بەهاوارکردن ... چی بکەم .... کچەکە بەردەوام بوو لەگێڕانەوەی ئەم ووتانە و تی: بەدەم هاوار کردنەوە خۆم گۆڕی . پاکستانیەکە هاتە لام و وتی: تۆ زۆر بلّێیت ، لێرە دەمێنیتەوە یان بت بەمەوە بۆ مالّ ... بەگالّتە جارێوە ووتی جارێکی تر سواری ئۆتۆمبیلی جۆری لەیموزین نەبیت ... زۆر دەترسام نەم دەزانی چی بکەم ... بیرم لەهاوسەرە داماوەکەم دەکردەوە ئەگەر بەمە بزانێت ، بیرم لەم کەژاوەی خێزانیمان و دواڕۆژم و کەرامەتم و کەس و کارم و دایك و باوکم و براکانم دەکردەوە ... بەلاّم کابرا پاکستانیەکە بیرکردنەوەمی بچڕاند بەنیشاندانی چەندین وێنەم کە بەڕووتی گرتبووی ، لەو کاتی بێ ئاگاییەمدا و هەڕەشەی لێ دەکردم بەم وێنانە . بەم شێوەیە زۆر بەئازاردەوە ڕازیبووم کە بمباتەوە بۆ مالّەوە کە گەیشتمە بەردەرگا وویستم دابەزم پاکستانیەکە ووتی گوێ بگرە هەر کەگەیشتیتە مالّەوە ڕاستەوخۆ تەلەفۆنم بۆ بکە ... ئەگەر نەی کەیت ئەوا وێنەکانت بەدەرگای خانووەکەتاندا هەلّدەواسم کە گەڕامەوە شوقەکەمان بەگریانەوە تەلەفۆنم بۆ کرد ، چونکە ڕەقەمەکەی دابوو پێم ، پێی ووتم هیچم لێت ناوێت تەنها کە تەلەفۆنم بۆ کردیت وەلاّمم بدەرەوە و وەرە دەردوە ، ئەگەر وا نەکەیت خۆت دەزانیت چی ڕوودەدات . کچەکە ووتەکانی خۆی تەواو کرد ووتی : لەسەرەتاوە ووتم بێ دەنگ دەبم و وەلاّمی نادەمەوە ئەگەر تەلەفۆنیشی بۆ کردم چونکە دەم ویست ئەم ڕووداوە بشارمەوە . کاتێك هاوسەرەکەم هاتەوە بۆمالّ پرسیاری لێکردم چووی بۆ بازاڕ ؟ لەبەر خۆمەوە ووتم : ئەم چیرۆکە باسبکەم ؟ بەلاّم زۆر لەهەلّوێستی هاوسەرەکەم دەترسام ئایا توندە یان نا؟ بەلاّم زۆر لەناوبانگ و دواڕۆژم دەترسام بەهەر حالّ وەلاّمم دایەوە ووتم نا نەچووم بۆ بازاڕ ، بە هاوسەرەکەم ووت خواردنی شێوانت بۆ بهێنم ؟ هاوسەرەکەم وەلاّمی دامەوە: نا ئەمەوێ بخەوم چونکە زۆر هیلاکم ، هاوسەرەکەم چوو بنووێت ، منیش دانیشتم تەلەفزیۆنم دەکرد ،ڕاستە تەماشای زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنیم دەکرد. بەلاّم لەمێشکمدا زنجیرە تەلەفزیۆنیەکەی تر کاری دەکرد . لەم ئەندێشانەدا بووم کابرای پاکستانی تەلەفۆنی کرد منیش وەلاّمم نەدایەوە و دامخست . جارێکی تر پەیوەندی کردەوە بەهەمان شێوە تەلە فۆنەکەم داخست بە ڕوویدا . بەلاّم کە سێ

یەم جار تەلەفۆنی کردەوە ، گوێم لێ بو وتی : برۆ تەماشای وێنە جوانەکانت بکە کە هەڵم واسیوە بەدەرگاکەدا ، بەخێرایی بەرەو دەرگای دەرەوە ڕۆیشتم بینیم وێنەیەکی زۆرمی هەڵواسیوە هەمووی ڕووت !! منیش بەخێرایی هەموویم دڕاند ، پاشان چاودڕێم کرد کە جارێکی تر پەیوەندی بکاتەوە ، تەلە فۆنی کردەوە ووتی: دەبێت ئەوە بکەیت کە من دەمەوێت هەوڵی ڕاکردن مەدە لێم . پێم ووت :( زۆریش دەترسام پیاوەکەم هەستێ یان گوێی لێ بێت) ، ئەی کوڕی خەڵکی ، خوا ڕەحم بەدایك و باوکت بکات من شووم کردووە چەندێ پارەت بوێت دەت دەمێ ، تەنها لێم گەڕێ. وەڵامی دامەوە و وتی: ئەگەر یەك ملێۆن ڕیاڵم بدەیتێ ڕازی نابم ، گوێ بگرە ، سبەی شەو دێم دەت بەم ، پێم ووت : ناتوانم پیاوەکەم لەماڵ دەبێت ، بەهەر حاڵ ئەبێ لەگەڵم ڕێك بکەویت ، هەر کاتێ پیاوەکەت لەماڵ نەبوو شەوان بەهۆی کاردەوە یان بەڕۆژ لەکاتی کار کردنیدا تەلەفۆنم بۆ کردیت دەبێت ئامادەبیت .

ماوەی دوومانگە من ئەم حاڵە ناخۆشەم هەیە ، ئەو پاردیە شی پێم دەدرێت هەمووی دەبات بۆ خۆی .

بەم شێوەیە ئەم کچە چیرۆکەکەی تەواو کرد.

لێرەوە ئەم گەنجە کە ئەم پیاوە پاکستانیە کچەکەی بۆ هێنا بوو لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت ، بەردەوام بوو لەووتەکانی : دەستم کرد بەگریان ، هەستم دەکرد بورکانێك لەناخم دایە و لەتەقینەوەدایە ، ئەگەر ئەو بورکانەی ناخم بتەقێتەوە هەموو دەورو بەری دەسوتانم چونکە زۆر غیرەتم جولابوو زۆر توڕەبووم .

بەهەرحاڵ هەردووکمان ڕێك کەوتین کە ئەم کێشەیە بەم شێوەیە بمێنێتەوە و چارەسەرەکەشی بداتە دەستی من . ڕازیبووم نەم نهێنیە بپارێزم پەیمانمان بەیەکتردا. هەردووکمان ڕێك کەوتین کە جارێکی تر کاتژمێری دوو نیوی شەو بێتەوە بۆلام. دواتر کچەکە پەیوەندی کرد بە پیاوە پاکستانیەکەوە بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆ ماڵ . کاتێك هات منیش وام نیشان دا کە زۆر متمانەم پێیەتی بۆ ئەوەی هەست بەهیچ نەکات . پێم ووت بەخوا تو مەلعونیت خۆزگایە لەمێژەوە هاوڕێم بویتایە . لەخەیاڵم دا بوو بچم بۆ لبنان بەڵام مادام تۆ لێرە بیت من ناڕۆم .

پاکستانیەکە بەخۆشی یەوە سەری ڕاوەشاند و وتی: تۆ ئێستا ژمارەی تەلەفۆنەکەم دەزانیت پێویستست بە عارەق ، حەشیشە. کچ ی زۆر هەرشتێك هەبوو پەیوەندیم پێوەبکە.

لەیادم نەچێتەوە لەو ڕۆژەوە کە لەگەڵ ئەو شۆفێرە پاکستانیەدا یەکترمان ناسی ، کاتێ دەستی کرد بەگفتوگۆ لەگەڵمدا ، منیش پێم ووت ئەو هەموو شتە هەیە ؟ ئەزانن چی پێم ووت؟

ووتی: گەنجەکان کچیان دەوێت ، وەکچەکانیش گەنجیان دەوێت وە من کچیان بۆ دەهێنم ، پاشان ئەوانیش داوای من ئەم کارە دەکەن منیش پارەی زۆرم دەست دەکەوێت دەچم بۆ وولاتێکی تر .

بەهەر حالْ دوای ئەوەی کە کچەکە لە لام ڕۆیشت ، بەڕاستی خەو لەچاوەکانم تۆراو خەوم لیْ نەکەوت ، چی بکەم خوایە گیان ؟ تەلەفزیۆنەکەم کوژاندەوە و دەستم کرد بەگریان ، بەڕاستی هەستم بە گریانی ڕاستی بەم شێوەیە نەکردبووە ، دەگریام و دەپاڕامەوە لەخوا کە بەسەرهاتی ئەم کچە بپۆشیْ ، بەلاّم هیچ دەسەلاّتم نەبوو داوای لێخۆشبونم کرد لەخوای گەوردو نەزرم کرد کە تەوبە بکەم ئەگەر خوای گەورە ڕێگەچارەی ئەم کێشەیەم نیشان بدات.. هەستم دەکرد کە ئەگەر ئەم کێشەیە بگاتە بنکەکانی پۆلیس و دەزگاکانی لێپرسینەوە ئەم کچە بەشێوەیەکی ناخۆش ئاشکرادەبێت هەندیْ کات وا بەبیرمدا دەهات کە خودی دەزگای لێپرسینەوەکان ئابڕو چونێکی گەوردیە ...بیْ گومان منیش گەنجێکی هۆش وبیر خراپ بووم هاوڕیْ و برادەری خراپم زۆر بوو..کەسێکیش بەم شێوەیە بێت هەرگیز خۆشی بەداموودەزگاکانی لێپرسینەوە نایەت.

بەلاّم خوای گەورە ڕیچ نیشاندەری هەرکەسێکە کە خۆی مەبەستی بێت بۆ سەر شارێگای هیدایەت.

لەمالْ دەرچووم.کەسیش لەمالْ نەبوو...گەیشتمە سەر ڕێگا کەوهەر لەلەبیرکردنەوەدا بوو..ئا لەو کاتەدا شتێك بەبیرم داهات ..ئەزانن چی یە؟سوێند بەخودا خۆشم نەم زانی چۆن ئەو شتە بەبیرمدا هات..کاتژمێر سیْ ی شەو بوو.. بەخۆمم گوت:دەنووم بەیانی خێردەبێت بەیارمەتی خودا...بێگومان لەبەر زۆری بیرکردنەوە ئەو شەوە خەوم ليْ نەکەوت... بەڕاستی پێتانی دەلێم :سیْ یەکی کۆتایی شەو هەستام نوێژم کرد وە نوێژی بەیانیم لەکاتی خۆیدا کرد..لەژیانمدا ئەمە یەکمجار بووە کە شەو هەستم نوێژ بکەم...داوای لێخۆشبون دەکەم لە خوای گەورە داواکارم ليْ ی کە دامەزراوم بکات.

پاش چاوەڕوانیەکی زۆر بەیانی هات..بڕیارم دابوو کە ئەوەی لەبیرمدایە جیْ بەجیْ بکەم..ڕۆیشتم بۆ لای یەکێك لەپیاوانی دەزگا کە بەپاکی ناوبانگی دەرکردبوو ئەگەر دەزانن ئەو پیاوە کیْ یە باوەڕم پیْ ناکەن ..ئەو پیاوە زیاد لەچەند جار منی دەستگیر کردبوو لەبەر ئەوەی من ڕێگەم بە ئافرەتان دەگرد بەناوی خۆشەویستی یەوە...پاك وبیْ گەردی بۆ خوا(سبحان الله) زۆر رقم ليْ ی بوو خۆزگەم دەخواست کە بمریْ...

بەهەر حالْ لەمەلبەندی دەزگاکە پرسیاریم کرد پێیان ووتم:بۆ ڕاپەڕاندنی کارێك دەرچۆتە دەردوە..ووتم کەی دێتەوە.کارێکی زۆر گرنگم پێیەتی ...یەکێك لە پیاوەکانی فەرمانگەکە وەلاّمی دامەوە:ئەی گەنج تۆ کێیت؟من تۆم لە شوێنێك بینوە..شێوەت نامۆنیە لەلام .بەڕاستی ناوبانگم

باش نەبوو.ناسراو بووم بەوەی کەرێ بەکچان دەگرم هەرچونێك بێت تکام لێ کرد کەبم گەیەنێتەلای ئەو پیاوەی کەمەبەستم بوو،پێم ووت ئەوەی کە بۆی هاتووم ژیان ومردنی تێدایە..ئەو برایە لە فەرمانگەکە کەمتەرخەمی نەکرد و پەیوەندی پێوە کرد،دوای چارەکێك پیاوەکە گەیشتە بنکەکە..ئەم جارەیان چیرۆکەکەت چی یە ...بەتەمای چیت ؟داواکارم لەخوا کەرێنمایت بکات.

نەم هێشت ووتەکانی تەواو بکات ..پێم ووت :پێوویستم پێتە بۆکارێکی زۆر گرنگ کە ژیان ومردنی تێدایە و چارەسەرکەشی لەلای تۆیە..

وەلأمی دامەوە:خێر دەبێت بەیارمەتی خوا..

ووتم:بەخوا هەمووی شەڕە..

ئەم پیاوە (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ی کرد و ووتی چیت دەوێت؟ پێم ووت :ئەمەوێت لەگەڵمدا بێیتەوە بۆ ماڵ..

پیاوەکە گومانی هەبوو لەووتەکانم ،هەستم کرد لێم ترسا،بەناڕەزای یەوە ووتی: لەگەڵتا بێمەوە بۆ ماڵ؟

ووتەکانم پێبڕی و..ووتم هەرجێگایەکی تر جگەلەم بنکەیە ..تۆ جێگاکە دیاری بکە گرنگ ئەوەیە تەنها من وتۆ لێبێت ..پاش زۆرلێ کردن ڕازی بوو،بانگم کرد بۆ خواردنەوەی قاوە..بێ گومان ئەم پیاوە باوەڕی وابوو کە ئەم کارە ئەوەناهێنێت کە من دەیکەم.

ئەڕۆشتین بۆ خواردنەوەی قاوەکە سواری ئۆتۆمبیلەکەی ئەو بووین چونکە ئۆتۆمبیلەکەی من پڕبوو لە دوکەڵی جگەرەوو کاسێتی خراپ.. چیرۆکەکەم بۆگێڕایەوە، ئەوەی کەڕووی داوە لەنێوان من و ئەو کچەدا.

هەستم کر ئەم پیاوە پۆلیسە گومانی هەیە لەقسەکانم ..بێ گومان ئەمەش بەهۆی ئەو ڕەووشتە ناپەسەندانەی کە پێشووتر هەمبوو.. وادیار بوو شتەکان بەمێشکی دا نەدەچوو.لەبەر ئەو هەمووخەفەتە زۆرەی کە هەمبوو حەزم دەکرد زوو باوەڕم پێ بکات ، تەنها مەبەستیشم لەم کارەدا ڕەزامەندی پەروەردگار بوو . دەستم کرد بەگریان ، ئەویش هێمنی دەکردمەوە و دڵی دەدامەوە و دەی گوت خوا هیدایەتت بدات .

پیاوی دەزگاکە هیچ پرسیاری نەکرد ، بەڕاستی ئەم جۆرە پیاوانە زۆر ووریاو زیرەکن ، بواری پێدام هەرچی هەبوو بۆیم گێڕایەوە ، پێش ئەوەی ئەو دەست بکات بەگفتوگۆکردن :هەرچی

هەبوو بۆیم گێڕایەوە ..پێش ئەوەی ئەو دەست بكات بەگفتوگۆكردن :هەرچی دەڵێن باسی دەكەم وە هاوكاریتان دەكەم بەلاّم یەك مەرجم هەیە تكاتان لیّ دەكەم كەرازی بن..

وەلاّمی دامەوە :مەرجەكەت چی یە؟

ووتم:كچەكە..

پیاوی دەزگاكە ووتی :كچ..چی یەتی خوا هیدایەتت بدات.

پێم ووت:ئەمەوێت ئەم كچە هیچ پەیوەندی یەكی بەم بابەتەوە نەبێت،من ئەمەوێت ئەم باسە ئاشكرا نەبێت ئەم نهێنی یەبشارمەوە..هەر زانیاریێكتان دەوێت لەمنی داوابكەن،بەلاّم تكایە نامەوێت ئەم كچەیە..بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بەم بابەتەوە نەبێت ،نەلەكاتی لێپرسینەوەدا و نەلەكاتی تەحقیقدا،چونكە ئەگەر ئەم ئافرەتە بۆ ئەم شتانەبانگ بكەن هەواڵەكان دەگاتەوە هاوسەرەكەی وناوی دەزڕێت.

پیاوی دەزگاكە وەلاّمی دایەوە كە هەمووداواكاری یەكانت جیّ بەجیّ دەكەم ...لەسەرەتاوە زۆر متمانەم پیّ نەبوو،بەلاّم متمانەم بەخوای گەورە بوو...

لەدوایدا پێم ووت چون باوەڕبكەم كە تۆ ئەم كچە بانگ ناكەیت بۆ پرسیار كردن یان ئایا كێشەی بۆ نابێت؟

پاشان پەیمانی پێدام كە سوێندبەخوا بانگی ناكەین ..منیش دلّ ئارام بووم دلّم ئارامی نەدەگرت دووبارە پێم ووت چی زامنی ئەوە دەكات كە ئێوە پابەندی ئەم بەڵێنە دەبن لەكاتێكدا ناو شۆرەتتان زۆر خراپە!من ڕوو بەڕووی خۆت پێت دەڵێم..

ئەم پیاوە پێكەنی و ئەم فەرموودەی پێغەمبەری(صلی الله علیە وسلم)بۆ خوێندمەوە(ومن ستر مؤمنا سترە الله فی الدنیا والاخیرە)..رواە مسلم واتە ئەوەی كێشەو گرفتێكی باوەڕ دارێك دابپۆشێت و باسی نەكات لەلای خەلكی ،ئەوا خوا لەژیانی دنیاو و ڕۆژی دوای ئاگای لیّ دەبێت ونهێنی یەكانی دادەپۆشێت.

بەم شێوە دلّ ئارام بوو،پشتم بەخوا بەست،فەرمووم لیّ كرد بۆ ماڵەوەمان ئەو نەخشەیە وپلانەی كەدامان ناوە بۆ گرتنی ئەو پاكستانیە و باندەكەی،ئەم شێوەیە نەخشەكەمان دارشت و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

بەم شیوەیە هەر لەبیركردنەوەدا بووم،هاوڕیّ كانم هەر تەلەفۆنیان بۆ دەكردم منیش وەلاّمم نەدەدانەوە،وا گومانیان دەبرد كەمنیش سەفەرم كردودو لەمالّ نیم،چونكە كە سوكارم لەگەشتێكدا بوون.

بەهەرحاڵ..ژمارەی تەلەفۆنی کچەکەم لابوو..پەیوەندیم پێوەکرد رێك کەوتین لەسەر کاتێك کەبێت بۆلام...داوای لێکردم کەپەلەی لێ نەکەم تاکتێکی گونجاو دەدۆزمەوە...

دوایی رازی بوو لەسەر کاتێك..بەلاّم زۆر دەپاڕایەوە کە ئەم شتانە بانهێنی بێت...منیش ووتم حەزدەکەم لەبرا زیاتر حسابم بۆبکەی..زۆر ئەمەم پێ ووتبوو بەلاّم دڵی هەردەترسا..تاپێش داخستنی تەلەفۆنەکە ووتم ..ئەلو..بوەستە پێش ئەوەی تەلەفۆنەکەت دبخەیت.. ئەویش واتە (کچەکە) ووتی بەڵێ فەرموو..منیش ووتم..نوێژی سێ یەکی کۆتایی شەووت بیرنەچێت چونکە خوای گەورە دێتە ئاسمانی دنیاو دەفەرموویت کێ نزاو پاڕانەوە دەکات تاقبوڵی بکەم کێ داوام لێ دەکات تاپێی ببەخشم...

کچەکە بەووتنی ئەم ووشانە زۆر کاریگەر بوو ...دەستی کرد بەگریان ووتی لەم ساتەوە تۆ چی بفەرموویت من وا دەکەم..

لەو ساتەدا قسەم بۆ نەدەکرا ، تەعبیرم بۆ نەدەهات ...کچەکە ووتی تکام وایە لە خوای گەورە لەدنیاو قیامەتدا سەربەرزت بکات..بەڕاستی هەستم کرد نزاکەی لەناخی دڵی یەوە دەردەچێت،منیش ووتم :داواکارم لە خوای گەورە ئەم نهێنی یە دابپۆشێت.

ئەو ڕۆژەهات کەلەسەری ڕێکەوتین تەلەفۆنم بۆ پاکستانیەکە کرد پاش هەواڵ پرسین دەستم کرد بەگفتوگۆکردن پێشی کەوتم لەقسەکردنەکەداو لێم پرسی ئەو کچەت لەیادە کە ماوەیەك پێش ئێستا بۆت هێنام ...پاکستانیەکە ووتی :بەڵێ لەیادمە چۆن نایناسم ؟!پێم ووت :ئەمڕۆ ئەمەوێت بۆم بێنیت کاتژمێر ١٠شەو لەشوێنی یەکەمجار ...پاکستانیەکە ووتی :کچی زۆرمان لەلایە لەو جوانترو منالّترن پێم ووت :نا..نا..من ئەو کچەم دەوێت کەیەکەمجار بۆت هێنام ووتی:باشە بەلاّم بە٢٠٠٠ ریاڵ پێم ووت :من بوومەتە کڕیارێکی باشی تۆ..١٠٠٠ ریاڵ بەسە .ووتی:یەکەمجار خاترم گرتی ..بەلاّم ئێستا نا ...هەرچونێك بێت دڵ نیام کردەوە و پێم ووت :پاردکان حازرن بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیای بەکەم ،ووتم :ئەمەوێت بەهەمان نرخی پێشوو ٢٠٠٠ ریاڵ .. حەشیشەشم دەوێت..هەروەها عارەق و مەیی ،پاشان پاکستانیەکە رازی بوو پاش هەوڵێکی زۆر کەحەشیشەو عارەق و کچەکەشم بۆ بێنێت بەرامبەر ٢٠٠٠ ریاڵ ..واتە کچەکە بە٢٠٠٠ ریاڵ و شتەکانی تریش بە١٠٠٠ ریاڵ ، هاوڕێکەم کە لە فەرمانگەکەبوو لەگەڵ لایەنە پەیوەی داردکان(پۆلیس ودەزگای ئاسایش )تەنسیقان کردبوو تاکاتژمێری (١)هات ..بێ گومان کاکەی پاکستانی کاتەکانی هەمووی(غرینتش) بوو زۆر تەواوبوو..لەهەمان کات گەیشتە جێ،هەرکەئۆتۆمبیلەکانی لەبەرامبەر ماڵەکە وەستاند،ڕاستەوخۆ پیاوانی پۆلیس و دەزگا چواردەوریان گرت..

هاوڕێ کەم لەدەزگاکە بوو ڕاستەوخۆ کچەکەیان سواری یەکێك لەئۆتۆمبیلەکان کرد لەگەڵ دوو پۆلیسدا..من تووشی (شۆك)بووم..لەبەر خۆمەوە ووتم :کوا ئەو هەموو پەیمان وقسانەی کە ئەم پیاوە لەگەڵ من کردی...بەخوا ڕاستە کە ئەڵێن پیاوانی ئەم دەزگایانە هەموویان حەیابەرن..پاشان من وپاکستانیەکە کەشیان برد لەگەڵ خۆیان بۆ فەرمانگە بۆ لێپرسینەوە..من هەربێ دەنگ بووم ..پاکستانیەکەیان هێنا خۆی و سەیاردەکەیان بەووردی پشکنی ، بێ گومان یەك ئەلبومی گەورە وێنەی ئافرەتی پێ بوو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر ژمارەی موبایل ..هەرچی بلێ ی پێ ی بوو؟!....

پاشان ئەفسەرەکە هاتەژوورەوە ،وەکو بلێ ی لێپرسینەوە لەگەڵ منیش دەکات ...منیش ڕاستەوخۆ دەستی هاوڕێ کەی خۆمم گرت کەلەفەرمانگەکەبوو...وەپێم ووت کوا پەیمان و ئەوئایات و فەرمووددانەی کە بۆت باسکردم ئێمە لەسەر چی ڕێك کەوتین.

وە...من زۆر پەلەم کرد بەلاّم ناحەقم نەبوو چونکە زۆر لەدوا ڕۆژی ئەو کچە بەسەزمانە دەترسام.

هاوڕێ کەم پێ ی ووتم:ئەوە چی ڕووی داوەلێت؟

پێم ووت:کوا کچەکە ؟بۆ کوێ برتان؟دەتەوێت؟دەتەوێت ئابڕوی بەریت...

وەلاّمی دایەوە:دڵنیابە کچەکە لەماڵی خۆیەتی .

پێم ووت:گاڵتەم لەگەڵ مەکە...درۆمەکە.

بەخێرای ووتی :ئەتوانی خۆت دڵنیابیت ئەگەر چی ئەو نەیدەزانی کەژمارەی تەلەفۆنەکەی لەلای منە(واتە پیاوی دەزگاکە) ئەی وویست هەردووکمان بڕۆین بۆماڵی کچەکە و دڵنیام بکات...

بەلاّم منیش زۆر بەخێرای تەلەفۆنەکەم دەرهێناو پەیوەندیم پێوەکرد...

کچەکە بەترسەوە ووتی:ئەلو بەلێ ...

منیش ووتم : سەلامی خوای گەورەت لێبێت ، بەلاّم زۆر دەترسا ، پێم ووت : داواکارم لەخوای گەورە تۆ و کچانی موسڵمانان بپارێزێت ، سوپاس بۆ خوا کێشەکەت بەرووی سپی یەوە تەواو بوو ، جارێکی تر ئاگات لە خۆت بێت .

بەبێ دەنگی کچەکە گوێی لێم گرتیوو ، لەیادمە کۆتا ووشەکە پێم ووت لەکاتێکدا پیاوی دەزگاکە و ئەفسەرەکەش نزیکم بوون کە : ئاگات لەخۆت بێت و ماڵەکەت بپارێزە ، ئامۆژگاریت دەکەم کە شەونوێژ بکەیت ، نزا بۆ هەرکەسێك بکە کە یارمەتی دایت سەرلەنوێ ژیانت دروست بکەیت

ئەم ئافرەتە نەی توانی خۆی بگرێت ڕاستەوخۆ دەستی کرد بەگریان ، دەستی کرد بەنزا کردن بۆ خۆم و دایکم و باوکم بۆ ئەوانەش کەیارمەتیان دا لەم کارەدا . پێش ئەوەی تەلەفۆنەکەی دابخات ووشەیەکی پێم ووت کە هەرگیز بیرم ناچێت، باوەڕم پێ ناکەن ئەگەر بڵێم تا ئێستا لە خوشك و براکانی خۆم نەم بیستووە ، ئەزانن چی پێ ووتم ؟

ووتی : لەمەولا لەخوشکی خۆت زیاتر حسابم بۆ بکە ، ئەگەر ڕۆژگاریش تێ پەڕی و شتێکت پێویست بوو من ئامادەدەبم بۆ یارمەتی دانت ، دوای ئەم گفتو گۆیانە خوا حافیزیمان کرد ، تەلەفۆنەکەی داخست هەندێ سەرم نەوی کرد و لەسەر کورسی یەکە هەستام تەماشای دوای خۆم کرد بینیم پیاوی دەزگاکە ( أستغفرالله) ی دەکرد ، ڕۆیشتم بۆ لای و دەستم کرد بەماچ کردنی دەستی و سەری ، ئەویش هەوڵی دەدا دوورم بخاتەوە لەخۆی ، ئەویش ووتی : خوا دامەزراوت بکات و ڕێ نمایمان بکات بۆ ڕێگای ڕاست . بەم شێوەیە چیرۆکی ئەم کچە تەواو بوو ، بەلام ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خوای خۆمدا دا بووم لەو شەوە تاریکەدا بەسەرم برد و جێ بەجێم کرد بەم شێوەیە بڕیارم دا بگەڕێمەوە سەر ڕێگای هیدایەت و بەخۆمدا بچمەوە ، لەو ڕۆژەوە نەم هێشتووە یەك فەرزی نوێژم بچێت وە زۆربەی شەوان شەو نوێژئەکەم ، بەڕاستی خوای گەورە دوعاو پاڕانەوەکانمی گیرا کرد ، هەرچی فەزڵ و سوپاسی هەیە هەمووی شایانی ئەوە .

شوفێرە پاکستانیەکەش دانی بە هەموو تاوانەکانیدا نا کە لەژمارە نەدەهات ، هاوڕێکەم کە لەدەزگابوو بۆی باسکردم کە لێپرسینەوەی زۆری لەگەڵدا کراو گشت هاوکارەکانی ئەم تۆڕە بەد ڕەوشتی یە و حەشیشە فرۆشە ئاشکرابوون ، کە ژمارەی ئۆتۆمبیلەکانیان (٨٥) هەشتاو پێنج سەیارەی لەیموزین بوون زۆربەیان پاکستانی بوون ، لەدوای ئەم ڕووداوە وە دەزگاکە فەتوای دا هیچ ئافرەتێ بەتەنها سواری ئۆتۆمبیل نەبێت (تەنها خۆی و شوفێر).

# (سەتەلایت)

## ئەوەی کە ژیانمی رووخاند

لەسەرەتای ژیانمدا کاری ئازادم دەکرد، بەفەزڵی خوداوە بازرگانیەکەم خێری زۆر دەکرد،ژیانیشم بەپرۆگرامێکی موسڵمانانە رێك کردبوو.

هیچ رۆژێك لەپێنج فەرزەی نوێـژی مزگەوت بەتایبـەتی بـەیانیان دوانەدەکەوتم،زۆر دڵـم خـۆش دەبوو کە دەم بیست لەشوێنێك ووتارێکی ئاینی هەیە دەچووم بۆ بیستنی ، ئەگەر لەشارۆچکەکەی خۆشـم نەبوایـە ، هەمیشە هـەوڵم دەدا لــە ریـزی پێشـەوەی مزگـەوت بم،زۆر بەختــەوەر بــووم لـەژیانمدا چونکــە خــوای گــەورە هاوســەرێکی زۆر بــاوەرداروگوێ رایــەڵی کردبــوو بەشــەریکی ژیانم.چەند کورو کچێکی پێ بەخشیم ئەوانیش (عادل و خالید وسوعاد وئەمەل) بوون

ئەم خێزانەم مەشخەڵێك بوو رێگای رۆشن دەکردەوە ومایەی کامەرانی و خۆشی دڵم بوون،رۆژگـار ووردە ووردە تێ پەری ومناڵەکانم گەورە بـوون و چونـە زانکۆ،زۆر تامـەزرۆی ئـەو رۆژە بـووم کە بەچاوی خۆم بینیم مناڵەکانم بروانامەکانیان بەدەست دێنن..

بەڵام رۆژگار لەسەر یەك شێواز تێ ناپەرێت پاك وبێ گەردی بۆ ئەو خوایەی کە خۆی نـاگۆرێت و گورانکاری دەکات.

دوای ئەوەی کە ژیانێکی خۆش و هێمنم بەسەر دەبرد لەگەڵ خێزانەکـەمدا،زۆر کامـەران بوویـن ، نزیکەکان و هاورێ کانم ئـیرەیی یـان پێـم دەبـرد...ئـەو رۆژە هـات کـە هـەموو شـتێك پێچەوانـەوە دەبـودوە،ژیـانم رووخـا بووبـە نەهامـەتی وبـەندبوون...بـوو بـە ژیـانی دەربـەدەری لـە رێگـاو بانەکاندا..بوو بەژیانی سواڵ کردن..کەواتە لێردوە ئەو سەرگوزشتەتان بۆ دەگێرمـەوە کـە هـەموو ژیانمی تێك شکاند وماڵ ومنداڵم دەربەدەر بوو؟!

رۆژێکیان (عادل) ی کورم کە لەناو مناڵەکانمدا لە هەموویان گەوردترە.هاتەوە بۆ ماڵ و ئـامێرێکی سەتەلایەتی پێ بووسەرم سورما لەم کارە ناشرینەی.بەتەماشاکردنێك کە پربـوو لـەبێزاری و رەق تەماشام کرد،پێم ووت:دەتەوێت چی بکەیت ووتی:سەتەلایت دابنێم بـۆ ئـەوەی تەماشـای کـە ناڵـە ئاسمانیەجیهانیەکان بکەم تاوەکو بەداخراوی و دوور لەجیهان نەژین.

زۆر ســەرم ســورما لــەم ووتانــەی(عــادل)ی کــورم کــە زۆر هێمــن و لەســەر خــۆو بەکەســایەتی بــوو...بەپەلـە وەکو شێر وەڵامـم دایـەوە:ئێمـە ئـەم کەناڵەئاسمانیانـەمان نـاوێت،چونکـە ئەمانـە دەرگایەکن لە دەرگاکانی بانگەوازکردن بـۆ خراپـەکاری و بـێ رەوشـتی ،مـرۆڤ هەرچـەندێ خـۆی

پابەندبکات بەپرۆگرامەبەسوودەکانەوەشەیتان فریووی‌دەدات بۆشتەخراپەکان......بەڕاستی بۆئەم بەلایەتەنهانەم پەندە دەوترێ کەدەڵێ:ژەهرەوتێکەڵ بەهەنگوین کراوە.

کوڕەکەم زۆرسوربوولەسەرقسەکانی و وتی:ئەگەرسەتەلایت دانەنرێت لەمماڵەدەردەچم وهەرگیزناگەڕێمەوە.لێرەدادایکی لەترسی ئەوەی جگەرگۆشەکەی تیانەچێت بەشداری کردو دەستی کرد بەگریان وپاڕانەوە.هەروەهامناڵەکانی ترم هەموویان لەگەڵ براکەیاندابوون وتێکڕادەستیان کردبەتکاکردن بۆئەوەی سەتەلایتیان بۆبکرم:بەڕاستی خوای گەورە ڕاستی فەرمووە( **ياأيهاالذين آمنوا إن من أزواجكم وأولادكم عدوالكم فاحذروهم** )التغابن ١٤.

پاش ئەم زۆرلێکردنەچووم.بۆلای هاوڕێکانم بۆئەوەی ڕاوێژیان لەگەڵ بکەم:هەندێکیان ووتیان دەبێت زۆربەتوندی نارازی بیت چونکەئەوکەناڵانەخراپن وڕووپۆشکراون بەپێشکەوتن وشارستانیەتی.وەئەوبەرنامەوفلیمانەی کەنیشانی دەدەن هەمووی خوڕەوشتی مناڵەکانمان تێک دەشکێنن.هەندێکی تریان دەیان ووت:دەبێت ڕازی بیت چونکەلەم قۆناغەدا مناڵەکانمان لەژێرچاودێری خۆماندان وەدەتوانیت ئاگات لێ یان بێت.هەروەهادەتوانیت تەماشای بەرنامە زانستی ونایینی وهەواڵەعەرەبی وجیهانیەکان بکەیت.

منیش ئەو بۆچوونەی دووەمم پێ باش بوو بریارم داکەئەم سەتەلایتە نەفرەت لێکراوە بینمەماڵەکەمەوە.

بەم شێوەیەئەم میوانە ڕەزاقورسەهاتەماڵەکەمەوە.منیش تەماشام نەدەکرد ڕۆژگارومانگەکان تێپەڕین هەرسووربووم لەسەربریارەکەم بەلام مناڵەکانم سەرمەست بووبوون بەتەماشاکردنی فلیم وزنجیرەتەلەفیزیۆنیەکان ونمایشە جلوبەرگیەکان.وەپێشبڕکێ ی شازادەی جوانی....وە تەماشاکردنی فلیمە ڕووت و دیمەنە سێکسی یەکان لەژێر ناوی ڕۆشنبیری سێکسی ...شەیتان پەتی زۆر درێژە و بەنارامە لەگەڵ ئەوەی نادەم بۆ لەخشتە بردنیان .چونکە ئەوە ئەو پەڕی هیوا و ئاواتیەتی...

بەم شێوەیە شەیتان دەستی کرد بە ووردە ڕاکێشانم سەرەتا فکرەکەی لەلاجوان کردم کەسەتەلایت دابنێم پاشان هانی دام کە گوێ لەهەواڵ و بەرنامە زانستی یەکان بگرم پاشان بەشەرمەوە تەماشای هەندێ دیمەنی ترم کرد؟!

پاشان هێدی هێدی دڵم هۆگری ئەو کەناڵەخراپانەبوو!؟دوای ئەوەی دڵم پەیوەیست بوو بەو قەناتە خراپانەوە.سوربوم لەسەر تەماشاکردنی ئەو دیمەنەسێکسیانەی کە ئافرەتەکان جموجۆڵی زۆر سەرنج ڕاکێش دەکەن بەڕووتی و لەو کاتەشدا قسەو جۆرە دەنگێکی سێکسی دەرەدەکەن کە زۆر خراپە.

بەم شێوەیە خۆم و منالەکانم چەند کاتژمێر دادەنیشتین بە دیار تەماشاکردنی ئەم جۆرە کە نالآنەوە کە ئافرەتی زۆر جوانیان پیشان دەدا... تاوەکو هێواش هێواش کەمتەرخەمیم لە نوێژکاندا دەکرد و بەتەواوی لەمزگەوت دوورکەوتمەوە.

ئەو فەرموودەی پێغەمبەرم (د.خ)لەیاد چووەوە کە دەفەرموێت یەکێك لەو کەسانەی کەلەژێر سێبەری عەرشی پەروەردگاردا دەبن کەسێکە دڵی هۆگربێ بەمزگەوتەوە.وای لێ هات لە نوێژەکانمدا دڵم هەر لەلای ئەو فیلمە عەرەبی و بیانی یانەبوو کە ئەو دیمەنە خۆشەویستی و سێکسیانەی تێدابوو.

بەم شێوەیە خۆم وخێزان و منالەکانیشم ڕۆچوین لەم کەنالە ئاسمانیانە...شەو ڕۆژمان بەسەر دەبرد بەدیار تەماشاکردنی ئەوەی خوا حەرامی کردووە.بەبێ ترس لەخوا...دەرئەنجامی ئەمەش وای لێ هات باوەڕ لەدڵەکانماندا لاوازبوو لەشوێنی ئەوەش دڵمان هۆگری تەماشاکردنی فلیم و شانۆ جا بەزمانی عەرەبی بێت.یان ئەوروپی.تەماشات دەکرد جاری وا هەبوو وامان لێ هاتبوو بەدیمەنێکی خەمبار دەگریاین..بەدیمەنێکی خۆشیش بەدەنگێکی زۆر بەرز پێ دەکەنین.بەم شێوەیە دڵم لەگەڵ شای فریودان هونەرمەند(مارلین مونرۆ)و(الیزابیپ تایلور)و (مادۆنا) هەروەها زۆری تر لەم کچە سەرنج ڕاکێش و جوانانە ئالوودەبوو.

ئەم سەرگەردانیەی شەیتان زیاتر بەهێزبوو تیایدا .بەم هێواش هێواشە تا گورزێکی کوشندە کەپشتی خۆم و خێزانەکەمی شکاند.

عادلی کوڕم ڕۆژانە خێزانەکەی دەکوشت.تا وای لێ هات ژیانیان ببوبە دۆزەخ بەتەواوی مانا...شتی وابە بیرمدانەدەهات کەبەم شێوەیە منالەکانم لەڕێگا دەرچن وبخلیسکێن و بەردو تیاچوون بڕۆن.

(عادل)ی کوڕە گەورەم لەڕێگای ئەنتەرنێت و نامە ناردنەوە پەیوەندی کرد بە کچە ڕۆژئاوای یەکەوە ...تارۆژێك تووشی سەرسوڕمانی کردین بەوەی کەماردی کردووە!!..

هەر بەوە شەوە نەوەستا بەڵکو ڕۆژێك ئەم کچەی هاوردەوە بۆ ماڵەوە؟ ..کوڕەکەم زۆر خۆشی دەویست و پارە و زێڕ وزیوی دەڕشت بەسەرئەو ژنەدا لەگەڵ ئەوەی من بەم ژن هاوردنە نەگونجاوەی ڕازی نەبووم ،بەتایبەت بۆ ئێمە ی موسڵمانان وئێمە پابەندین بە ڕێز و بەهاکۆمەلآیەتیەکانەوە.بەلآم ئەوان وەکو ئێمە ناڕواننە ئەو بەهایانە.(ڕوداوەکەی مونیکا لویسکی و کلینتۆن)و(سەر شۆڕی یەکانی کۆشکی شاهانەی بەریتانی) و دەیان ڕووداوی ناخۆش کە ڕۆژانە ڕوودەدەن.هەمووومان دەیزانین.

پەندەکە دەڵێت:دڕك هەر دڕك دەڕوێنێ و گوڵیش گوڵ دەڕوێنێ.

چەند مانگێ تێنەپەڕی بوو تاوای لێ هات ماڵمان بوە شوێنی کاری خراپ و پڕبوو لە ڕەووشتی ناشرین و نامۆ و بێ ڕەوشتی،خو ڕەووشتی خۆی چۆن بوو ماڵە کەشی والێ کرد.
ڕۆژێکیان (عادل)ی کوڕم توشی سەرسوڕمان و کتوپڕیەك بوو خێزانە ئەو روپیەکەی دۆستێکی خۆی هێنابوە ماڵەوە؟ (عادل)یش ڕاستەوخۆ دەمانچەکەی هێناو ژنەکەی خۆی و دۆستەکەشی کوشت،دەرئەنجامی ئەمەش ئەبوو(عادل)ی کوڕم بخرێتە بەندیخانەو...ئێستا چاوەڕێ یە، لەوانەیە لەسێ دارەبدرێت.بەم شێوەیە کوڕە گەورەکەم دۆڕاند وەمنیش هۆکاری ئەم تیاچوونەی بووم لەو ڕۆژەوە کە ڕێگام دا ئەم ئامێرانە بێنێتە ناو ماڵەکەوە،کوڕەکەم ناپاکی لە خێزانەکەی دەکرد ئەویش ناپاکی کرد،ڕاستەو وتراوە ئەوەی زینا کەر بێ زینای لەگەڵ دا ئەکرێ ئەگەر ماوەیەکی تریش بێت.چیرۆکی کوڕی دووەمم (خالید) بەم شێوەیەیە..چەندساڵێك دەرنەچوو بەهۆی شەونخونی ئالودە بوون بەتەماشاکردنی ئەو جۆرە کەناڵانەوە،دەرئەنجامی ئەمەش ئەوە بوو،دەستی کرد بەمادەی بێ هۆشکەر خواردن،وە دزی کردن لە دایکی تاوای لێ هات بوو بە دزێکی ناودار...باندێکی دزین و چونە سەرماڵانی دروست کرد بوو، دەچوونە سەر کۆگا بازرگانیەکان و ماڵی خەڵکی و هتد...چونکە ئەم مادە بێ هۆشکەرانە پێویستی بەپارەی زۆرە،بەم شێوە مایەوە تاڕۆژێ پیاوانی ئاسایش گرتیان و ئێستا دوانزە ساڵ حوکم دراوە...
هەروەها سوعادی کچیشم فەشەلی هێنا لە خوێندن بە هۆی زۆر راسب بوون و دەرنەچوونەوە..دڵی هۆگری گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقاو،تەماشاکردنی نمایشکردنی جل وبەرگ وهتد...بوو.
لەگەڵ کوڕێکدا یەکتریمان ناسی،کوڕێك زۆر ڕەوشت نزم کچەکەیشی لەگەڵ خۆیدا بەردوو دەریای خراپەکاری ڕاکێشت . کچەکەم سکی پڕ بوو؟!کوڕەکەیش بەمەی زانی هەڵ هات و خۆی لێ شاردەوە! کچە بەستەزمانەکەشم لەترسی ئەم سەر شۆڕیەیە هەڵ هات نەگەڕایەوە هیچ هەواڵی نازانم .هەروەها (ئەمەل)کچیشم لەهەموویان بچووکتر بوو کۆڕێك خۆشی دەویست هەتا بڵێی بێ باوەڕو خراپ بوو،لەوانە بوو کە دەیان ووت:ئایین تلیاکی گەلانە ئالودەی خواردنەوەبوو.ئەمەلی کچم زۆر کاریگەر بوو بە ژیانی هاوسەرەکەی و ئەویش ڕۆچووبوو لە خواردانەوەدا!
ڕۆژێکیان پیاوەکەی داوای شتێکی لێکردبوو ئەویش وەڵامی نەدابووەوە چونکە پیاوەکەی سەرخۆش بوو بێ ئاگابوو؟ئەم پیاوە سەر خۆش بێ ئاگایە دەستی کرد بوو بەهاوار هاوارو شوعورو هەستی لای خۆی نەمابوو ئەو شووشە عاردقەی بەدەستیەو بوو دابووی بەسەر کچەکەمدا و کچەکەم لەهۆش خۆی چوو بوو...ئێستا لە نەخۆشخانەی دەروونی یە تووشی شێتی وگەشکە بووە .

# سەتەلایتی شوم

رۆژیکیان ئەو پیاوە هات بۆلام ،کەسیك بوو وینەکەی بەلامەوە غەریب نەبوو، ئەم ناسی ..بەچاو تروکانی بە یادما تی پەریم .. کە هات بۆ لام زۆر شپرزەبوو، ئەت ووت هەموو خەمی دنیای لە کۆل ناوە، لەدەرگاکەدا وەستاو خۆی ناساند،هاورییەکم هەبوو سالان و رۆژگار دووری کردبووینە وە لەیەکتری ...زۆر بەگەرمی پیشوازیم لی کرد وا گومانم برد بۆ سەرانی کردنم هاتووە پاش ئەو دووری یە ...وویستم ریزی زۆری لی بگرم،بەلام زۆر بە پەلەبوو ،کیوی‌ك بوو لەخەم و پەژارە...پاشان داوای یارمەتی لی کردم بۆ ئەوەی ئەو چیرۆکەی کە پیبوو بۆمی بگیریتەوە،ووتی: هاوریم هەمیشە من گویم لەزانایان بوو کە تیایدا چۆن سەرزەنشتی یاخی بوانیان دەکرد لەوەی کەوا ئەنجامیان داوە،وەچۆن ئاگادارییانی دەکردەوە لەسزای ئاگر و خراپترین چارەنووس...بەلام من واگومانم دەبرد ئەم ووتارانە تۆزی لەراستی یەوە دوورە و تەنها هەرەشە ئامیزە وە زیادەرەوی زۆری تیایە...

لەو وانە و ئامۆژگاریانە ووتاری تیابوو لەسەر کەناله ئاسمانیەکان وشوینەواری...لەمزگەوت گویم لی دەگرت بەنابەدلی...

چەند جار زیاتر ئەو کەسانە لەمزگەوت نامیلکەی تایبەتیان دەداپیم کە پربوو لە چیرۆکی راست رووداوی دل تەزین ...کەدەم خویندەوە لەنەفسی خۆمەوە دەم ووت ئەم چیرۆکانە لەراستی وە دوورن ئەفسانەن لەگەل ئەوەشدا دەپرسی ، ئەمانە بۆچی ئەم قسانەمان بۆ دەکەن ؟ئەوان چ خەمی مال و خیزان منیان هەیە...هەر پرسیارم دەکرد و وەلامیکی دلنیام دەست نەدەکەوت ...هەندی جار دەم ووت ئەمە هەر غیرە بردنە و هیچی تر، ئەم قسانە بنەمایەکی واقیعی و زانستی نیە...هەموو ئەم ئامۆژگاری و چیرۆکانە نەبوونە بەر بەست لەبەردەما بۆ کرینی سەتەلایت،کەبریارمدابوو بیکرم.

قسەکردن لەسەر کەناله ومرزشی یەکان و گواستنەوەی تۆپ تۆپین کەبەکارت دەکرانەوە و،دانشتن و گوی گرتن لەبەرنامەکانی کەنالیجەزیرە (اتجاه المعاکس)هەموو سەر کاتژمیری هەوالی نوی و تازە هەیە و هتد..هەموو ئەمانە هاندەرم بوون ، هەروەها هاوری کانیشم بۆ کرینی ئەم سەتەلایەیە نەفرەت لی کراوە هاندەرم بوون ،لەلایەترەوە ئەو برە شەرمەی کەتیاما بوو ئەم بریاری کرینەی پی دوا دەخستم بەلام سوودی نەبوو...ئەوانەی پیشەوە کەباسم کرد هەرئەوانەی کەباسم کرد زالتر بوون .

زانستی نیە...هەموو ئەم ئامۆژگاری و چیرۆکانە نەبوونە بەر بەست لەبەردەما بۆ کڕینی سەتەلایت.کەبڕیارمدابوو بیکڕم.

قسەکردن لەسەر کەناڵە وەرزشی یەکان و گواستنەوەی تۆپ تۆپێن کەبەکارت دەکرانەوە و.دانشتن و گوێ گرتن لەبەرنامەکانی کەناڵیجەزیرە (اتجاه المعاکس)هەموو سەر کاتژمێرێ هەواڵی نوێ و تازە هەیە و هتد..هەموو ئەمانە هاندەرم بوون . هەروەها هاوڕێ کانیشم بۆ کڕیینی ئەم سەتەلایەتە نەفرەت لێ کراوە هاندەرم بوون .لەلایەترەوە ئەو برە شەرمەی کەتیاما بوو ئەم بڕیاری کڕینەی پێ دوا دەخستم بەلام سوودی نەبوو...ئەوانەی پێشەوە کەباسم کرد هەرئەوانەی کەباسم کرد زالتر بوون .

بەڵێ ئەم میوانە خراپە لەبەر خراپەییەکەی ڕازی نەبوو لە ناو حەوشەکەم بێت بەڵکو چووە سەربانی ماڵە پیرۆزەکەم.هاوسێ کانی دەوروبەرم کە سەحنەکەیان بینی لەسەر ماڵەکەم هەموویان بەپەلە ڕایان کرد بۆ لام و زۆر ئامۆژگاریان کردم کە ئەم کارە کۆتای باش نابێت...بەلام من هەر خۆگر بووم وەکو پاڵەوان.شەیتانیش هەرهانی دەدام و سووری دەکردم لەسەر کارەکەم ..خۆزگە وام نەکردایە ..خەلکەکە بەبێ ئەنجام گەڕانەوە... بەم شێوەیە ئەم سەرکەوتنە درۆینەم بەدەست هێناو کردمە دیاری دەستم بۆ خێزان و منالەکانم ...ئەوانیش پیرۆزباییان لێ کردم.

ڕۆژگار وورده وورده تێ دەپەڕی ،هەموو ڕۆژێ حەزو ئارەزووم زیادی دەکرد بەتایبەتی یاری تۆپ تۆپێن..هەروەها ئەو کەناڵە خراپانەی کەبەداخەوە هەموو خەلکی تەماشای دەکەن ،بەڕاستی هیچ کەسێ سەلامەت نابێ ئەگەر بەردەوام تەماشای ئەو کەناڵانەبکات... وەزۆر بەخۆشحاڵیمەوە هەرچیم دەبینی بۆ هاوڕێ کانم باسم دەکرد...هێواش هێواش هەستم دەکرد ئەفسم زۆر حەزی لێ دەکات و هەر کاتێکی بێ کاربم حەزدەکەم خەریکی تەماشا کردنیان ببم..بەلام هەر لەسەرەتاوە هەستم دەکرد هەنگاوەکانم ووردە ووردە قورس دەبن بۆ هاتوو چۆی مزگەوت ...بەگران قورئانم پێ دەخوێنرا.تووشی لەش بێ هێزی بووم . حەزم دەکرد زۆر کات لەماڵەوە بم تەماشای کەناڵەکان بکەم ...وازم لەمزگەوت و کەسە باشەکانی هێناو بێ بەش بووم لەوانەکانی قورئان فێربوون ...تا دەهات خەم و خەفتم زیادی دەکرد.بەلام هەر سوور بووم لەسەر مانەوەی ئەم ئامێرە...وام لێ هات بەو کەسانەی کە بەرەنگاریان دەکردم .پێم دەوتن ئێوە دوژمنی ئازادین...ڕۆژ و مانگەکان تێ پەڕین من و خێزانەکەم بەدەوری ئەم ئامێرە نەفرەت لێ کراوەدا دادەنیشین ...تەنها لە کاتی چوون بۆ فەرمانگەدا نەبێت.شەوان ناچار بووم لەبەر کاری بەیانی زووتر دەخەوتم ...بەلام منالەکانم و خێزانەکەم تا درەنگ بەدیاری یەوە دادەنیشتن... ڕۆژگار تێ پەڕی بەسەر ئالودەبوونی

ئەم کەنالانەدا ...ئەتوانم بڵێم چەند ساڵێکی خایاند، هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لەسەردتاوە تووشم بوون لەیادم چووبوون. سەرقاڵی ژیانی ڕۆژانە بووم .کاتم نەبوو وەکو جاران دانیشم بەیادی یەوە ...شەوان زۆر دەرنگ دەهاتمەوە جاری وا هەبوو پێش نوێژی بەیانی دەگەڕامەوە...بارودۆخی کاردەکەم ئاوای لێ کرد بووم...

لەیەکێك لە شەوە تاریکە ڕەشەکاندا دەرەنگانێك هاتمەوە بۆ ماڵ ڕاکشام لە جێگاکەم و کەس هەستی پێ نەکردم ...گوێم لە دەنگە دەنگێ بوو ..گوێم بۆی دەگرت بزانم چی یە ؟پچڕپچڕ و نادیار بوو تێ نەدەگەیشتم ...گومانم پەیداکرد هەستام وویستم بزانم چی یە؟بەردو دەنگەکە ڕۆشتم ...چووم بۆ ژووری هاوسەرەکەم کە دەرگاکەم کردەوە بینیم نوستوە..هەناسەیەکم هەڵکێشاو بیرو هۆشەشەیتانیەکەم لەسەر لاچوو! !سوپاسی خوام کرد و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم ...بەڵام دەنگەکە هەردەهات ...سەر لەنوێ هەستامەوە ووتم :لەوانەیە منالەکان بیریان چوە تەلەفزیۆنەکە بکوژێنەوە و خەو توونە..بەهێواشی ڕۆشتم تابزانم چی یە...بەڵێ گەیشتمە دەرگاکە زانیم دەنگەکان لەم ژوورەیە بەهێواشی وویستم دەرگاکە بکەمەوە.بەلام زۆری بەمەحکەمی توند داخرابوو وویستم لە کونی دەرگاکەوە تەماشا بکەم هەر هیچ دیار نەبوو ...زۆر گومانم پەیدا کرد ...دڵم زۆر بەخێرای لێ ی دەدا ...کات زۆر دەرنگە ...وا بانگی بەیانی دەدات تۆ بڵێ ی منالەکان تا ئێستا شەونخونی بکەن بەدیار سەتەلایتەکەوە...گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم بڕیارمدا بەیانی لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکەم ...

پێش ئەوەی بگەمە ژوورەکەی خۆم ، بیرم کەوتەوە کە ئەو ژوورە دەرگایەکی تریشی هەیە...کە گەیشتمە لای دەرگاکە سەیرم کرد کراوەتەوە ...کە دەرگاکەم کردەوە ... زۆر تێ ڕامام چی دەبینم خوایەگیان ...چی بکەم ...سەرم بکێشم بەدیوارەکەدا ...نا...من تووشی مووسیبەتێکی گەورە بووم ئەم سەر شۆڕی و ئابڕو چونە...بەڕاستی ئەمە کۆتاییەکی جەرگ بڕبوو..بەڵێ ئەی هاوڕێم چیت بۆ باس بکەم بینم کوڕەکەم لەگەڵ خوشکەکەی دا جوت بووە و ڕادەبووێرێ لەگەڵیدا ...خۆم پێ نەگیرا لەوەی کە بینیم هاوارێکی گەوردم کرد و بوورامەوە...هاوسەرەکەشم لەترسا بەپەلەهات و ئەویش بەچاوی خۆی ئەو دیمەنە دڵ تەزێنەی بینی....

ئاهو هەزار ئاه لەم سەتەلایتە شوومە ... ئەو سەتەلایتە بێ کوت و بەندەی ئەتکی خانەو بارودۆخمان دەکات بەڕۆشتنی کات و سات بەها جوانەکان پاکیزەیی ناهێڵێ و لەجێیدا بێ ئابڕۆیی و سەرشۆڕی بەدی دێنێت کچی بیست ساڵی چاودڕێی کۆرپەیەکە لەبەرئەنجامی بەد ڕەوشتی برا سەرگەردان و فاجیرەکەیەوە ...!

ئای ئاخ و داخ له پاکیزەیی لەدەس چوو ..ئای ئاخ و داخ لەوغیرەتەی لەبیرکرا .. ئای ئاخ و داخ بـۆ ئەو ئامۆژگاریانەی بۆم کراو هیچ گرنگیەکم پی نەدا ...

ئەمە چیرۆك و بەسەر هاتەکەم بوو کە بـۆم گیرانـەوە ، بەراسـتی دەمـم گرمۆلەیـە لەگیرانـەوەی جەسـتەم تـەزوی پیـدا دیـت و پـاکیزەیی خـۆم و خیزانەکـەم لەدەسـت دا ، بـەلام پیـم خـۆش بـوو بیگیرمەوە بەلکو ئەمە خوایە کەلکی لی ببینری و دەروونە بی ئاگاکان سوود بـەخش بـن لیـی ... ئەگینا لەکەسانی تر زیاد لەوەی من هەیە ... بـەلام ئایـا ئاگـاداری نـین یـان نـاتوانن باسـی بکـەن ، کاتیك ئەمـەش بـاس دەکـەم بـۆ ئەوەیـە لـەدوا رۆژدا لیپرسـینەوەی خـۆم سـوکتر بکـەم و ئـەو شوینەوارە خراپانە ئاشکرا کەم و بیـانوی کەسـانی تـر بـبرم لـەوەی کەمتـەرخـەمی بکـەن لەمـەدا ، خوایە گیان وا گەیاندم ، خوایە گیان تۆ شاهید بە

## ئەو پەیوەندیە تەلەفۆنیەی هەموو ژیانی گۆریم

زەنگی تەلەفۆن وردە وردە بەرزدەبوەوە...و شیخ محمد لە خەویکی قولدا بوو، دەنگە ناخۆشەکەی تەلەفۆنەکە خەوەکەی پی بری و محمد چاوەکانی کردەوە ...سەیریکی کاتژمیرەکەی سـەمیزەکەی لاتەنیشتی کرد ، چارەکی سی یەمی شەوبوو .شیـخ محمـد پیشتر چـاوەروانی پەیوەندیـەکی گرنـگ بوو کە بۆی بکریت، هەر کە جەرەسی تەلەفۆنەکە لییدا لەوکاتە درەنگەدا وای زانی کە ئەمە ئـەو پیوەندیەیە کە ئەم مەبەست و چاوەروانی بوو . لەناو جیگاکـەی هەسـتاو تەلەفۆنەکـەی هـەلگرت وپیی ووت بەلی السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته . دوای ئەمە گویی لەدەنگیکی نەرمی ئافرەتانـە

# ئەو پەیوەندیە تەلەفۆنیەی هەموو ژیانی گۆڕیم

زەنگی تەلەفۆن وردە وردە بەرزدەبوەوە...و شێخ محمد لە خەوێکی قوڵدا بوو، دەنگە ناخۆشەکەی تەلەفۆنەکە خەوەکەی پێ بڕی و محمد چاوەکانی کردەوە ...سەیرێکی کاتژمێرەکەی سەمێزەکەی لاتەنیشتی کرد ، چارەکی سێ یەمی شەوبوو .شێخ محمد پێشتر چاوەڕوانی پەیوەندیەکی گرنگ بوو کە بۆی بکرێت. هەر کە جەرەسی تەلەفۆنەکە لێیدا لەوکاتە دەرەنگەدا وای زانی کە ئەمە ئەو پیوەندیەیە کە ئەم مەبەستێ و چاوەڕوانی بوو . لەناو جێگاکەی هەستاو تەلەفۆنەکەی هەڵگرت وپێی ووت بەڵێ السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە . دوای ئەمە گوێی لەدەنگێکی نەرمی ئافرەتانە بوو دەیوت : ببورە دەتوانیت ئەم شەو لەگەڵمدا بمێنیتەوە لەرێگای تەلەفۆنەکەتەوە ؟ ئەمیش بەسەرسوڕمانەوە ووتی : ئەوە چی دەڵێیت ؟! تۆ کێیت؟!! ئافرەتەکەش بەدەنگێکی ناسك ووتی من ناوم (أشواق) ە و پێم خۆشە بتناسم و ببین بە هاوڕێ ... ئایا تۆ ڕازیت ؟!! شێخ محمد زانی ئەم کیژە لاوە خۆی وون کردووە ئەم شەو نەنوستووە لەبەرئەوەی دەناڵێنێت بەدەس قەیرانێکی دەروونی یان سۆزداریەوە . وە دەیەوێت لەوقەیرانە ڕابکات بەگاڵتەکردن بەژمارەی تەلەفۆنەکان؟!! شێخ پێی ووت :خوشکم. بۆچی هەتا ئێستا نەنوستووی ؟!! بەپێکەنینێکی بریندارانەوە ووتی : من بەشەوان بخەوم ؟!! ئایا تۆ بیستوتە عاشق بەشەوان بخەوێت ؟ شەو بریتیە لە ڕۆژی عاشقان . شێخ یش بەلەسەرخۆییەوە وەڵامی دایەوە : تکادەکەم ئەگەر دەتەوێ بەردەوام بین لەقسەکردن دوورکەوەرەوە لەم پێکەنینە گاڵتە جاڕیانە و ئەم دەنگە سەرنج ڕاکێشە رانە. من کەسێك نیم حەز بەم شتە بێ هودانە بکەم . بۆماوەیەك ئافرەتەکە بێ دەنگ بوو بە خۆیدا چوەوە ... ووتی ببورە . مەبەستم ئەوەنەبوو. ئەمجا محمد بەگاڵتەیەکەوە پێی ووت : کێ یە ئەو کەسە خۆشبەختەی کە تۆعاشقی بوویت؟ ئافرەتەکەش ووتی : بێ گومان تۆیت . بەسەرسوڕمانەوە ووتی من ؟!! چۆن تۆ عاشقی من بویت بەڵام نەئەم ناسیت و نەمنت دیوە؟! ئافرەتەکە پێی ووت : من شت گەلێکی زۆرم دەربارەی تۆ بیستوە لە هاوڕێکانی کۆلێجەکەمەوە ... وەچەند بەرهەمێکی تۆم خوێندوەتەوە .منیش سەرسام بووم بەو دارشتنە پڕسۆزونەرمەی تۆ . هەندێ جار گوێ ی مرۆڤ لەپێش چاودا عاشق دەبێت محمد پێی ووت : باشە بەبێ پێچ و پەنا تۆ چۆن شەوگار دەگوزەرێنیت ؟ ئافرەتەکەش ووتی : من شەوانە لەگەڵ سێ تاچوار گەنجدا قسەدەکەم !! لەژمارەیەکەوە دەچم بۆ ژمارەیەکی تر و لەگەنجێکەوە دەچم بۆ گەنجێکی تر لەرێگای

تەلەفۆنەوە، لەگەڵ یەکێکدا ناکۆکم وەلەگەڵ یەکێکی تردا پێدەکەنم . دانەیەکی تر بەرێدەکەم و وەعد بەدانەیەکی تر دەدەم، وە لەگەڵ یەکێکی تردا درۆدەکەم . وەلەهەندێك گوێ لەشیعری دڵداری دەگرم وە لەهەندێکی گوێ لەگۆرانی دەگرم هەر بەم شێوەیە تا بەردەبەیان !! وە ئەم شەو ویستم لەگەڵ تۆدا پەیوەندی بگرم بزانم تۆش وەك ئەوان وایت یان جیاوازیت ؟!! شێخ پێی ووت پێش من لەگەڵ کێ قسەت دەکرد بەتەلەفۆن ؟!! کەمێك بێ دەنگ بوو ووتی بێ پێچ و پەنا لەگەڵ (ولید) دا قسەم دەکرد کە ئەو عاشقێکی تازەیەو گەنجێکی جوان و ڕێکە ئەم ڕۆ لەبازاڕ ڕەقەمەکەی پێ دام و منیش بۆ ماوەی نیوکاتژمێر قسەم لەگەڵدا کرد . شێخ محمد یەکسەر ووتی ئەی دوایی چی ؟ ئایە ئەوەی کەبەدوایدا دەگەڕای دۆزیتەوە ؟ بەدەنگێکی کزۆڵی ماتەمەوە ووتی بەداخەوە ئەم دۆزیەوە نە لای ئەو و نەلای ئەو گەنجە زۆرەی کە قسەم لەگەڵدا کردوون لەڕێگەی تەلەفۆنەوە . یان ڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵدا کردوون ئەم دۆزیەوە ئەوەی برسێتی دەرونم تێر دەکات و وە تینوێتی دەروونم ئاوبدات .پاش کەمێك بێ دەنگی ووتی ئەمانە هەموو گەنجێکی تازە پێگەیشتووی ئارەزووبازن . خیانەت کارن درۆزنن هەستیان ڕاستەقینە نیەو دووڕوون . قسەو گفتارەکانیان زیادەڕۆیی تێدایە لەلایەکی زوبانیانەوە دەردەچێ نەك لەدڵیانەوە. قسەکانیان لەهەنگوین شیرین ترە و دڵەکانیان وەك دڵی گورگێکی دڕندە وایە. ئامانجی هەریەکەیان ئەوەیە ئارەزووی قێزەوونی خۆیان بەمن بشکێنن . دوای ئەوە فڕێم بدەن وەك چۆن پێڵاوی کۆن فڕێ دەدرێت، هەموویان تەنها نەفسی خۆیان بەگرنگ دەزانن و بەس . تائێستا ئەم دۆزیوەتەوە سەرەڕای ئەو هەموو پەیوەندیە کردنە بەو کوڕانەی کە بایەخیان پێدەدام .لەبەرمن و لەبەر کەسایەتیم هەموویان سوێندیان بۆ خواردووم کەوا منیان خۆش دەوێت و عاشقی کەسی ترنین جگە لەمن ، وە هاوسەری تریان ناوێت جگە لەمن . بەڵام من باش دەزانم کە ئەوانە هەموویان لەتەلەفۆندا بەنەرم و شرینترین دەستەواژە قسەم لەگەڵدا دەکەن ، هەرپاش ئەوەی کە تەلەفۆنەکە دادەخەن بەخراپ ترین سیفەت و وشە باسم دەکەن . ژیانی من لەگەڵ ئەواندا بریتیە لە فێڵ و تەڵەکەبازی . هەریەك لەئێمە ئەوی تر هەڵدەسەنگێنێت . وە وای تێدەگەیەنێت کەوا خۆشی دەوێت لەم کاتەدا شێخ پێی ووت . تۆ پێم بڵێ مادام تۆ تائێستا ئەو بزربووەی چاوەڕێتە لەلای ئەو کۆمەڵە گەنجە سەر لێتێکچوانە نەت دۆزیوەتەوە . ئایە دەچێتە عەقڵتەوە کە لای من بیدۆزیتەوە ؟!! من نەووشەی عاشقانەم لەلایەو نەقسەی خەیاڵ پلاو دەکەم و نەشیعری غەزەل دەزانم و نەنامەی بۆن خۆشم هەیە . ئەمجا ئافرەتەکە قسەکەی پێ بڕی و پێی ووت : بە پێچەوانەوە هەست دەکەم وەزۆرێك لەکچانی تریش ئەوەی کە بەدوایدا دەگەڕێن لەلای پیاو چاکانی وەك تۆ دەست کەوێت . ئێمە بەدوای بەخشین و وەفاداریدا دەگەڕێین. بەدوای ئەوانەدا

ویلّین و داوای سۆزو میهرەبانی دەکەین وە بەدوای ووشە ڕاستەکاندا دەگەڕێین کە لەناخی دلەوە دەردەچێت . بۆقولایی دلمان دەڕوات . بەدوای ئەوانەدا دەگەڕێن کەوا خەمی ئێمەیانەو ڕەچاوی شعورمان دەکەن . بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێکی شەهوانی پیسیان هەبێت .... بەدوای ئەوەدا دەگەڕێین کەوا ببێت بەبرایەکی بەسۆز و باوکێکی میهرەبان و پیاوێکی چاك.بەکورتی ئێمە بەدوای بەختەوەریەکی ڕاستەقینەدا دەگەڕێین لەم دونیایەدا . بەدوای ئارامی دەروونیدا دەگەڕێین بەدوای پاکێتیدا دەگەڕێین ، بەدوای وەفاداریدا دەگەڕێین بەدوای بەخشندەیدا . محمد پێی ووت لەو کاتەدا چاوەکانی فرمێسکی تیدا قەتیس ببوون لە دلّ تەنگیدا بۆ ئەم ئافرەتە سەرگەردانە .وا دەردەکەوێت کە تۆ بەدەس قەیرانی دەروونی و فەراغی ڕوحییەوە گیرت خواردووە ، سکالای قەیرانێکی دەروونی دەکەیت و خەم و دلّ تەنگی و سەرسامی وسەرلێشێواوی هەراسانی کردویت تۆ تێشوی خەم و خەفەتێکی خێزانی و هەلوەشاندنەوەیەکی خانەوادەیی هاتویت . ئافرەتەکە پێی ووت تۆ یەکەم کەسی کەوا ناخی منت خوێندەوەو هەستت کرد بەو ئازارە ناوەکیانەی من شێخ ووتی کەواتە کەمێك باسی خۆت و خێزانەکەتم بۆ بکە بۆ ئەوەی زیاتر بۆم ڕوون بێتەوە . ئافرەتەکە ووتی : من تەمەنم گەیشتووتە بیست سالّ . لەگەلّ مالەوەماندا دەژیم کە پێك هاتووە لەدایکم و باوکم و سێ خوشك و سێ برا . براو خوشکەکانم هەموو یان ژنیان هێناوەو شویان کردووە تەنها من و برایەکم نەبێت کە دووسالّ لەخۆم گەورەترە ، من لەزانکۆ دەخوێنم . شێخ پێی ووت : ئەی دەربارەی دایك و باوکت چی هەیە؟ ووتی باوکم کەسێکی دەولەمەندو بەئیمکانیەتە زۆربەی کاتەکانی سەرقالە بەئیش و کاری بازرگانیەوە ، لەبەیانیەوە دەردەچێ لەمالّ نایبینمەوە تەنها هەندێ شەوان نەبێت زۆر بەکەمی لەگەلماندا دادەنیشێت ، مالّ لەلای ئەو تەنها بۆ خواردن و خواردنەوەو نووستنە . لەوکاتەوە کە پێگەیشتووم بیرم نایە لەگەلّ باوکم دانیشتبێتم بەتەنیا . یان هاتبێت بۆژوورەکەم . لەکاتێکدا من لەم تەمەنە ترسناکەدا زۆر پێویستم بەسۆزی ئەو هەبوو . ئای چەندە ئاوەتە خوازم لەباوەشیدا دانیشم و سەر بنێم بەسنگ یەوە و تێر تێر بگریم تا دەرونم ئاسودە دەبێت و کولّی دلّم بحەوێتەوە . لەوێدا ئافرەتەکە دای لەپرمەی گریان ، وە محمد یش خۆی پێ نەگیراو فرمێسکی خەفەتی لەگەلّدا ڕشت ، دوای ئەوەی ئافرەتەکە هەندێك هێور بۆیەوە بۆ ئەوەی قسەکانی تەواو بکات ووتی زۆر جار هەولم دەدا کە لێی نزیك کەومەوە بەلام ئەو خۆی دوور دەگرت لەمن بەلکو جارێکیان لەتەنیشتیەوە دانیشتم و لێی نزیك کەوتمەوە بۆ ئەوەی لە ئامێزم بگرێت ووتم : باوکە پێویستم بەهاوکاری تۆیە ئەی بابە ، مەهێلە بزربم . لۆمەی کردم ووتی هەموو خزمەتێکم بۆت دابین کردووە، ئەوەی کە هەموو ئافرەتان لەدونیادا ئاواتەخوازی هەن .تۆ جوانترین و باشترین خواردن و خواردنەوەو پۆشاکت

هەیە . وە گرانترین هۆکاری خۆشگوزەرانی تازەت هەیە ، لەچیت کەمە ؟! ماوەیەك بێدەنگ بووە ، لەوکاتەدا وام بەخەیاڵدا هات کە هاوار بکەم و بڵێم : باوکە مـن خواردن و خواردنـەوەو پۆشاکە لەتۆناوێت ، وەنە هۆکارەکانی یاری و گاڵتەوگەپ و خۆشگوزەرانی ، مـن سۆزم لـەتۆ دەوێـت مـن ئارامیم لێت دەوێت و سنگێك و دڵێکی بەبەزەیی ، بزرم مەکە ئەی بابە. کاتێك بـەئاگا هاتمـەوە لەئەندێشە وخەیالاتەکانم سەیردەکەم باوکم لای من ڕۆیشتووە بۆ خواردنی نـانی بـەیانی . نەلـەو کاتەدا محمد پێی ووت هێور ببەوە پێ دەچێت باوکت هـەر لەمنداڵیـەوە بێ بـەش بێـت لەسـۆزو میهرەبانی وە تۆش دەزانیت کەسێك شتێکی نەبێت ناتوانێت بیبەخشێت ، بەلام ئەی دایکت چۆنە ؟ بێگومـانم ئـەو بەسـۆزو بەبەزەییـە لەبـەر ئـەوەی ئـافرەت بەسروشـتی خۆیـان هەسـت ناسـك و نـەرمن . ئافرەتەکـە ووتـی : دایکـم هـەندێ لـەباوکم باشـترە. بـەلام بەداخـەوە ئـەویش ژیـان هەربـەوەدەزانێت کە خـواردن وخواردنـەوەو جل پۆشـین و سـەردانی کـردن بێـت و بـەس . هیـچ مامەڵەیەکی منی بەلاوە پەسەند نیە ، وەهیچ نازانێت تەنها نەوندە نەبێت فەرمان بکات بـەردقی و هاوارم لەدەست بکا ئەگەر سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکەم . فەرهەنگی جنێوەکانی ئەوم لەبەرە ، مـن لـەماڵدا وازم لەهـەموو شـت هێنـاوەو فرمانـەکانی ئـەمم لەسـەر شـانی خـۆم و خزمەتگوزارەکەمان دادەنا، خوا نەکا کارێك بوەستێت ئـەو بـەهیچ ڕازی نـابێت ، وە گوێ بـەهیچ نـادات تەنـها گـەڕان بـەدوای کـەم و کورتـی و هەڵەکاندا ، وەبـەردەوام دەم شـکێنێتەوە بەبـەراورد لەگەڵ کچانی دراوسێکانماندا، ئەوانەی کەلە دراسەکەیاندا سەرکەوتوون و زیرەکن ولەئیشو کاری چێشتخانەداگورج و گۆڵن ، وەزۆربەی کارەکانی لەخـەوتندا بەسـەردەبات یـان سـەردانی دراوسێ و هەندێ لەخزمان یان سەیرکردنی تەلەفزیۆن ، بیرم نایات بـۆ چـەند سـاڵێکیش جارێك لـەنامێزی گرتبێتم یان دڵی خۆی بۆم کردبێتەوە، محمد پێی ووت : پەیوەندی نێوان دایـك و بـاوکت چۆنـە؟ ئافرەتەکە ووتـی : وا هەسـت دەکـەم کـەوا کەسـیان گوێ بـە ئـەوی تریـان نـادەن وە هەریەکـەیان لـەژیانێکی جیـاواز لـەویتر دەژیـن ، وەك ئـەوەی کـەوا ماڵەکـەمان وەك نوتێلێـك وابێـت تەنـها بـۆ خواردن و خواردنەوە تێدا کۆدەبینەوە . محمد هەوڵی دا کەوا بیانوو بۆ دایکی بهێنێتـەوە ووتـی : هەر چۆنێك بێت ئەوە دایکتەو تۆی بەخێو کردووە ، نەوە ئـەچێ ئـەویش گرفتـی هـەبێت لەگـەڵ باوکتدا و ئەمەش کاریگەری هەبێت لەسەر مامەڵەکردنی لەگەڵ تۆدا ، تۆش عوزری ئەو قبوڵ بکە ، بـەلام ئایـا تـۆ هـەوڵت داوە کـەوا گرێـی دڵـی خۆتـی بـۆ بکەیتـەوە . بێگومـان ئـەویش وەك تـۆ لەقەیرانی دەرونیدایە، ئافرەتەکە بەسەر سوڕمانەوە ووتی : من دڵی خۆمی بۆبکەمەوە؟! ئایا ئەو دڵی خۆی بۆمن کردوەتەوە ئەو دایکە نەك من ؟! بەداخەوە نەو بەو مامەڵە خراپانەی کە دەیکات دیوارێك دروست بووە لەنێوانماندا کەوا ناتوانم بیبڕم . محمد پێی ووت: بۆچی چاوەڕێ دەکەیت

یەکی لەدراوسیکانماندا هاتە قسە ، منیش بەجیم هیلا و گەرامەوە بۆ هۆدەکەی خۆم وە لەناخەوە فرمیسکی خوینینم دەرشت بەرلەوەی ئەسرین بریژم .
پاشان ئافرەتەکە زۆر گریا . محمد ویستی قسەکە بگۆریت و پرسیاری لیکرد : ئایا رۆلی براو خوشکەکانی ترت چۆنن ؟ ئافرەتەکە ووتی : رۆلیکی خراپیان هەیە ، براو خوشکەکانم خاوەن خیزانن و هەریەکەیان سەرقالە بەخۆیەوە ، وە ئەگەر باسی دل تەنگی خۆمیان بۆبکەم هەر پیم دەلین لەچیت کەمە سوپاسی خودا بکە لەو ژیانە خۆشەی کە تییدایت . بەلام ئەو برایەم کەوا ژنی نەهیناوە ئەویش وەك من ویلە و زۆربەی کاتەکانی لەدەرەوەی مال بەسەر دەبات لەگەل هاوری خراپ و شەلاتیەکاندا بەدەبەنگی لەبازارو شۆستەکاندا دەروات . شیخ محمد وویستی شتیك لە ناوەخنی ئەو ئافرەتە بخاتە روو بۆیەلیی پرسی ، هەرکەسیك شتیك داوا بکات ، بەدوایدا دەگەریت بۆئەوەی بەدەستی بهینیت ، مادام تۆش بەدوای خۆش گوزەرانی و ئاسایشدا دەگەریی بۆ ئەوەی برسیتی دەرونیت پربکەیتەوە ، ئایا تۆ بەدوای بەختەوەریدا گەراویت . ئافرەتەکە ووتی بەدوای بەختەوەریدا گەرام لەهەمووشتیکدا بەلام نەم دۆزیەوە من جوانترین پۆشاك و گرانترین پۆشاکم لەبەر دەکرد، لەدەولمەندترین پۆشاکە جیهانیەکان وام دەزانی بەختەوەری ئەوەیە کەوا خەلك ئامازە بۆ پۆشاکەکانم بکات ، یان خەلك پیما هەلبدات ، یان بەسەر سورمانەوە سەیرم بکەن ، بەلام هەرزوو راستیم بۆ دەرکەوت کەوا بەختەوەریەکی خەیالی و وە همیە ، بەردەوام نابیت چەند کاتژمیریك نەبیت یان لەوەش کەمتر ، وە ئەو پۆشاکە گران بەهایانە کەوام دەزانی بەختەوەری دەبەخشیت وەك هەموو پۆشاکە کۆنەکانمی لیدەهات ، وەخەم و خەفەتی دەروونی دیسانەوە دەگەرایەوە ، هەست بەتەنهایی و بۆ شاییی دەکەم ،کەوا زۆریان بۆ هیناوم ، ئەگەر سەدان هاوری و دۆستیشم لەدەور بوایە . دوایی وام زانی بەختەوەری لە گەشت و گوزاردایە وە رۆیشتن لەولاتیکەوە بۆ ولاتیکی تر ،لەکەناریکی دەریایەکەوە بۆ کەناری دەریایەکی تر، لەئوتیلیکەوە بۆ ئوتیلیکی تر، ئەمجا من گەشتم دەکرد لەگەل باوك و دایکم دا بۆ ئەوەی کەوا بەدونیادا بگەریین لە پشوەکاندا ، بەلام پاش گەرانەوەم دلم تەنگ تر دەبوو ، وە ئەودیوە زمەیەی هەستم پی دەکرد دیسانەوە زال دەبوو بەسەرما وە دوایی وام دەزانی کەوا بەختەوەری لەگۆرانی ومۆسیقادایە ، زۆربەی ئەو کاسیتە گۆرانیانەی کە دەکەوتە بازارەوە دەیانم کری لەگەل بلاوبوونەوەیاندا . وەچەند سەعاتیك لە ژوورەکەی خۆمدا گویم بۆ دەگرت و سەمام دەکرد تاوەکو تامی بەختەوەری راستەقینەبکەم ، وەبۆ ئەوەی ئەو کەلینە دەروونیەم پر بیتەوە کە هەستی پیدەکەم ، چونکە وام دەزانی بەختەوەری لەسەماو خۆ بادانە لەگەل ئاوەزەکاندا . وە هەر دوای تەواو بوونم خەفەتەکانم زیادیان دەکرد ،ئاگریکی سەیر لەناخمدا دادەگیرساو وردە وردە

ڕۆیشتن لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر ،لەکەنارێکی دەریایەکەوە بۆ کەناری دەریایەکی تر. لەئوتێلێکەوە بۆ ئوتێلێکی تر، ئەمجا من گەشتم دەکرد لەگەڵ باوك و دایکم دا بۆ ئەوەی کەوا بەدونیادا بگەڕێین لە پشوەکاندا ، بەلاّم پاش گەڕانەوەم دڵم تەنگ تر دەبوو ، وە ئەودێوە زمەیەی هەستم پێ دەکرد دیسانەوە زاڵ دەبوو بەسەرما وە دوایی وام دەزانی کەوا بەختەوەری لەگۆرانی ومۆسیقادایە ، زۆربەی ئەو کاسێتە گۆرانیانەی کە دەکەوتە بازاڕەوە دەیانم کڕی لەگەڵ بلاّوبوونەوەیاندا ، وەچەند سەعاتێك لە ژوورەکەی خۆمدا گوێم بۆ دەگرت و سەمام دەکرد تاوەکو تامی بەختەوەری ڕاستەقینەبکەم ، وەبۆ ئەوەی ئەو کەلێنە دەروونیەم پڕ بێتەوە کە هەستی پێدەکەم ، چونکە وام دەزانی بەختەوەری لەسەماو خۆ بادانە لەگەڵ ئاوەزەکاندا ، وە هەر دوای تەواو بوونم خەفەتەکانم زیادیان دەکرد ،ئاگرێکی سەیر لەناخمدا دادەگیرساو وردە وردە دڵتەنگیەکەم زیادی دەکرد وەهەستام هەرچی کاسێت هەیە سوتاندم بۆ ئەوەی ئاگری دەرونم بکوژێتەوە ، پاشان وام زانی کەوا بەختەوەری لەسەیرکردنی فیلم و کەناڵ گۆڕیندایە لەنێوان کەناڵە ئاسمانیەکاندا، زیاتر لەسێ سەد کەناڵم دەگۆڕی بەدرێژایی ڕۆژ وە زیاتر سەیری زنجیرەی فیلمە کۆمیدیەکانم دەکرد وام دەزانی بەختەوەری لەپێکەنین و گاڵتەو گەپ دایە . بەڕاستی زۆر پێدەکەنیم کاتێك سەیری کەناڵەکانم دەکرد و دەیانم گۆڕی ، بەلاّم لە ڕاستید بەدەم پێدەکەنیم بەلاّم لەناخەوە بریندارم بووم ، هەرچەندە زیاتر پێ بکەنم ئەوەندە برینی ڕوحیم قوڵتر دەبێتەوە ، وە خەم و خەفەتە دەروونیەکان چوار دەوریان گرتووم، دەم بیست لەهەندێ لەبرادەرەکانمەوە کەوا بەختەوەری لەوەدایە کەمن پەیوەندی بگرم لەگەڵ کوڕێکی جواندا، ووشەی دڵداریانەم لەگەڵدا بگۆڕێتەوە وە قسەی عاشقانەم بۆ بکات وە بەجوانیەکەمدا هەڵبدات هەمووشەوێك لەڕێی تەلەفۆنەوە ،هەر بۆیە ئەم ڕێگایەم گرتەبەر. لەم گەنجەوە دەم گۆڕی بۆ ئەو گەنج بۆ دۆزینەوەی بەختەوەری و ئارامی دەروونی ، لەگەڵ ئەمانەشدا هەستم نەکرد بەتامی بەختەوەری ڕاستەقینە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەگەڵ کۆتایی هاتنی هەموو قسەکردنێکی تەلەفۆنیدا ، هەستم دەکرد کەوا دڵە ڕاوکێ و دوودڵی باڵی بەسەر ڕووحمدا دەکێشا ، هەستم بەئاگری تاوان دەکرد کە لەناخمدا دادەگیرسا ، وە دەچوومە بیرکردنەوەیەکی گومانــاوی بەردەوامەوە ودەربەدەریەکی هەتاهەتایی ، هەستم بە ترس دەکرد لەوچارەنووسە نادیارەی کەوا قەوارەمی پڕکردبوو، وە هەستم دەکرد کەوامن لەدۆزەخێکەوە ڕادەکەم بۆ دۆزەخێکی لەوە سەخت تر. ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو دوایی قسەکانی تەواو کردلەبەرئەوە پێویستە تێبگەن و بزانن نەفسیەت و پاڵ پێوەنەری ئەو ئافرەتانەی کەوا دەبینرێن لەبازاڕەکاندا، خۆیان پیشان دەدەن بەجلی سەرنج ڕاکێشەروو وروژێنەرەوە گاڵتەوگەپ دەکەن وەبەدەنگی بەرز پێدەکەنن و

جوانی و ناسکی گۆشتی خۆیان پیشانی ئەو گەنجە سەرلێشێواوانە دەدەن کەوەکو گورگی برسی وان ، ئەوئافرەتانە لەڕاستدا قوربانین نەك تاوان بار وە ئەم ئافرەتانە لەڕاستید چەواشەبوونە نەك چەواشەکار ئەوانە لەڕاستیدا بوونە بەقووربانی ستەمی خێزانی . ئەوانە بەرئەنجامی دلڕەقی و پشت گوێ خستنی لایەنی سۆزدارین لەلایەن دایك و باوکەوە ، ئەوانە ئەنجامی لێك هەڵوەشاندنەوەی خێزان و لاوازی ئیمانن ، بەڕاستی هەریەك لەوانە لەناخیاندا تەنگ و چەڵەمەو ئازارێکی بەردەوامیان هەلگرتووە کەوا پاڵیان پێوە دەنا بۆ ئەوەی ئەم شێوازە مامەڵەیەبکەن ، ئەمە دەستی گرتوونتا تا وەکو خۆیان پیشانی گورگە دڕندەکان بدەن کەوا بازاڕو جادەکانیان پڕکردووە ، بەڕاستی غەریزەی سێکسی بەتەنها ناتوانێ ببێتە هۆکارێك بۆ ئافرەتە موسڵمانەکان کەوا لاشەی خۆیان پیشان بدەن لەبازەڕەکانداو . خۆیان سووك بکەن بەوەرگرتنی ژمارەی فلانە کەس و وە شەرەفی خۆی بفرۆشێت بەسەرکەوتنی لەگەڵ سەیارەی فلانە کەسدا وە ناموسی خۆی بەفیرۆبدات بەمانەوە لەگەڵ فلانەدا.

محمد ووتی لێرەدا پرسیارێکی گرنگ سەرهەڵدەدات ، ئەویش ئەودیە ئایا تێپەڕینی ئافرەتان بەقەیرانێکی دەروونی تاڵی خێزانیدا پاکانەی بۆ دەکات کەلەخودای باڵادەستی خۆی یاخی ببێت . وەپاکێتی خۆی بفرۆشێت و دەست بەرداری شەرەف و ناموسی بێت وە خۆی بخاتە ژێر دەستی مرۆڤەشەیتانەکان؟ ئایا ئەمە چارەسەرێکی گونجاوە بۆ ئەو کێشەو گرفتەی؟ ئایا ئەمە هیچ لە زەمینە بینینی تاڵ و بەئازاری دەگۆڕێت ؟ ئافرەتەکە وەلامی دایەوە من دان بەوەدادەنێم کەوا هیچ لەو زەمینە تاڵ و بەئازارە ناگۆڕێت ، بەلکو کارەکە خراپترو تاڵتر دەکات . مەبەستی من بەرگری کردن نەبوو لەو ئافرەتانە بەلکو مەبەستی من ئەوەبوو ئەگەر ئێوە بینیانتان بەڕەحم و سۆزو بەزەیی ببن لەگەڵیاندا وە داوای هیدایەتیان بۆ بکەن و ئاراستەیان بکەن چونکە بەڕاستی ئەوان سەرگەردان و سەرلێشێواون وە دەزانن کە ئەم ڕێگەیە دەیان گەیەنێتە ئەو بەختەوەرییەی بەدوایدا دەگەڕێن . ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو دووایی ووتی : وام لێهات بەگومان بووم کەوا بەختەوەریەکی ڕاستەقینە لەم دونیایەدا هەیە . وەئەگەر بەڕاستی هەیە لەکوێیە ؟ وە کام ڕێگا دەچێ بۆی ؟ بەڕاستی بێزار بووم لەم ژیانە تاریکە... شێخ محمد پێی ووت: خوشکەکەم ڕێگەی بەختەوەریت بەهەڵە گرتووە، تۆ ڕێگەیەکی ترت گرتووە ، گوێم بۆ بگرە تابزانیت ڕێگەی بەختەوەری ڕاست کامەیە؟! بەختەوەری ڕاستەقینە ئەوەیە کەوا پەنا ببەی بۆ پەروەردگار وە لەبەردەمیدا مل کەچ بکەی و هەستی لەنیوەشەوەدا لێی بپاڕێیتەوە بۆ ئەوەی خەم و خەفەتت لێدووربخاتەوە ، و برینت تیمار بکات وەئارامی و دڵ کرانەوە برژێنێت بەسەر دڵدا . ئەی خوشکە! ئەگەر بەختەوەریت ویست ئەوە لەدەرگای ئاسمان بدە بەشەوو بەڕۆژ لەجیاتی لێدانی ژمارەی

حەیا لەو تاوان و کەم تەرخەمیانە ناهێڵێت ئەوە بکەم ، چۆن پەناببەم بۆ خـوا و داوای یەرمـەتی و ئاسانکاری لێبکەم کەمن کەم تەرخەم بوومە لەگوێ ڕایەڵیدا بەس تەنها تـاوان و سـەرپێچیم بـۆ لای بەرزکردوەتەوە .

)محمد) ووتی :( سبحان الله) ئەی خوشـکە : خـەڵکی ئەگـەر کەسێك توڕەیـان بکات وە لەفـەرمانی دەربچێت لێی توڕەدەبن و لێـی نـابوورن وە ڕەخنـەی لێ دەگـرن و بەرهەڵستی لێدەکەن لەگـەڵیدا نـابن لەناڕەحـەتی و نەهامەتیـەکاندا، بـەلاَم خـودا دەرگاکانی بـەڕووی هیـچ کـەس لەبـەندەکانیدا داناخـات ئەگـەر بێـت و لەگـەورەترین سـەرپێچی کـەروو خراپـەکارانیش بێـت ، بـەڵکو هـەرکاتێك مـرۆڤ بگەڕیتـەوە و پاشگەزبیتەوە خـودای گـەورە دەگاکـانی رەحمـەتی بـۆ دەکاتـەوە وە رووی رەحمەت و لیبوردەیی لیدەکات ، بەلکو ئەگەر پاشـگەزیش نەبیتـەوە ئـەوە خـوای گـەورە مۆلـەتی دەدات وسزاکەی بۆ پیش ناخات ، بەلکو بانگی دەکات وە هانی گەرانەوەو پاشگەزبوونەوەی دەدات ، ئایـا نـازانیت خـوای گـەورە لەفەرموودەیـەکی قودسـیدا دەفـەرمیت ( مـن و جنۆکـەو مـرۆڤ لەهەوالیکی گرنگ داین ، خۆشم ئەوین و نیعمەتی خۆم بەسەریاندا دەریـژم لـەکاتیکدا مـن لـەوان دەولەمەند ترم ، ئەوان تورەم دەکەن بەتاوانەکانیان لەکاتیکدا ئەوان فەقیرن و پیویستیان بەمنە ، هەرکەسیك لـەوان رووم تیبکات ئـەوا پیـی دەدەم لەدووریشـەوە بیـت ، وە هەرکەسـیکیان پشـتم تیبکەن ئـەوا مـن لەنزیکـەوە بانگیـان دەکـەم ، ئـەی خـەلکانی سـەرپیچی کـار لەرەحمـەتی خـۆم بیبەشـتان ناکـەم ، ئەگـەر پەشـیمان بنـەوەو بگەرینـەوە بـۆلام ئـەوا مـن خۆشەویسـتی ئـەوانم ، بەراستی من تۆبەکاران و پـاکژانم خـۆش دەویـت ، ئەگـەر لـەمن دووربـن مـن پزیشکیانم ، تاقیـان دەکەمەوە بە بەلاو نارەحەتی بۆ ئەوەی پاکیان بکەمەوە لەتاوان و کـەم و کورتـی ، رەحمـەتی مـن پیش توورەبوونم کەوتووە ، لیبوردەییم پیش تۆلە سەندنمە ، من بەرەحم ترم بـۆ بـەندەکانم لـە دایك بۆ مندالەکەی ) محمد خـەریك بـوو کۆتـایی بەفـەرمووده قودسیەکەبینی ئافرەتەکە نالـەی گریـانی لی بـەرزبوەوە ، هـەر ئـەی ووت خـودا چـەند بەبـەزەیی یـە لەگـەلمان ... خـودا چـەند بەبەزەییە لەگەلمان ! دوای ئەوەی ئافرەتەکە هیور بوویەوە شیخ محمـد دریـژەی بەقسەکانی دا و ووتی ئەی خوشکە منیش وەك تۆ بەدوای بەختەوەری راستەقینەدا دەگەرام لەم دونیایەدا ، بـەلام لـەم دواییـەدا دۆزیمـەوە ، دۆزیمـەوە لەگویرایـەلی خـودا دایـە ، لـەژیان لەگـەل خـودادا و لـەژیر سیبەری رەزامەندیدایە ، دۆزیمەوە لەگەرانەوەدایە ، دۆزیمەوە لە داوای لیخۆشبووندایە لـەتاوان ، دۆزیمـەوە لەفرمیسکی بەیانیاندایـە ، دۆزیمـەوە لەهاورییـەتی پیـاو چاکـاندا، دۆزیمـەوە لـەگریانی تۆبەکاراندا، دۆزیمەوە لـەگریان و نـوزەی داواکـاراندا . دۆزیمـەوە لـەداوای لیخۆشـبوونی سـەرپیچی

پێش تووڕەبوونم کەوتووە ، لێبوردەییم پێش تۆڵە سەندنمە ، من بەڕەحم ترم بۆ بەندەکانم لە دایك بۆ منداڵەکەی ) محمد خەریك بوو کۆتایی بەفەرمووده قودسیەکەبێنێ ئافرەتەکە ناڵەی گریانی لێ بەرزبوەوە ، هەر ئەی ووت خودا چەند بەبەزەیی یە لەگەڵمان ... خودا چەند بەبەزەییە لەگەڵمان ! دوای ئەوەی ئافرەتەکە هێور بوویەوە شێخ محمد درێژەی بەقسەکانی دا و ووتی ئەی خوشکە منیش وەك تۆ بەدوای بەختەوەری ڕاستەقینەدا دەگەڕام لەم دونیایەدا ، بەلاّم لەم دواییەدا دۆزیمەوە ، دۆزیمەوە لەگوێڕایەڵی خودا دایە ، لەژیان لەگەڵ خودادا و لەژێر سێبەری ڕەزامەندیدایە ، دۆزیمەوە لەگەڕانەوەدایە ، دۆزیمەوە لە داوای لێخۆشبووندایە لەتاوان ، دۆزیمەوە لەفرمێسکی بەیانیاندایە ، دۆزیمەوە لەهاوڕێیەتی پیاو چاکاندا، دۆزیمەوە لەگریانی تۆبەکاراندا، دۆزیمەوە لەگریان و نوزەی داواکاراندا ، دۆزیمەوە لەداوای لێخۆشبوونی سەرپێچی کاراندا، دۆزیمەوە لەتەسبیحاتدا ، دۆزیمەوە لەخشوع و کڕنۆش بردندا ، دۆزیمەوە لەخۆدانواندن و ملکەچ کردن بۆ خودادا ، دۆزیمەوە لەگریان و فرمێسکی ترس لەخوادا دایە، دۆزیمەوە لەشەو نوێژ و ڕۆژوودایە ، دۆزیمەوە لەگوێڕایەڵی پاشای پاشاکاندا، وە هەروەها لەخوێندنی قورئاندا ، لەوازهێنان لە زنجیرەو ئاوازەکاندا . ئەی خوشکە بەڕاستی بەدوای خۆشەویستی ڕاست و دروستدا گەڕام ، بینیم کەوا خەڵك ئەگەر خۆشەویستت وەردەگرێ ، وەئەگەر ببەخشێ داوا دەکات ، وەئەگەر بەهەندێ ببەخشێ لەهەندێکی تر دەگرێتەوە ، بەلاّم خودای بالاّ دەست ئەگەر بەندەی خۆی خۆش ویست ئەوا پێی دەبەخشێ بەبێ ژمارە ، وە ئەگەر گوێڕایەڵی ببێت ئەوا پاداشت وەردەگرێ . ئەی خوشکە گران بەهاکەم : خەڵکان ناتوانن ئەو ڕاستگۆیی و ئەمانەتەی بەدوایدا وێڵن پێمان ببەخشن ، پێمان ببەخشن ئەوەی بەدوایدا وێڵین لە ڕاستگۆیی و ئەمانەت ، وەلەسۆز و ناسکی و ئەوەی کە ئێمە تینوین بۆی لەئامێزی بگرین ، لەبەر ئەوەی هەموو یەکێك لەوانە سەرقاڵە بەخۆیەوە بایەخ تەنها بەخودی خۆی دەدات ، پاشان زۆربەیان بێ بەشن لەم هەستە بەرزو زۆر گەورەیە ، مانای نازانن چ جای تام کردنیان ، وە هەر کەس ئەمە حاڵی بێت ناتوانێت بەخەڵکی ببەخشێ ، لەبەرئەوەی وەك دەڵێن لەنەبوو نا بەخشرێ . ئەی خوشکە کەسێك نابینیتەوە ئەوەت پێ ببەخشێ کە بەدوایدا وێڵی ، تەنها پەروەردگارنەبێ هەرئەویش پشتیوانە بۆیان ، لەبەر ئەوە خەڵکی دەرگات لێ دەگرێ بەلاّم دەرگای پەروەردگار کراوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە داوا دەکەن ، چونکە خودای گەورە دەستی کردوەتەوە بەشەو و بەڕۆژ بانگی بەندەکانی دەکات وەرن بۆ لام ، گوێڕایەڵم بن پێداویستیەکانتان پڕدەکمەوە ، ئەمانەت و ئیسراحەت و

خۆشەویستیتان پێ دەبەخشم . وەك خوای گەورە دەفەرموویٚت (واذا سالك عيبادى عنى فانى قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان فليستجيبوا الى وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون)

ئەی خوشکە بەڕاستی بەختەوەری ڕاستەقینەنایەتەدی تەنها بەژیان لەگەڵ خودا ولەپەنابوونی ئەودا نەبێت دێتەدی .لەبەرئەوەی لەدەروونی مرۆڤدا بەگشتی . تینوێتی و برسێتیەکی ناوەکی هەیە . ئەسۆزی باوك ودایك پڕی دەکاتەوە.وەئەسۆزی براو کەسە نزیکەکانیش. خۆ شویستنی هاوسەرو سۆزە ناسکەکەی پڕناکاتەوە.خو شویستنی هاوەڵ ودۆستانیش .هەموو یەکێك لەمانە هەندێ تینوێتی دەشکێنێت .لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێك سەرقاڵە بەتینوێتی خۆیەوە .وە هەروەها ناتوانێت بەتەواوەتی تینوێتی جگە لەخۆی بشکێنێ . بەڵام ئاوەدانی تەواوەتی وتێرخواردن بەپەناگرتن بەخودا دێتەدی .وە بەژیان لەسایەی گوێڕایەڵی ئەودا .وە بەرۆشتن بەپێی ڕێنمایەکانی . ئەوکاتە هەست بە بەختەوەری تەواوەتی دەکەیت.وەچێژی خۆشەویستی ڕاستەقینە دەکەیت.وەهەست دەکەیت بە چێژی تەواوی نیعمەتەکان دوور لەخەڵت وخەوش.

ئایا بۆ تەنها جارێکیش ئەم ڕێگایەت تاقی کردۆتەوە. لەوکاتەدا هەست بەو جیاوازیە گەورە یە دەکەیت وەدەیبینێت ئەنجامەکەی بەدەستی خۆتە.

ئافرەتەکە گریانی پەشیمان بوونەوە لەچاوەکانی دەباریں هاتە وەڵام :بەڵێ... بەڕاستی ئەمەیە ڕێگاکە.ئەمە ئەوەیە کەمن بەدوایدا دەگەڕام .چەند ئاواتە خوازم کە ئەم قسانەم بەرلەسالانیکی پێش ئێستا ببیستایە بۆئەوەی بەئاگام بێنێتەوە لەوغەفلەتەو. دەستم بگرێ لەم تاریکی و وێڵیەدەرم بێنێ .وەڕێنمایم بکات بۆ ڕێگای ڕاست و دروست.

پاشان محمد دەستپێشخەری لێ کردوو پێی ووت:کەواتە لەم ساتە وەختەوە ڕێگاکە دەست پێ بکە .وا بەردبەیان دەرکەوت وەوا تاریکی و ڕۆشنی بەیان وورەوورە کەوتە نێو ئاسمان.وە ئەوە دەنگی بانگ خوێنەکان لەهەموو شوێنێکەوە بەرزدەبێتەوە.دەچیینن بەگوێی دڵ وئەنفسە براوەکاندا کە بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگاریان .وە ئەوەتا شنەی بای فێنکی ئاسکی بەردبەیان بانگت دەکات بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت بۆلای پشتیوانت .پەلە بکەو لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەرەوە لەتەمەن .با ئەم بەیانیە ببێتە ڕۆژی لەدایك بوونی تازەت .بۆ ئەوەی یەکەم کارکەدەیکەیت لە ژیانە نوێکەت دا دوورکات نوێژ بێت کەلەبەردەم پەروەردگارت دا دەوەستی .کەتیایاندا فرمێسکەکانت هەڵ برژە .هەناسە هەڵکێشە بۆ تاوان وسەرپێچیەکانی پێشووت.

وە داوام وایە کەوا دوای دوو هەفتەی تر تەلەفۆنم بۆ بکەیتەوە بۆ ئەوەی بزانین ئایە چێژی ڕاستەقینەی بەختەوەریت کردووە یان نا؟ پاشان محمد تەلەفۆنەکەی داخست وکۆتایی بەپەیوەندیەکە

هێنا . پاش دوو هەفتە وە لەکاتی دیاریکراودا ئافرەتەکە پەیوەندی کرد بە(محمد)ەوە، وەقسەکانی پڕبوون لەمژدە و دڵخۆشی وەپیتی ووشەکانی مژدەو خۆشی لێ دەچۆڕا ئەمجا ئافرەتەکە لەپێشدا ووتی لەکۆتاییدا تامی بەختەوەری ڕاستەقینەم دۆزیەوە .وەلەکۆتاییدا گەیشتم بەکەناری دەریای ئاسودەیی و ئارامی کە دەریام بۆ دەپشکنێ.و هەستم کرد بەمانای حەوانەوەی دەروونی .وە لەکۆتاییدا ئەناوی دڵ ئارامیم خواردەوە کەتینوی بووم .وە لەکۆتاییدا رۆحم بەئاوی شیرینی فرمێسکی ساخ شۆردو ئەفسم بەرزبوویەوە بۆ مەلە کوتی ئاسمانەکان .لەدواییدا دڵە ئەخۆشەکەم سارێژکرد بەفرمێسکی پەشیمانی ڕاستەقینە بەڕاستی شفایەکی کت وپڕبوو .بەڕاستی دڵنیابووم کەوا بەختەوەری ڕاستەقینەلەگوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودادایە.وەجگەلەمە سەرابێکی خەیاڵاوی و وەهمێکی خەوشدارەو زۆر بەخێرایی نامێنن و ڕاستیەکەی دەردەکەوێ ئەی شێخ من داوایەکی بچووکم لێت هەیە .ئەوەیش ئەوەیە کەئەم چیرۆکەی من بەتەواوی بلاوبکەیتەوە زۆرێك لەئافرەتان بزرن وەك من .بەڵکو خودای گەورە بەهۆیەوە ڕێنمونیان بکات بۆ ڕێگای هیدایەت. شێخ (محمد) پێی ووت هیوادارم بەم زووانە بەرچاوت بکەوێت.

# له ئا رایشتگاکاندا چی دەگوزەریٚ

## (چیرۆکی یەکە م)

یە کێك لە تۆبە کاران چیرۆکی تیاچوونی خۆی دە گێڕێتە وە کە خۆی ڕۆڵی پاڵە وانی تێدادە بینی وشایە تی لە سە رخودی خۆی داوووتی ٠٠

من لەگەڵ یە کێك لە ئارایشتگا بە ناوبانگە کاندابە لێننامە یە کم مۆرکردکە وا هە ستێت بە وێنە گرتنی شوێنی خۆگۆڕینی ئەوانەی دەهاتنەئارایشتگاکەی لە ڕێگەی چە ندکامێرایەکی شاراوە وە بەرامبە ربە برێك پارە ٠٠٠

ئەو ئافرەتەش کامێراکانی لەژووری بووکدادادەنا ٠کاتێك کەپۆشاکەکانیان لەبەردادەکەنن ٠وەخاوەنی ئارایشتگاکەدەیبردنە پێش کامێراکان بەبیانوی ئەوەی کەواڕوناك بێت و چاوی نابینێت٠٠وەئێمەئەم کاسێتانەمان لەدانیشتنەتایبەتەکانماندادەسەیردەکردوپاشان لەنێوان یەکتردادەمان گۆڕیەوەدوئاڵوگۆڕمان پێ دەکرد٠هەندێکمان هەندێ لەکچانەمان دەناسی و لەناویانداوکەسایەتی ئافرەتی ناسراو هەبوو..

من خۆم لەبەرزۆرخراپی ئەوەی کەدەمبینی خوشکوخێزانی خۆمم قەدەغەدەکردلەڕۆیشتنیان بۆهیچ ئارایشتگایەك لەبەرئەوەی‌من متمانەم نەبووبەوانەی کەبەڕێوەیان دەبردولەخورەوشتیانیش دڵنیا نەبووم٠

وەجارێك خاوەنی ئارایشتگاکەدواهەمین شریتی تۆمارکراوی بۆهێنام بەپێی پەیمانەکەمان کەلەنێوانماندابوو٠٠٠چەندیمەنێکی سەردتام لێ بینی٠٠٠لەبەرئەوەی من زۆرپەلەم بوو٠٠٠٠وەلەبەر ئەوەی کەزۆرپێی سەرسام بووم هەستام بەلێ گرتنەوەی بەپەلە٠٠٠

شم کردبەسەربرادەرەکانمداکەئەوانیش لێیان دەگرتەوەودابەشیاندەکرد٠

هەرلەوئێوارەیەداکۆبوینەوەودانیشتین بۆتەماشاکردنی ئەوکاسێتەکەبۆڕابواردن تەماشامان دەکرد٠دانیشتنەکەپڕ بوو لەتانەو تەشەر هەتادیمەنێکی سەرسام هات کاتێك کەئافرەتە کە هات وئامادەبوومن لەسەرەتادا دەم و چاویم نەناسیەوەبەڵام کاتێك کەدانیشت وخاوەنی ئارایشتگاکەئاراستەی کردبۆدانیشتن٠٠٠وەدوایی پێی ووت کەواپۆشاکەکانی وردەوردەکەم بکاتەوەبۆئەوەی بەردەستی ئەم نەگرێت ، ئەگەروانەکات ئەوەپۆشاکەکانی پیس دەبێت٠٠لێرەدابەپەشۆکاوی هەستام لەنێوفیك وفاکی برادەرەکانمداکەبەبەژن وباڵایانداهەڵدەدا٠ئەم٠ئافرەتەی کەوائەم بەژن وباڵاسەرنجراکێشەرەی هەبو وە هەمووانی سەرسام

کردبوو٠٠خێزانەکەی خۆم بوو٠٠بەڵێ خێزانەکەی خۆم٠٠٠هەر خۆم هەستام بەنیشاندانی لاشەی بۆزۆرێک لەگەنجان لەرێگەی ئەم کاسێتەنەفرەتیەوەوبەدەستی خۆم کەوتەدەستی زۆرێک لەپیاوان٠خودابۆخۆی دەزانێت ئێستاگەیشتۆتەکوێ؟

منیش هەستام بەدەرهێنانی کاسێتەکەلەڤیدیۆ کەو شکاندنی .وەشکاندنی هەموو ئەو کاسێتانەی کەلام بوون ئەو کاسێتانەی کە بەردەوام شانازیم پێوە دەکرد بەوەی من کاسێتی وخۆشترینی و شازترین کچە بەناونگەکانم لابوو ، زۆریان لەبنەرەتتدا پۆشتەن.

وەکاتێک بەم پاڵەوانەیان ووت و لیان پرسی ئەی تۆ نەت ووت کەوا من خێزان وماڵە وەم قەدەغەکردووە لەچوونیان بۆ هەر ئاریشتگایەک بێت ؟ووتی بەڵێ .بەڵام خێزانم بەبێ پرسی من رۆیشتووە لەگەڵ یەکێک لەخوشکەکانیدا بەلاّم دواتر زانیم.

ئەی چیت لەو کاسێتانە کرد کەوا بلاّوت کردونەتەوە ئایە کۆیانت کردووەتەوە ؟ووتی :بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆرتریان لێ دابەش دەکرد دوای ئەوەی کەزانیان ئەوەی لەناوکاسێتەکەدایە خێزانمە،کام هاورێیەیان کەزۆر نزیک بوو لێمەوە زۆر ترین کاسێتی دابەش کردووە.

لەکۆتاییدا تێ گەیشتم کەوا ئەمە سزایەکە لەلایەن خودای بالاّدەستەوە بەهۆی ئەوەوەیە کەوا من ناموسی خەڵکیم نیشانی خەڵك ئەدا من زۆر سوودم وەرگرتوو تەمێبوو لەم هەڵەیە،دوای ئەوەی کەزانیم پەروەردگار حەق وراستە هاتمەوە هۆشی خۆم .چاك وخراپم ناسی لەهاوەلاّکانم مەوە وەبۆم دەرکەوت کەهاوەڵی خراپ لەخراپە زیاتری لێ ناوەشێتەوە .وەبەراستی ئەم ژیانە وەفاداری و قەرزە ..هەرکەسێ سنگ بخوات سنگ دەکوتێت (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) راستی فەرموودەکە دەڵێت: ﴿ئەی ئەو کەسانەی کەبەزمان موسڵمانن و،هێشتا ئیمان نەچۆتە دڵیانەوە ئازاری موسڵمانان مەدەن وناتەواویان تێدا دروست مەکەن وەشیوێنی عەوردتیان مەکەون لەبەر ئەوەی هەرکەسێ بەدوای کەم وکورتی ناموسی خەڵکی بکەوێت خودای گەورە ئابرۆی دەبات .وەهەرکەس خودا ئابرووی بەرێ ئەوە لەناو خەڵکدا ئابرووی دەبات ئەگەر لەناو سکی ووشترەکەیشیدا بێت﴾

## (چیرۆکی دووەم)

گەنجێك بۆی گێرامەوە ئەو رووداوەی کە لەئارایشتگاکاندا روودەدات ، ووتی : جارێکیان بۆ نەیەکی هاوسەر گیریمان هەبوو خێزانەکەمم برد بۆ یەکێك لە ئارایشتگاکان وە لەبەر دەم ئارایشتگاکەدا دام بەزاند لەگەڵ کچە بچوکەکەمدا بۆ ئەوەی سەعاتێکی تر بێمەوە بەشوێنیاندا و بیان بەمەوە . بەڵێ ... دوای هەمان کات گەرامەوە بۆ ئەوەی بیان بەمەوە بینیم لەشوێنێکی دوور لەئاریشتگاکەوە وەستاوە منیش خستیانمە سەیارەکەوە و بەسەر سورمانەوە پێم ووت : ئەوە چیتە

بۆ وا لەو شوێنەدا وەستا بوویت ؟! ووتی : کاتێك چوومە ناو ئارێشتگاکەوە ، خاوەنەکەی پەرداخێك شەربەتی بۆ هێنام هەستم کرد بەوەی کەوا سەرم سوڕ دەخوات خەریك بوو لە هۆشی خۆم بچم ، هەستم بەترس کرد، بەتایبەتی کە بینیم لەگەڵ پیاوێك قسە دەکات بە تەلەفۆن وە پێی دەڵێت ( نایەیت کچەکەت بەریتەوە) زیاتر ترسم لێنیشت واهەستم کرد کەوا ئەم کارە پیلانێکی لەژێرسەردایە ، هەر ئەوەندەم پێکرا کە ڕام کرد لە ئارایشتگاکە و کچەکەم بەڕاکردن بەدوای خۆمدا هێنا . وە وابزانم ئەوانیش ترسان کەوا کچەکەم بەدوامدا ڕای دەکرد ! ئەو گەنجەی چیرۆکەکەی بۆ گێرامەوە ووتی : دوای ماوەیەك پرسیاری ئارایشتگاکەم کرد ، کاتێك کە داخرابوو پێ یان ووتم : داخراوە لەبەر ئەوەی دەرکەوتووە ئەم ئارایشتگایە سەرچاوەیەکە بۆ داوێن پیسی . خواپەنامان بدات.

## (چیرۆکی سێیەم)

یەکێك لەو ئافرەتانەی کەوا ڕاهاتبوو زۆر دەچوو بۆ ئارایشتگاکان زۆر زۆر وە گەیشتە ئەو بڕوایە ی کەوا بەڕاستی ئەم ئارایشتگایانە حەشارگەیەك زیاتر هیچی تر نین ، لەپشتی ئەمانەوە چەندها کردەوەی گوماناوی زۆر هەیە ، ئەم ئافرەتە دەیگێڕێتەوە :

من وەکو هەموو ئافرەتێکی تر کەوا دەچن بۆ ئارایشتگاکان بۆ مەبەستی خۆ جوان کردنی تایبەت بە ئافرەتان ، منیش بەردەوام دەچووم بۆ یەك ئارایشتگا کەوا ناوبانگ و شوهرەتی هەبوو هەتا وەکو ببووم بە مەعمیلێکی بەردەوامی ئەوان ، ئەم حاڵەتە درێژەی کێشا تا وەکو جارێك لەجاران گەنجێکم بینی چووە ئارێشتگاکەوە . یەکەم جار وام زانی کەوا هاتووە خێزانی یان خوشکێکی بەرێتەوە . وە دوای ماوەیەکی زۆر گەنجەکە لەژووردوە هاتە دەرەوە و ڕۆیشت ! لەسەرەتاوە زۆر ئیشەکەم بەگرنگ نەگرت وە هیچ گومانێکم بۆ دروست نەبو کەوا ئەوەی لەژوورەکەدایە جێی گومانە لەبەر ئەوەی ئارایشتگاکە ناوبانگێکی زۆر باشی هەبوو ! لەو کاتەدا هیچ بەدڵمدا نەهات کەوا ئەم ئارایشتگایە بۆ جگە لەئیشەکەی خۆی بەکاردەهێنرێت ، بەڵام لەجاری دووەمدا هەمان هەڵوێست دووبارە بویەوە گەنجێکی ترهات وە بەرپرسی ئارێشتگاکە پێشوازی لێکرد و خستیە هەمان ژووردوە ، دوای ماوەیەك دەرچوو بەڵام لەم جاردیاندا دوای هاتنە دەرەوەی گەنجەکە بەچەند خولەکێك یەکێك لەئافرەتەکان لەهەمان ژوور هاتە دەردوە کەوا ئەویش ئیشی دەکرد لە ئارایشتگاکەدا ، ئەمە زۆر دوو دڵی و گومانی بۆ دروست کردم ، وە دوای تێپەڕبوونی کات بۆم دەرکەوت کەوا ئەم ئارێشتگایە سەرچاوەیەکە بۆ داوێن پیسی . خوا پەنامان بدات.

## (چیرۆکی چوارەم)

یەکێك لەپسپۆڕەکانی جوان کاری چیرۆکی خۆی دەگێڕێتەوە لە ئیشکردنیدا لە ناو ئارێشتگاکانداو دەڵێت :

کاتێك گەیشتمە وولاتەکەی خۆم بەدوای ئیشێکدا دەگەڕام کەوا گونجا و بێت لەگەڵ خۆم و پسپۆڕیەکەمدا ، جارێکیان چاوم کەوت بەبلاوکراوەیەك لەیەکێك لەرۆژنامەکاندا کەوا ئارایشتگایەك پێویستی بەکارمەند هەیە ، بەپەلە چووم بۆ ئەوەی داوا کاری پێشکەش بکەم بۆ ئەوەی ئەم هەلە بقۆزمەوە و ئیش بکەم لەوێ ، دوای ئەوەی خاوەنی ئارایشتگاکە چاوی پێم کەوت کت و پڕ ڕازی بوو بەوەی کەوا ئیش بکەم لەئارایشتگاکەیدا !!

ڕاهاتم لەگەڵ ئیشەکەدا، هەموو توانای خۆم خستە گەڕ لەئیشەکەدا ، من زۆر دڵخۆش بووم پێی ، بەلام دڵخۆشیەکەم زۆری نەخایەند ، وا هەستم کرد کەوا شت گەلێکی نائاسایی هەیە کە لەمنی دەشارنەوە، هەستم کرد کەوا کچەقوتابی دەرەوەی شار زۆرن لەکاتی ئیشکردنی ئەم ئارایشتگایە دا ، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا خاوەنی ئارایشتگاکە بەشێوەیەکی پڕ لەگومانەوە وەلامی دایەوە و قسەی دەکرد، ئینجا بانگی یەکێك لەکچەکانی کرد وە پێی ووت : تۆ داواکاریەکی دەرەکیت لەسەرە ئێستا دەبێ بچی.... پێکەنین بەرز بوەوە لێیان ، چوو بۆ شوێنی دیاری کراوی وە کیسەیەکیشی بەدەستەوە بوو – وا گومانم کرد کەوا کەرەسەی کارکردنی تێدا بێت وە شۆفێرێکی تایبەتیان هەبوو دەیانی گەیاند و دەیانی هێنایەوە دوای تەواو بوونی کچەکە لەبەشداری کردنی و دوای هاتنەوەی ئافرەتەکە لەداواکاریە دەرەکیەکەی خاوەنی ئارایشتگاکە پارەکەی لێ سەند ئەوەی کەبەدەستی هێنابوو وە بەشی خۆی پێ داو ئەوەکانی تری هەڵدەگرت....

وە ئەوەی کەوا منی دەخستە گومانەوە لە ئیشەکەی هەموویان، ئەوە بوو کەوا من هەرکات داوام لێ بکردنایە کە بچم لەگەڵیاندا پێ دەکەنین وە دەیان ووت پێم ، ئێستا نا ، بەم شێوەیە لەگوماندا مامەوە لێیان هەتا ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت بۆم دەرکەوت کەوا ئەم خوێندکارە ئافرەتانە ئەم ئیشەی ئەمان کەس ناتوانێت پێی هەڵبسێ تەنها ئەو کەسانە نەبێت کەوا ئامادەییان تێدایە دەست بەرداری شەرەف و پاکێتی خۆیان بن لە پێناوی هەندێك پارەی بێ نرخ و هیچ !!!!

# له قوربانیه‌كانی ئینته‌رنێت

كچێك چیرۆكێكی ناسۆراویی بۆ یه‌كێك له هاورێ كچه‌كانی ده‌گێڕێته‌وه .

هاوڕێی خۆشه‌ویست ........

پاش سلاْوو ڕێزم ...

هه‌رگیز باوه‌ڕناكه‌ی ئه‌وه‌ی كه به‌سه‌رمدا هاتووه‌و كردومه به‌ویستی خۆم .... تۆ ته‌نها كه‌سێكی لەم ژیانه‌دا سه‌رپشكی له‌وه‌ی ئه‌ی كه‌ی .. ئێستا من هه‌ست ناكه‌م كه من خۆم بم .. هه‌موو ئه‌وه‌ی كه ئه‌مه‌وێ ته‌نها لێخۆشبوونی خوای په‌روه‌ردگاره مه‌رگم پێ ببه‌خشێ پێش ئه‌وه‌ی خۆم خۆم بكوژم .. ئه‌م چیرۆكه‌كه یه‌ك ڕۆژ به‌سه‌رمدا تێنه‌په‌ڕیوه تیایدا نه‌گریابم و دواتریش بۆماوه‌یه‌ك توانای بینینم نه‌بووه .. هه‌ر ڕۆژێكم لێ ئه‌ڕوا ده‌یه‌ها جار بیرله‌وه ئه‌كه‌مه‌وه ئینتیحاركه‌م .. ئێستا ژیانم هیچ گرنگی له‌لام نیه .. هه‌موو سه‌عاتێك ته‌مه‌ننای مردن ئه‌كه‌م ، ئه‌م چیرۆكه ئه‌خه‌مه به‌رده‌ستت تاكو بلاْو بێته‌وه‌و ببێته فۆرم و نیشانه بۆ پاراستنی حیشمه‌تی هه‌ر كچێك كه ئینته‌رنێت به‌كارده‌هێنێت، هه‌روه‌ها ببێته په‌ندوناموژگاری بۆ كه‌سه وریاو زرینگه‌كان ... ئه‌مه‌ش چیرۆكه‌كه‌مه ٠

ڕۆژێك یه‌ك له كچه هاورێكانم بانگی كردمه‌وه بۆ ماڵی خۆیان ، یه‌كێك بوو له‌و كه‌سانه‌ی ئینته‌رنێتی زۆر به‌كارئه‌هێناو شاره‌زاییه‌كی باشیشی تیا هه‌بوو، ئاره‌زومی جولاْن به‌وه‌ی منیش حه‌زم به‌جیهانی ئینته‌رنێت بێت . له‌ماوه‌ی دوومانگدا فێری به‌كارهێنانی ئینته‌رنێتی كردم سه‌ره‌تا زوو زوو سه‌ردانم ئه‌كرد تاكوو هه‌موو شێوازه‌كانی فێركردم .. هه‌روه‌ها فێری لاپه‌ره به‌كارهێنان‌وگه‌ران به‌دوای مه‌وقیعه‌كان هه‌ر هه‌مووی له‌ماوه‌ی ئه‌م دوو مانگه‌دا بوو ، شه‌ڕی نێوان من‌و مێرده‌كه‌م ئه‌وكاته ده‌ستی پێكرد كه ئینته‌رنێت هاته ماڵمان .. سه‌ره‌تا ئه‌و زۆر دژی بوو به‌لاْم هه‌رچۆنێك بوو قه‌ناعه‌تم پێكرد ، پێم ووت هه‌ست به دڵه‌ڕاوكه ئه‌كه‌م‌و دوورم له كه‌س‌وكاروهاوڕێ ، به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌شم بۆ ئه‌هێنایه‌وه كه هه‌موو هاورێكانم ئینته‌رنێت به‌كاردێنن، له‌به‌ر چی من به‌كاری نه‌هێنم . ووتم له‌ڕێگای ئینته‌رنێته‌وه ده‌نگ وباسی هاوڕێكانم ئه‌زانم هه‌روه‌ها ئه‌وه‌شم پێ ووت كه ئه‌م كولفه‌ی تێچوونی له ته‌له‌فۆن كه‌متره .. هه‌رچۆنێ بوو مێرده‌كه‌م ڕازی بوو وه به‌زه‌یی پێمدا هاته‌وه .

هەروەکوو تێم گەیاند لەسەرەتاوە زۆر بەجدی قسەم لەگەڵ هاوڕێکانم ئەکرد ، لەمەو پاش ئیتر مێردەکەم هیچ گلەیی‌و گازندەی گوێ لێ نەئەبوو ...

هەستم ئەکرد ئەمزانی مێردەکەم زۆر مورتاح بوو بەوەی پرتەوبۆڵەی من نەمابوو هەرکاتێک مێردەکەم لە ماڵ دەرئەچوو هەروەکوو شێت پڕم ئەدایە ئینتەرنێتەکەو لەسەری ئیشم ئەکرد بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک.

لەماوەی چەند ڕۆژێکدا پەیوەندیم لەگەڵ کۆمەڵێک ناوی خوازراودا دروستکرد ، ئەم ئەزانی ئەوکەسانە پیاون یان ئافرەتن . هەر هەموویان لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە قسەم لەگەڵ ئەکردن ، تاکوو زانیم یەکێک لەوانەی قسەی لەگەڵ ئەکەم پیاوە !! داوای یارمەتیم لێکرد کە هەندێ زانیاریم دەربارەی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بداتێ .. زۆر شتی لێوەفێربووم .. یەکێک لەو کەسانەی بەشێوازێکی گشتی شارەزاییەکی باشی لە بواری ئینتەرنێتدا هەبوو ، بەردەوام قسەم لەگەڵی ئەکرد هەرشتێکم نەزانیبا لە زۆربەی شتەکان هانام بۆ ئەو ئەبرد تا وای لێهات ڕۆژانە پەیوەندیم پێوە ئەکرد .. وە زۆر حەزم لە نوکتەو قسەکانی بوو تەسەلای دڵم بوون ... بەدرێژایی ڕۆژگار پەیوەندیەکەمان بەهێزبوو .ئەم پەیوەندیە ڕۆژانەییەمان نزیکەی سێ مانگی خایاند .. زۆر شت لەبەینمان سەری هەڵدا بەقسە شیرنەکانی زۆر هەڵمی ئەنا .. لەوەیە قسەکانی بەو ئەندازەیە خۆش و جوان نەبوبێ بەڵام شەیتان ئاوها ئەیرازاندەوە .. ڕۆژێک داوای لێکردم پێکەوە قسە بکەین وە زۆریش سوربوو لەسەر داواکەی ترساندمی بەوەی زانیاریم دەربارەی ئینتەرنێت پێنەدا .. زۆرم هەوڵدا ڕێگربم لەبەردەم داواکەی ، بەڵام هەرچەندم کرد نەمتوانی .. لەبەر چی ؟؟ ئەم ئەزانی بۆ ؟!! .. هەتا ڕازی بووم بە هەندێ مەرج .. تەنها یەک جار قسە بکەین و هیچی تر .. ئەویش ڕازی بوو ... چووینە سەر بەرنامەی دەنگی و قسە بکەین .. ئەگەر چی ئەو بەرنامەیەم بەباشی نەدەزانی بەڵام دەنگی زۆر خۆش و قسەکانی زۆر سەرنج ڕاکێش بوون .. کاتێک گوێم لە دەنگی بوو تەزویەک بە گیانماهات داوای ژمارەی تەلەفۆنی لێکردم ژمارەکەی خۆشی پێدام .. بەو شتە زۆر دوودڵ بووم، نەمتوانی زیاتر قسەی لەگەڵ بکەم.. ئەم ئەزانی بۆچی شەیتان ئاوها ئەو شتانەم لەلاخۆشەویست ئەکات و لەهەمان کاتدا لە ناخەوە لە ململانێدا بووم لە نێوان نەفس و بەها و ئەخلاق و دیندا ... تاکو ڕۆژێک لە ڕێگای تەلەفۆنەوە قسەم لەگەڵ کرد .. ئەلێردەوە ژیانم بە لادان و ئینحیراف دەستی پێکرد ..دامالرام لە حیشمەت.. زۆر کەس هەوڵی ئەدا لێمان نزیک بێتەوە بەڵام وەیل بۆ ئەوکەسەی بیەوێ لێمان نزیک بێتەوە یان لەکەدارمان بکا .. ببوین بەیەک لاشەوڕوح .. لەرێگای تەلەفۆنەوە قسەمان ئەکردو ئینتەرنێتیشمان بەکار ئەهێنا .. بەڵام هەرگیز ئەمان ئەتوانی زۆر قسە بکەین ، هەرکەسێک ئەم ووشانەی من بخوێنێتەوە وانەزانێ مێردەکەم

حەقی پێنەداوم یان زۆر لەماڵەوە نەبووە بەڵام بە پێچەوانەوە .. ئیشی ئەکرد و زۆریش نەئەچووەلای هاورێکانی هەمووی لە پێناو مندا ... ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆی زۆر ئالودەی ئینتەرنێت ببوم ڕۆژانە (٨) بۆ (١٢) کاتژمێر خەریکی ئەبووم حەزم ناکرد مێردەکەم بگەڕێتەوە ماڵ .. پەیوەندیەکەمان زیاتر بەهێزبوو گەیشتە ئەو ڕادەیەی دوای ئەوەی قسەمان لەگەڵ یەك ئەکرد داوای ئەوەی لێکردم یەك ببینین، ئەگەر چی زۆر نارەحەتیش بوو لەهەمان کاتدا نەشم ئەتوانی وازی لێبێنم و پەیوەندیمان نەمێنێ .. بەڵام زۆرم سەرکۆنەکرد لەسەر داواکاریەکەی لە ناخیشەوە لەو زیاتر حەزم بە بینینی بوو .. زۆریش ئەترسام نەك لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بەڵکو لەترسی ئاشکرابوون و حەیاچوون کە خەڵك پێی بزانێ .. ڕۆژلەدوای ڕۆژ زیاتر جەختی لەسەر ئەوە ئەکردەوە کە یەکتر ببینین تەنها یەك بینین و هیچی تر .. ڕازی بووم بەمەرجێ ئەمە یەکەم جارودواجار بێت ، تەنها بم بینێ و هیچ قسەکردنی تیا نەبێ ، ئەشم زانی کە ئەو بڕوای نەئەکرد من ڕازی بم، چونکە ئەو هیوابڕاو ببوو لەوەی من ڕازیبم ..ئەو واخۆی پیشانی من ئەدا کە هەموو خۆشیەکم بۆ دەستەبەر بکات و ئەشترسا لەوەی نەبادا من تووشی بەڵایەك ببم ، ئەو وەکوو قەڵایەك من بپارێزێ، هیچ شتێکی وەهام شك نەئەبرد کە ڕازی نەبم ئەویش بە مەرجەکەی من ڕازی بوو ، سوێندی بۆ خواردم تەنها بینین و هیچی تر .. بەڵێ ! منیش ڕازی بووم .. مەوعیدمان لە یەکێك لەبازاڕە گەورەکان دانا ، کات و ساتیشمان دیاریکرد و شەیتانیش کەسی سێیەمان بوو .. کاتێك یەکمان بینی خۆزگەم ئەخواست کە قەت نەم بینیایە و نەم بینیایە .... بەڕاستی ڕووخسارێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی هەبوو لە باڵاشدا زۆر جوان بوو پێی سەرسام بووم بەڵێ !! زۆریش سەرسام بووم لە ماوەیەکی زۆر کورتدا کە لە خولەکێك تێناپەڕی .. بڕوام نەبوو ئەمە ئەو ڕوخسارەبێ کە من قسەی لەگەڵ ئەکەم لەهەمان کاتدا ئەویش پێوەی دیاربوو کە زۆر سەرسام ببوو بە جوانیەکەم وەکوو بڵێی شێتم بووبێ .. پێی ووتم لەمەولا ئەگەر تۆم لەدەس چێ خۆم ئەکوژم .. خۆزگە قەت نەتم بینیایە .. لەوکاتەدا خۆم زۆر جوان هاتەپێش چاوو وە سیفاتی ژنێتیم زۆر زیادیکرد گەلێ زیاتر لەپێش زەواج کردنم .

**خوشکەکانم** : ئەمە سەرەتای کۆتاییەکەیە ،خوشکەکانم ئەم کوڕە نەیئەزانی من زەواجم کردووە کە مێردو چەند مندالێکیشم هەبوو .. بەشێوازێکی گشتی دوای ئەم یەکتر بینینە قسەکردنمان تەواو گۆڕا .. زیاتر قسەکانمان ڕۆمانسی بوون ئەیزانی چۆن خاڵە لاوازەکانم بدۆزێتەوە وەکوو مێیینەیەك، لەمەشدا شەیتان زۆر یارمەتی ئەدرێ بوو، داوای لێکردمەوە کە بم بینێتەوە عوزرم بۆ ئەهێنایەوە جارجار ئەمدا بەگوێیا کە پەیوەندیت لەگەڵ ئەبچڕم .. بەڵام لە

ناخەوە لە خۆی زیاتر حەزم بە بینینی ئەکرد .. نەم ئەتوانی بڕەو بە یەکتربینین بدەم لەبەر بوونی پیاوەکەم لەو شارە .. بەینمان زیاتر کرایەوە پێم ووت کەمن زەواجم کردووە و چەند منالێکیشم هەیە ، ناتوانم بتبینم پەیوەندیەکەمان با تەنها لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە بێت .. بڕوای نەبوو کە من شووم کردبێ و منالیشم هەبێ، پێی ئەوتم تۆ وەکو فریشتە وای پێویستە بپارێزرێی ، وام لێهات مدمنی گوێ بیستی دەنگی بووم ، دالغەم ئەڕۆیشت، لە دلی خۆمدا دەم ووت ئەگەر من لە ئامێزی ئەودابم دەبێ حالم چۆنبێ !!؟؟ ڕقم لە مێردەکەم ئەبووەوە وام ئەبینی کە هیچ ڕۆلی نەبێ لە بەدەست هێنانی خۆشحالی خۆم و منالەکانم ... وام لێهاتبوو هەستم بە نارەحەتی ئەکرد ئەگەر بۆ ماوەی ڕۆژێك یان دووان نەمبینیایە لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە ، وە زۆر هەستم بە ئیرەیی ئەکرد ئەگەر قسەی لەگەلْ یەکێکی تر بکردبا .. ئەگەر ماوەیەك دیار نەبوایە ئالۆز ئەبووم .. خۆشم نەمئەزانی بۆ وا ئالودەی ببووم !!؟؟ تەنها ئەوە نەبێ حەزم ئەکرد زوو زوو بیبینم ، ئەویش دەرکی بەوەکردبوو بۆیە ئەیزانی چۆن ئیستغلالم بکا و بەردەوام داوای ئەکردو هەموو ڕۆژێك ئەیوت بابتبینم ... منیش هەر ئەمووت من زەواجم کردووە و مێردم هەیە .. ئەویش ئەیوت چۆن ئەبێ وانەکەین !؟ ئایا ئەبێ ئێمە هەروا لە نارەحەتیا بمێنینیەوە .. چۆن ئەبێ ئێمە هەریەکمان خۆش بوێ و نەتوانین لە یەك نزیك بینەوە ؟؟ وا پێویست ئەکا بەدوای چارەسەرێکا بگەڕێین .. ئەخوازێ لە سایەی یەکا بژین ، هەموو ڕێگەیەکی لێگرتم منیش جار لە دوای جار ڕەدم ئەکردەوە .. تاکوو ڕۆژێك داوای زەواجی لێکردم !! پێی ووتم با مێردەکەت تەلاقت داو من مارەت ئەکەم ، ووتی ئەگەر ڕازی نەبی یا ئەمرم یا شێت ئەبم یا مێردەکەت ئەکوژم !! لە ڕاستیا ترسێکی زۆرم لێهات .. زۆر سەرم سوڕما کاتێك داخوازی کردم یەك موچوڕکەیەك بە گیانما هات و لەرزێك دایگرتم هەر ئاگام لەخۆم نەمابوو .. واخۆم ئەبینیەوە کە من دیلی مێردەکەم بم هیچ خۆشەویستیەکم بۆلای نەمابوو .. زۆرم ڕق لێدەبووەوە حەزم نەئەکرد هەربیبینم ..خۆم و منالیشیم لەبیرکردبوو ..ڕقم لە زەواجەکەموژیانی خانەوادەکەم دەبوەوە وام ئەزانی من تەنها کەسێکم لەم ژیانەدا ئەزانم واتای خۆشەویستی چی یە .. ئەویش هەستی کردبوو کە زۆرم خۆش ئەوێ پێشنیاری ئەوەی کرد کە کێشەیەك لەگەلْ مێردەکەم دروست بکەم تاکوو تەلاقم دا .. پێشتر هیچ شتێکی وەهام بە دلدا نەهاتبوووەك ئەوەی ئەمە تاکە دەچەم بێت لەو قەیرانە وەهمیە، بەلێنی ئەوەی پێدام دوای ئەو زەواجم لەگەلْ بکات، هەروەها بەلێنی ئەوەشی پێدام لە داهاتودا ئەو ئەبێتە مایەی خۆشگوزەرانیم و بەدرێژایی تەمەن لەگەلم ئەمێنێتەوە .. ئەمە هەروا کارێکی ئاسان نیە ، بەلام فکرەیەکی لەجێ بوو سەرەتا دەستم کرد بەدروستکردنی کێشەوگرفت لەگەلْ مێردەکەم هەتاوەکو بێزاربێ وتەلاقم بدا ..

چەند هەفتەیەك ئاوها ماینەوە .. تاكوو وام لێهات بۆ دروستكردنی كێشە پێشەكی پیلانم بۆ ئەكێشا .. بەدرێژایی ئەو ماوەیە سوور بوو لەسەر دیتنم لەبەر ئەوەی ئەیزانی لەوەیە مێردەكەم هەروەها بەخێرایی تەلاقم نەدا . پاشان داوای لێكردم یەك ببینین و ئەگەر نا ؟؟ بێ سێوەوو ڕازی بووم وەكوو بڵێی شەیتانی لەعین لەجیێی من گفتوگۆ ئەكات وبر یار ئەدات .. داوام لێكرد ئەو ڕێكخەری فەرمانونیشوكارم بێ .. ڕۆژێك مێردەكەم ووتی ئەچم بۆ سەفەری نیشێ لەوەیە پێنج ڕۆژم پێ بچێ .. ووتم ئەمە كارێكی گونجاوە .. مێردەكەم داوای لێكردم بچمەوە ماڵی باوكم بۆ ئەوەی ئەفسیەن مورتاح بم‌و ئەو كێشە دروستكراوەم كەم بێتەوە .. ڕەدم ئەكردەوە و عوزرم بۆ هێنایەوە تا لە ماڵەوە مامەوە .. هەر چۆنێك بوو ڕێك كەوتین و بەناچاری چوو بۆ سەفەر .. هەر كە لە خەو هەڵئەسام ڕام ئەكردە سەر ئینتەرنێتە لەعینەكە كە شەوانیش ئەخەوتم دام ئەخست .. دوای چەند ڕۆژێك مەوعیدمان دانا ڕازی بووم بە داواكاری هاوڕێكەی ئینتەرنێتم . پێم ووت ئێستا ئامادەم لەگەڵت دەرچم .. ئەشمزانی ئەمەی ئەیكەم زۆر خراپ و مەترسیدارە و بێ فەرمانی خوای گەورەیە هەتا هەستم بە ترسیش ئەدەكرد بەلامەوە هەروەكو چۆن یەكەم جارم بوو بیبینم ئاوابوو .. هەرچۆنێ بوولەگەڵم دەرچوو .. بەڵێ بەدڵنیایەوە خۆم فرۆشت كە لەگەڵی دەرچووم .. حەزێكی زۆرم هەبوو لەسەر ئەوەی زیاتر لەنزیكەوە ئاشنای بە بیناسم.. ڕێك كەوتین بچینە یەك لە بازاڕەكان .. لەسەیارەیەك سەركەوتین بە نێوەندی جادەكەیا ئەڕۆیشتین هەستم بە هیچ نەدەكرد تەنها ئەوەندە ئەبێ كەمێك قەلەق و ناڕەحەت بووم . چونكە یەكەم جارم بوو لەگەڵ پیاوێك دەرچم كە هیچ پەیوەندیەكی خزمایەتیمان ئەبووبێ هەرئەوەندە تەنها دەوری حەوت مانگ بوو ئەمناسی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە وە یەك جاریش بینیبووم بۆ یەك دەقیقە .. ووردە ووردە دڵەڕاوكەم زیادیكرد .. دەستمانكرد بە گفتوگۆ پێم ووت ئەمەوێت كاتەكەمان زۆر نەخایەنێت ئەترسم مێردەكەم بمانبینێت یان شتێك ببیستێت .. پێی ووتم ئێنجا بابزانێ ئەوپەری تەلاقت ئەدا ئەجاتت ئەبێ ..هیچ سەرسام ئەبووم بە قسەكانی وشێوازی دەربڕینەكەی .. دڵەڕاوكەكەم زیادیكرد پێم ووت پێویست ناكات زۆر دووركەوینەوە .. نامەوێ زۆر دواكەوم لەگەڕانەوەم بۆ ماڵ .. پێی ووتم لەوەیە كەمێك دواكەوین .. لەبەرئەوەی ناتوانم ئاوها بەئاسانی دەست بەردارت بم حەزئەكەم زیاتر لەگەڵم بمێنیتەوە .. ئەمەوێ چاوەكانم پربن لە بینینی تۆ.چونكە لەوەیە ئەتوانم بتبینمەوە لەدوای ئەمە ..بەم شێوەیە قسەكانمان دەستی پێكرد ... ناڕەحەتیم هەر زیادی دەكرد لە هەمان كاتدا حەزم ئەكرد زیاتر لەگەڵی بمێنمەوە .. قسەكانمان زیاتر بە ئاقارێكی ڕۆمانسیدا ڕۆیشت ..ئەم ئەزانی كات كەیە و چەندێك بەسەرماندا تێپەڕیوە. هەتا هەستم ئەكرد بەكام ڕێگادا دەڕۆین .. لەناكاو گەیشتینە شوێنیك ئەم ئەزانی كوێ

یە .. لەشوێنی حەوانەوەوکێلگەو شتی وادەچووم .. هاوارم کرد ئێرە کوێیە ؟؟ بۆ گوێم ئەبەن ؟؟ چەند چرکەیەکی خایاند سەیاردکە وەستاو پیاوێکی تر دەرگای لێکردمەوە زۆر بە توندی دەری هێنام .. هەموو ئەو شتانە زۆر کتوپڕبوون .. هەر هاوارم ئەکردو ئەگریام لێیان تێنەگەیشتم چی ئەڵێن ؟؟ وە ئەشم ئەزانی چی بەدەورمەوەیە ئەوەندەدەزانی هەستم بەلێدانێکی بەهێزکرد بەرومیانا کێشا هەروەها گوێم لەدەنگێك بوو وەکوو بوومەلەرزە ئیتر ئاگام لەخۆم نەما .. نازانم چیان لەگەڵم کرد ؟ وە کێ بوون ؟ وە ژمارەیان چەند بوو ؟ .. تەنها دوانم بینی .. هەموو ئەمانە وەکوو هەورەبروسکەیەکی تیژ تێپەڕبوون .. هەستم بەهیچ نەدەکرد تەنها ئەوەندەبێ لە ژوورێکابووم نیمچە ڕووت و جل و بەرگەکانم دڕابوون هەر ئەگریام و هاوارم ئەکرد ..لەشم هەموو پیس ببو.. وای بۆ ئەچم میزم کردبێ بەخۆما .. چەند چرکە ساتێکی پێچوو کوڕەکە هاتەلام دەستیکرد بە پێکەنین .. پێم ووت ئەمەی بەسەرمدا هات ئێوەن ؟ تکایە ڕێم کەن .. تکایە ڕێم کەن .. ئەمەوێ بگەڕێمەوە ماڵ. پێی ووتم ماوەیەکی تر ئەگەڕێینەوە ماڵ بەلاّم ئەبێ بەڵێنی ئەوەدم پێبدەی نابێ هیچ کەسێ پێی بزانێ ئەگەر بزانن ئەمە عەیبەیەکە بۆ کەس‌وکاردکەت یان ئەگەر بەکەس بڵێیت و دەعوا بنوسی ئەوا تۆڵە لە منداڵەکانت ئەکەمەوە پێم ووت تەنها ئەمەوێ بگەڕێمەوە ماڵ بەهیچ کەسێك ناڵیم .. هەستم بەترسێکی زۆرکرد و هەموو لەشم ئەلەرزی و لە گریانیش ئەنەوەستامەوە .. هەرئەوەندەم لەبیرە لەو ڕووداوەی بەسەرم هات .. هیچ شتێکی وام بەبیرا نایا باسم نەکردبێ دەرچوونم لەماڵ تا گەڕانەوەم دەوری چوار کاتژمێری خایاند .. چاویان بەستمەوەو لە سەیاردکە سەریان خستم و لە شوێنێکی نزیك ماڵ فڕێیاندام .. باش بوو بەوحاڵەوە کەس نەیبینیم .. زۆر بەخێرایی چوومە ماڵەوە .. پاشان دەستم کرد بە گریان ئەمان گریان تاوەکوو ڕۆندك لەچاوم بڕا .. لە دواییدا پێم زانی کە ئەتك و ئیغتیساب کرابووم چونکە ئەزیف بووم و خوێنم هات .. چوومە ژورێکەوە دەرگام لەسەر خۆم داخست بۆ ئەوەی منداڵەکانم نەبینم وە هیچ پارەوە ئاێکیشم لەگەروو نەچووە خوار .. هاوار بەخۆم چۆن بەپێی خۆم چووم بۆ جەهەننەم ؟؟ ئەبێ حاڵم چۆن بێ دوای ئەم ڕووداوە ؟؟! زۆر ڕقم لەخۆم ئەبوەوە هەوڵم ئەدا خۆم بکوژم .. زۆر ئەترسام لە ئاشکرابوون هەروەها بەرچەکرداری مێردەکەم .. هیچ پرسیارم سەبارەت بە منداڵەکان لێ مەکەن ، هەر هەستم بە بوونیشیان نەنەکرد !! و ئەشم ئەزانی چی بەچواردەورمەوەیە .. تاکو مێردەکەم لەسەفەر گەڕایەوە هەستی بەگۆڕانێکی گەوردکرد ! پێشتر وانەبووم لەگەڵ ئەوەدا، بەلاّم حاڵم زۆر خراپ بوو زۆر بەپەلە بردمی بۆ ئەخۆشخانە .. سوپاس بۆ خوا هیچم لەسەر ئاشکرا نەبوو پشکنینێکی تەواوئەکرام. بەلاّم ووتیان تووشی بەدخۆراکی بووە و ژمارەکانی وشك بوونەوە پێویستی بە

حەسانەوەیە وە ماوەیەکی کەمی ئەویٚ زۆر ناخایەنیٚ .. داوام لەمێردەکەم کرد بمباتەوە بۆ ماڵ باوکم .. هەر ئەگریام کەس‌وکارەکەم وایان ئەزانی کێشەوموشکیلەی نێوان خۆم‌ومێردەکەمە .. باوکم زۆر قسەی لەگەڵمکرد، بەلاّم نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك. هەتا مێردەکەشم هیچی نەئەزانی .. هیچ کەسێك بە حاڵی نەئەزانیم کەس‌وکارەکەم پێشنیاری ئەوەیان کرد قورنانم لەسەر بخوێنن لەوەیە ئەخۆشبم ..

بەهیچ کلۆجێك لایەق بەو مێردەنیم داوای لێئەکەم تەلاّقم بدا .. جاران کە داوای تەلاّقم لێئەکرد لەبەر خۆمم بوو، بەلاّم ئێستا حەزئەکەم تەلاّقم دا لەبەر ئەو هەموو ڕێزوحەیایەی مێردەکەم و لەبەر ئەوەی باوکی مناڵەکانمە ..ئێستاش من شایانی مێردەکەم نیم .. شایانی ئەوەنیم لەنێو ڕێزوحورمەتی ئەودا بژیم .. هەمووشی بەهۆی خۆم‌و ئەو ئینتەرنێتە ئەفرەتیەوەبوو .. بەدەستی خۆم گلکۆیەکم بۆ خۆم سازکرد .. هاوڕێکەی چاتم ڕاوچیەکی وەکووخۆی ئەبوو بۆ ئەو کچانەی ئینتەرنێت بەکاردێنن .. هەرکەسێك ئەم بەسەرهاتەی من بخوێنێتەوە ئەبێتە پەندو ئامۆژگاری ئەیپارێزێ لە خراپەکاری .. بەلاّم ئێستاش من موستەحقی ڕەحمم .. هیوادارم کە کەس ئەم حاڵەتەی منی بەسەردا نەیەت .. تەمەننا ئەکەم مێردەکەم لێم ببورێ بەڕاستی ئەو شایەنی ئەو هەموو عەیب‌وعارە نیە .. هەروەها داوا لە مناڵەکانم ئەکەم لێم ببورن .. خۆم بەخۆمم کرد داوا لەخوای گەورە ئەکەم لێم خۆش بێ‌و لەتاوانەکانم ببورێ ..

ئێستا هاوڕێکەم، دوای خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە .. بۆ ئەو کچانەی ئینتەرنێت بەکار دێنن هەروەها بۆ ئەو کوڕانەی لەناو تەمەنی گەنجێتیدان و حەزەکان تینی بۆ هێناون لەخوا بترسن و خۆیان و کەس‌وکاریان بپارێزن .. ئەمە خراپی ئینتەرنێت نییە .. بەلکو ئێمە نازانین چۆن بەکاری بهێنین .. ئێمە وازمان لەهەموو شتە چاکەکانی هێناوە تەنها بەدوای شتە خراپ‌وشەڕەکانا ئەگەڕێین و ئەو شتانەی بەهای ئەخلاقی مرۆڤ ناهێڵێ .. من زۆر لۆمەی هاوڕێکەم ئەکەم. چونکە ئەو کەسێکی زۆر بەویقارو لێهاتوو بوو هەموومان بەغیلیمان پێ ئەبرد.. ئەو ژیانی ناخۆش نەبوو هەروەها هیچ کێشەیەکی لەگەڵ مێردەکەشیا نەبوو .. بەلکو زۆر لە ژیانێکی خۆشابوو، بەلاّم مەسئەلەی فەراغ لای هەرکەسێك نەزانێ چۆن بەکاری بێنێ خۆی لەخۆیا زۆر ترسناکە .. ئینتەرنێت بوارێکی یەکجار فراوانی هەیە بۆ وەرگرتنی مەعریفە لە هەمانکاتدا بۆ شەڕوخراپەکاریش .. بەلاّم واپێویست ئەکات ئێمە بزانین چۆن بەکاری ئەهێنین هەروا بەسادە و سانایی وەرینەگرین .. وە بزانین چۆن کاتە فەراغەکانمانی پێ پڕئەکەینەوە .. ئەو گەنجانەمان کە هیچ کاریان نییە کەس‌وکارەکەیان ئەبێ چاودێرییان بکەن، چونکە بە بۆچونی من هەموو شتێك

ئاگامان لێنەبێ سەرئەکێشێ بۆ خراپەکاری بەناشوکری نەبێ ئەوەندە کێشەش زۆر بووە وەکوو تەلاق .. دزی... هتد .......

کوا ڕۆڵی باوک و گەوردیی خێزان ؟؟!!

لەوەیە مێردەکەت مامەڵەیەکی چاکت لەگەڵ نەکا یان بە ئاراستەیەکی باشدا نەتبات یان نەزانێ چی لەپشت داواکاریەکانی تۆوە هەیە .. بەڵام خۆ ئەبێ بزانی چی ئەکەی و زانیاریت سەبارەت بە شتەکان هەبێ .. ئەی ئەوانەی بانگەشەی ئیسلامەتی ئەکەن .. بۆ خۆتان و بۆ ئەوانەی لەژێر سایەی سێبەری دەسەڵاتی ئێوەدان ؟ ئەو بەتاڵەیەی کە وولاتی ئێمەی گرتۆتەوە ئەوە شەڕێکە ئەمان شەڕ .. ئێمە هەر لە شوێن خۆمانین هەنگاو بەرەو پێشەوە نانێین ئەڵێی ئەعامەین سەرمان خستۆتە ژێر لەوە ولەشمان بەدەردەوەیە .. ئەرێ کوا بانگەوازو ڕێنوێنی و سەحوەو کۆمەڵی فەرمان بەچاکەکردن ؟ بۆچی ئێمە نەخێر کەس بین بگەین بە تەقەنیات و تەکنەلۆژیا ؟ بۆچی نەبینە پێشەنگ لەبری ئەوەی هەر پاشکۆو پەیوەست بین بە ڕۆژئاواوە ؟ کوا گەنجی سوار چاك و زانست خواز لەکوێیە ؟ کوا گەنجی موسڵمان چی فەسادێ سەزەمینی تەنیوە ؟ هیچی تر نالێم تەنها ﴿ حسبنا الله ونعم الوكيل .. اللهم سلم اللهم سلم .. اللهم لطفك بعبادك .. اللهم أبرم لهذه الامة أمرا رشدا يعزفيه أهل طاعتك ويذل فيه أهل معصيتك و يؤمر فيه بالمعروف وينهى به عن المنكر ﴾ . ئەوەی ماوە بوترێ پاش ماوەیەك هاوڕێکەم کۆچی دوایی کرد .. چۆیە ژێرگڵ ، بەڵام نهێنی یەکەشی لەگەڵ خۆی بردە ژێرگڵەوە .. مێردەکەشی بەهیچی نەزانی ئاگادارم زۆر بۆی نیگەران بوو بەڵام ئەوەندە زۆر بۆی نیگەران بووم .. ئەوەشم نەزانی وازی لە ئیشەکەی هێناو گەڕایەوە ناو منالەکانی .. ئێستا ئەزانم ئەم دنیایە هیچ گرنگیەکی نییە هەر هیچ تاموچێژێکی نییە.. مەگەربۆکەسێك لە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیدا (صلى الله عليه وسلم) سودی لێ ببینی...

# سەرکەشیەکی هەرزەکارانە

ئەم بەشە بەنیعتراف گەنجێکی ئالودەبووی عەرەق دەست پێدەکات . لەبەردەم ئەفسەرێکی لێکۆڵەردا بەوەی پێش سێ ساڵێ لەمەوبەر کچێکم ناسی بەناوی (شیرین) لەرێگای کچێکی هاورێمەوە بەناوی (مها) هاتوچۆی شوقەکەمی ئەکرد بۆ بەکارهێنانی موخەدەرات .. لەوکاتەوە یەکتریان ناسیوە . پاش ئەوە پەیوەندیەکەیان بەهێزتر بووە . بەردەوام بانگی کردۆتەوە بۆ شوقەکەی خۆی . شەوانە کە ئەمانەوەو موخەدەراتیان بەکاردەهێنا لەو شوقەیە .

دەڵێ : هەموو رۆژێ زیاتر لێ ی نزیك دەبوومەوە . وای لێهاتبوو وەکوو ژن ومێرد موعاشەرەمان ئەکرد . هیچ کێشەیەکیشمان نەبوو . بەردەوام هەردووکمان لەحاڵەتی ئیدماندا بووین . هیچ تام و چێژی حەلاڵم لە حەرام جیانەکردۆتەوە . وە هیچ رێسایەك لە ژیانمدا نەبووە !! هیچ گرنگیەکی بەوە نەدەدا دوای مانەوەی لەگەڵ مندا زوو بگەرێتەوە بۆ ماڵەوەیان . بەردەوام پرسیاری ئەوەم لێکرد : ماڵەوە لێت ناترسن ؟ پرسیارت لێ ناکەن؟ لەکوێ بووی ؟ لەبەرچی دواکەوتی ؟ ئەیووت هەرجارێك ئەگەرێمەوە ماڵ ئەبێتە کێشەمان . تا کار گەیشتۆتەوە ئەوەی راهاتوون لەسەر ئەمە!! لەناکاو رۆژێك لەرۆژان لەدەرگای داو جانتایەکی بەدەستەوەبوو پێی ووتم ماڵەوەمان دەریانکردم . بەناچاری دێمەلای جەنابت . پێکەوە لە شوقەکەدا ئەژیاین دایکیشم لەگەڵمان بوو . هەموو جارێ دایکم پرسیاری ئەوی لێئەکردم منیش ئەم ووت کەی کێشەیە ؟ ئەوە تەنها برادەرمە لەگەڵ ماڵەوەیاندا کەمێك کێشەی هەیە . ماوەیەکی کەمی پێ ئەچێ چارەسەر ئەبێ . زیاد لە ساڵێك ئەبوو من و دایکم و شیرین پێکەوە ئەژیاین لەشوقەکەدا . هەتا رۆژێ لەسەر موخەدەرات گیرام .. منیش یەکێك بووم لەو هاورێیانەی ئیدمانی موخەدەرات ببووین .. دوای ئەوەی لە سجن دەرچووم تەماشام کرد شیرین هەر لەگەڵ دایکم ماوەتەوە و ئەژی .. دووبارە گەرامەوە سەر بەکارهێنانی موخەدەرات . ئەم گەنجە لەسەر دانپیانانەکەی خۆی بەردەوام بوو. هەتا ئەفسەرەکە ئەوەی لێپرسی : کێ شیرینی هاورێتی کوشت ؟ ئایا هەر هاورێت بوو یان ژنت ؟؟ گەنجەکە لەسەر قسەکردن بەردەوام بوو ئەیووت کاتێك لەسجن بووم شیرین بە بەردەوامی سەردانی کردوم .. وە کە لە سجن دەرچووم شوقەیەکمان بەکرێ گرت . چووینە ناوی هەستاین بەکرینی برێکی کەم لە هیرۆیین . لەو شوقەیە پەیوەندی نێوانمان زیاتر بەهێزبوو . داوای زەواجم لێکرد ئەویش رازی بوو. بەلام زەواجی (مساطیل) .. زۆربەی کاتەکانمان لەو شوقەیەدا کێشانی موخەدەرات بوو...

لەناکاو ئەفسەرەکە پرسیاری شیرینی کرد ووتی : کوا مەیتەکەی ؟؟

زۆر بەسانایییەوە ووتی وا لە شوقەکەم !! ئەفسەرەکە داوای لە هێزی پۆلیس کرد ئەوانە لەتاوان ئەکۆڵنەوە چوون بۆ شوقەکە گەنجەکەشیان بەدەست بەستراوی لەگەڵدابوو . دەرگای شوقەکەیان کردەوە . پۆلیسەکان چوونە ناو ژوورەکەوە یەکسەر هەستیان بە بۆنێکی زۆر ناخۆش کرد . هەندێ کەلوپەلی ناومالیشی لێبوو . لاشەی شیرینیان بینی ڕاست کرابووەوە و پشتی بەدیوارەوەکەوە بوو جلی خەویشی لەبەردابوو . وای پێ ئەچوو ئەم ڕووداوە کاتێکی زۆربێ رووی دابێ . چونکە لاشەکەی شیرین شین ببۆوە . لەتەنیشتییەوە دەرزییەکی لێبوو شوێنەواری خوێنی پێوە دیاربوو . یەکێك لە پۆلیسەکان هەستا هەرچی شتێك لە ژوورەکەیا بوو کۆی کردەوە بەشێك لەو شتانەش شوێنەواری خوێنی پێوە بوو . لەگەڵ دەرزییەکی هیرۆیین کە دەرزی زۆری پێ لێدرابوو . هەروەها تەپلەکێکی جگەرەی لێ بوو پڕ بوو لە پاشماوەی جگەرە . دوای ئەمە لاشەکەی شیرینیان هەلگرت و بردیان . گەنجەکەش بەبەندکراوی لایان مایەوە . چاوەڕێی ڕاپۆرتی پزیشکی بوون . دوای ئەوە ڕاپۆرتە پزیشکییەکە هاتەوە تیایدا هاتبوو کە هۆی مردنی شیرین بەکارهێنانی دەرزییەکی زۆری هیرۆیین بووە کە بۆتە هۆی وەستانی دلی . چونکە تەحەمولی ئەو هەموو دەرزییەی نەکردووە .

لەبەردەوامی لێکۆلینەوە گەنجەکە دانی بەوەدانا کە خۆی و شیرین بەردەوام خەریکی بەکارهێنانی مەخەدەرات بوون . پێش ئەوەی کۆتایی پێ بێ موماردەسەی سێکسی لەگەڵ کردووە . دوای ئەوەی ئەمان خەوتون شیرین هەستاوە بەلێدانی دەرزی هیرۆیین لەبەرئەوەی تەحەمولی نەکردووە مردووە . ئەم ئاگای لە هیچ نەبووە ئەوەندە نەبێ کەلە خەو هەستاوە ئەبینێ مردووە و لاشەکەی لەسەر زەوییە . ئەمیش هەساوە بەڕاستکردنەوەی و پشتی بە دیوارەکەوە ناوە و دەرزییەکی تری هیرۆیینی لێداوە . بەلام ڕاپۆرتە پزیشکییەکە ئەوە دەردەخات کە هەموو شوێن پەنجەکان شوێن پەنجەی گەنجەکەیە . تەواوی ڕووداوەکە گەنجەکە تاوانبارکرا بە کوشتنی کچە گەنجەکەی هاوڕێی بە زیاد لێدانی دەرزی هیرۆیین . وە مەحکەمە حوکمی دا بە بەندکردنی بۆ ماوەی پێنج سال . رەوانەی ئەخۆشخانەکرا بۆ چارەسەری دەروونی تاکوو ماوەی ئەو چەند ساڵەی سجن بەسەر دەبات . دوای هەموو ئەمانە چی بلێین ؟؟ کوا ڕۆلی خێزان ؟ کوا ئەرکی خێزان لە ناراستەکردنی منالەکانیان ؟ لەبەر چی ڕۆلەکانیان فێری حەرام و حەلاڵ ناکەن؟ وە لەبەر چی فێری نوێژیان ناکەن ؟ یان فێری یەك ئایەت لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان ناکەن ؟ لەبەرچی پەروەردەیان ناکەن بە ئامۆژگاریە ئاسمانیەکان ؟؟ ئەمە مەسەلەیکی گەورەیە کە گەنج تەنها خۆی ناتوانێ تەحەمولی بکات . ئەبێتە هۆی تیاچوونی خێزان . دایكوباوك ئەگەر بێت و هەلنەسن بە ئەرکی سەر شانیان و پەروەردەکردنی منالەکانیان بەتایبەتی دەربارەی موخەدەرات و

شتی تری لەو بابەتە ئەوا ئەبنە قوربانی . هەموو لایەکیشمان زەردەمەند دەبین داوا لە خوای گەورە دەکەین خۆمان و ماڵ منالّمان بپارێزیّ لە دنیا و لە دوارۆژدا .........

## ژوانێك لە شالیە(١)

ئەمە چیرۆکێکی واقعیە ، مەبەست لێی تەنها وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاریە . بەڕاستی ئەم چیرۆکە هەروا بە سانایی لەبیر ناکرێ . ئەم چیرۆکە پڕە لە عیبرەت بۆئەو کەسەی بیەوێ سنوری ئەو شتانە بشکێنێ کە خوای گەورە حەرامی کردوون یان گاڵتە بە ئیرادەی کچی خەڵکی بکات . ئەمە چیرۆکی کوڕێکە کە هیچ غەمێکی نەبووە جگە لە هەڵخەڵەتاندنی کچانی بەستەزمان ئەویش بە قسەی شیرین و بەڵێنە درۆینەکانی . کاتێك وای لە یەکێك ئەکرد هەوڵی ئەدا بۆ یەکێکی تر . ئەم گەنجە نە دینی هەبووە نە شەرم ، هەروەکوو دڕندەی کێوی لە دەشتێکی چۆڵ بگەڕێ بۆ نێچیرێ لە کەلاکەکەی وەربێ و برسێتی خۆی پێ تێر بکات .

لە یەکێك لە هەوڵەکانیدا کچێکی بەد بەخت بوو بە تۆڕە فێڵاویەکەیەوە لە ڕێگای ژمارەی تەلەفۆنەکەیەوە پەیوەندی پێوەکرد ، سەرەتا گوێی لە ووتە شیرنەکانی بووە وەکو بڵێی توابوەوە لەناوجیهانی سۆزو خۆشەویستیدا ، توانی بە فێڵە سەیروسەمەرەکانی دڵی بۆلای خۆی ڕابکێشێ ئەمجا ئەم شتە پیسە هەستی کرد وەکوو میوەیەکی کامڵ و گەییشتوو کاتی لێکردنەوەی هاتووە هەروەکو چۆن لەگەڵ غەیری ئەمیش کردبووی . بەلاّم تووشی بەربەست هات لای کچەکەوە . پێی ووت : بەینی من و تۆ خۆشەویستیەکی پاكو بێ گەردە ناتوانین بگەین بەیەك مەگەر بەزدواجی شەرعی نەبێت . چەندجار . ویستی لە خشتەی بەرێ بەلاّم سەر نەئەکەوت .. زانی جارێکی تریش هەوڵەکانی شکستی هێنا . بۆیە ئەیویست تۆڵەی لێ بکاتەوە دەرسێکی وەهای بدات قەت لەبیری نەچێتەوە ، ئەم جارەیان پێی ووت هەست و ناخم هەمووی خۆشەویستی و سۆزی تۆیە بەجۆرێکی وا کە قەت ناتوانم لێت جیاببمەوە بڕیاری ئەوەم داوە بێمە داخوازیت . گەیشتۆتە ئەندازەیەك یەك چرکە ناتوانم لێ دووربم لەگەڵ تۆ نەبم ئەمرم ..

لەبەرئەوەی زۆر فێلاوی بوو بەردەوام سۆزوخۆشەویستی خۆی بۆ دووبارە ئەکردەوە ئەم فاسقە هەرکات پەیوەندی پێوە بکردبا ئەوباسەی زیاتر ئەوروژان . بەڵێنی ئەوەی پێدابوو

---

(١) شالیە : ئەوشوێنەیە یان ئەو زنج و کوخەیە کە لە کەناری دەریا دروست ئەکرێ زیاتر بەڵێنە عاشقانەکانی تیا ساز ئەکرێ یان لەوێ ژوانە خۆشەویستیەکانی تیا ئەنجام ئەدرێ زیاتر ئەم ناوە بەزۆری لە وولاّتی میسر بەکاردێت . "وەرگێر"

# مامۆستا و کچە خوێندکارەکەی

یەکێك لە مامۆستاکان وای ووت :

سەردتای ئەم چیرۆکە بەوە دەست پێ دەکات یەکێك لە کچە خوێندکاردەکان هاتە ژووردکەم لەگەڵ یەکێك لە مامۆستا ئافرەتەکانی قوتابخانەکەم حاڵی زۆر بەرێشان بوو .. زۆر هەوڵمان لەگەڵیدا ئارامی بکەینەوە بەڵام بێ سوود بوو .. داوام لێکرد کە وا پێویست نەکات دانیشێ . قورئانێکم دایە دەستی و کردمە سەر سوردتی (یس) ووتم قورئان بخوێنە هەتا کەمێك دێتەوە سەر خۆت ، قورئانەکەی لێوەرگرتم و بەهێمنی دەستی کرد بەخوێندنەوەی .. منیش چووم بەلای ئیشی خۆمەوە .. وە من وا گومانم ئەبرد کە تووشی نەخۆشی دەروونی بووبێ یان خزم و کەسێکی نزیکی مردبێ و کا ری تێکردبێ .. ئەم ووت یان دیاردەیەکە وەکوو هەموو ئەو دیاردە ڕۆژانەییانەی کە بەسەر هەموومانندا دێت .. هەرگیز ئەوە بەبیرمدا نەدەهات کە ئەم گوڵە جوانە ببێتە بارگرانی بەسەر شانی خێزانەکەیەوە .. کچە هێمن بوودوە و بەچەند هەنگاوێکی حەزین لێم نزیك بوودوە .. لەبەرامبەرم دانیشت .. هەستم کرد کاتی ئەوە هاتوە قسە بکەین .. سەردتا ئەو دەستی پێکردو ووتی : ئەم بەسەرهاتەم سەردتای پشوی ساڵی ڕابردوو ی خوێندن بو .. دایك و باوکم لەگەڵ داپیرم سەفەری دەردوەی وولاتیان کرد بەمەبەستی چارەسەر ... من و خوشکە بچوکەکانمیان لەماڵەوە بەجێهێشت بەچاودێری ئامۆژنم .. ئەویش نیمچە نەخوێندەوارێك بوو کاروبارو فەلسەفەکانی ژیان تێ نەدەگەیشت .. هەستم بە مەلەل و نارەحەتی ئەکرد .. چونکە یەکەم جارم بوو دابرێم لە دایکم .. سەردتا دڵی خۆم بە ئینتەرنێت ئەدایەوە بەناو مەوقیعەکاندا ئەگەڕام .. کاتێکی زۆر خەریکی ئەبووم و هیچ لە خۆم نەئەترسام چونکە لە خێزانێکی چاك وە پەروەردەیەکی باش پەروەردەکرابووم .. تاکوو ڕۆژێك کوڕێکم ناسی لەهەمان وولاتی خۆم بەڵام شاردکەیان جیا بوو .. یەکەم جار بە بەڵگەی دڵدانەوەی خۆم قسەم لەگەڵ ئەکرد .. کاتە بەتاڵەکانی خۆم پێ پڕ ئەکردەوە .. پاشان بوو بە بێنی ڕۆژانە .. داوای لێکردم لەرێگای ماسنجەرەوە قسە بکەین منیش ڕازی بووم .. ڕۆژانە گفتوگۆمان ئەکرد و شەوانە چەند سەعاتێکی زۆر ئەماینەوە تا بەیانی .. لەم ماوەیەدا وای لێهات ئەو ژیانی خۆی بۆ من باس کرد منیش ژیانی خۆم بۆ باس کرد .. زانیم کە ئەو لەپێشدا گەنجێکی سەردرۆ بووە و زۆر حەزی بە سەفەرەو گەشت کردووە و هەموو جۆرە حەرامێکی تاقیکردۆتەوە ..موناقەشەی شتی بەسودمان ئەکرد لەژیانا بەزیرەکی خۆم توانیم ڕێڕەوی ژیانی بگۆڕم .. دەستی کرد بە نوێژو ئیلتیزاماتی ئایینی ..؟؟!!! دوای ماوەیەك داوای خۆشەویستی لێکردم .. بەتایبەتی من ئەوم گۆڕیوە .. سلوك و ڕەفتاریم

جوان کردووه بەویەری قەناعەتەوە پێی ووتم کە ئەو ژیانە هیچەی پێشوم کۆتایی پێ هات ..
لەسەرەتاوە دوو دڵ بووم بەڵام دوای چەند رۆژێك بۆم دەرکەوت کە منیش پەیوەستی ئەو
بوومە . لەو کاتانە خۆشحاڵ دەبووم کە لە ئەو نزیك بووم . لەرێگای ماسنجەرەوە ..
پەیوەندیەکەمان زیاتر بەهێز بوو وە داوای بینینی لێکردم ... منیش رازی بووم لە شوێنێکی
گشتیا یەك ببینین بۆ چەند ساتێکی کەم .. ئەو رۆژەی وەعد وابوو یەك ببینین هەرچۆنێك بوو
توانیم ئامۆژگاریی قەناعەت پێ بکەم بە بیانوی ئەوەی هاوڕێکەم داوای ئەوەی لێکرودم بچم سەردانی
بکەم تاکوو کاتی مەوعیدەکەمان هات .. دڵم هاتە لەرزین . لێدانەکانی لێدانێکی ئاسایی نەبوو .
یەکمان بینی وییای ئەوەم نەدەکرد من ئەو شێوەیە ببینم .. هەروەکوو جیرۆکێکی خەیاڵی ئەو
بەدیهێنەری خەونەکانە بێ .. بۆ چەند ساتێك قسەمان کرد .. ئەویش سەرەتا زۆر سەرسامی
شێوەی من بوو .. پێی ووتم تۆ لەوە جوانتری من بیرم لێنەکردووە .. گەڕامەوە ماڵ خەریك بوو
لە خۆشیا سێت بم .. وەکو بڵێی ئەفریم لە خۆشیا .. دنیام لەبەرچاو گۆڕابوو .. گەیشتە ئەو
ئەندازەیەی کە مامەڵەم لەگەڵ خوشکەکانم بە شێوازێکی تربوو .. ببووم بەیەك پارچە نورو
رۆشنایی لە سۆزوپەزەیی بۆ خێزانەکەم ووتم ئەوە ئەو کەسەیە کە فێری خۆشەویستی
راستەقینەی کردم .. دوای ئەوە قسەکردنمان چووە قۆناغێکی ترەوە .. بەڵێنی ئەوەی پێدام کە
هەر خێزانەکەم لە سەفەر گەڕایەوە بێتە داخوازیم .. منیش قبوڵم نەکرد ووتم با خوێندن تەواو
بکەم لە ماوەی یەکسالدا سێ جار یەکمان بینی .. لەگەڵ هەموو جارێکدا زۆر دڵخۆش نەبووم
دنیام لەبەرچاو نەگۆڕا .. دوای ئەوە خێزانەکەم لەسەفەر گەڕانەوە بەڵام جەوی خێزانەکەم
ناڕەحەت بوو، چونکە چارەسەری نەخۆشیەکەیان سەری نەگرتبوو .. لەسەرەتای ساڵی تازەی
خوێندندا دووبارە داوای لێکردم بم بینێ بەڵام من قبوڵم نەکرد لەبەر ئەوەی دایکم هاتبووە ئەو
بێی ووتە هەواڵێکی لەناکاوو کتوپرم پێیە !! زۆر خۆشە ! منیش رازی بووم لەکاتی
مەوعیدەکەماندا ووتی هەواڵە کتوپرەکەش ئەوە بوو کە ئەمەوێ ئەڵقەی زەواج بکەمە پەنجەت !!
زۆر پێی دڵخۆش بووم ووتی دێم لەگەڵ کەس وکارەکەت قسە ئەکەم ... بەڵام رازی نەبووم بە
بیانوی خوێندن لەهەمان رۆژداو لە چەند چرکەساتێکی لاوازیدا .. تەسلیم بەشەیتان بووم ..
چرکە ساتەکانی خەمبارییە .. نازانم چۆن باسی کەم هیچ حەزم لێ نییە بیرم بکەوێتەوە .. خۆم
لە حاڵێکی زۆر خراپدا بینیەوە ئەم نەزانی من ئەو کەسەم لەسەر کردەوەی چاك و ئەخلاق
پەروەردەکرابم .. پاکیزەی خۆمم لەدەست دا لەلای هەر ئەوەندە حەیاوکەرامەت وبەس . بەڵکو
هەموو شتێکی خۆمم لەدەست چوو .. دوای ئەمە دڵی ئەدامەوە بەوەی لە نزیکترین کاتدا بێتە
داوام .. پێ ووتم برۆ بیر لەو مەسەلەیە بکەرەوە . رۆژێك دیاری بکە بێم قسە لەگەڵ خێزانەکەتا

بكەم .. بەتێك شكاويەوە گەڕامەوە ماڵ .. دڵ تەنگ .. لەوچەند ڕۆژەدا حەزم ناكرد يەك كەس چییە ببینم .. كاری لە دابەزینی ئاستی خوێندنیشم كرد .. هەموو ڕۆژێ كە قسەی لەگەڵ ئەكردم پرسیاری چۆنییەتی سیحەتی لێئەكردم .. دەوروبەری دوو هەفتە هەر داوام لە خوای گەورە ئەكرد ئەو ئابروچونەم ئاشكرا نەكات .. سوپاس بۆ خوا سیحەتم بەردو باشی ئەڕۆیشت .. ووردە ووردە هێمن بوومەوە .. هەردووكمان ڕێك كەوتین لەسەر ئەوەی لە كۆتایی ئەو مانگەدا بێتە داخوازیم .. لەماوەیەكی زۆر كەمدا نزیكەی هەفتەیەك دەنگی نەما !! بەلأم بەنیسبەت منەوە گەلێ زۆر بوو بەبێ هیچ عوزرێك دەنگی نەبوو .. زۆرم هەوڵدا قسەی لەگەڵ بكەم بێ سود بوو .. بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر چاوەڕێ بووم .. تاوەكوو بە پۆستدا نامەیەكم بۆ هات .. بەلأم نامەیەكی زۆر كورت و سەیر هیچی لێتێنەگەیشتم .. داوام لێكرد بە تەلەفۆن قسە بكەین بۆ ئەوەی لە یەك حاڵی بین .. لەپاش ئەمە نزیكەی كاتژمێرێك یەكمان بینی .. بەلأم چیم بینی حوزنێكی زۆر قوڵ لە چاوەكانیا بەدی ئەكرا .. زۆرم هەوڵدا هۆكارەكەی بزانم .. بەلأم هیچ سوودی نەبوو لە ناكاو دای لە پرمەی گریان !! قەت تەوەقوعی ئەوەم نەئەكرد من پیاوێك بەو شێوازە ببینم .. هەموو لەشی نەلەرزین لەتاو گریان !! وای بۆ چووم ئەندامێكی خێزانەكەی مردبێ .. دووبارە زۆرم هەوڵدا هۆكارەكەی بزانم .. بەلأم هەربێ سوود بوو داوای لێكردم كە بە خێرایی بگەڕێتەوە ماڵ .. خەریك بوبروا پێم ووت : دوای ئەم مەوعیدە یەك ئەبینینەوە .. بەلأم ئەو داوای لێكردم لەبیری كەم !! تێ نەگەیشتم نەمزانی بۆ ئەبێ لە یادی بكەم !!؟؟ دەستم كرد بە گریان .. تاوانبارم كرد ووتم : ئەتەوێ لەناوم بەری .. بەلأم قسەیەكی زۆر سەیری كرد !! لەبیرم ناچێ ئەگەرچی من ئەمویست ڕووی ژاكاوی ئەو بگەشێنمەوە ، ئەو ووتی نەخۆشیەك سەری لێم هەڵداوە ؟! دوای ئەوەی كە هیچ كات نەمابوو ، چی نەخۆشیەكت مەبەستە ؟؟ چی كاتێك ؟؟ ئەو قسانە واتای چی یە پێم ئەڵێی ؟؟ هاوڕێكەم تووشی نەخۆشی (ئایدز) ببوو .. لەم دواییەدا بەرێكەوت زانیبووی.. ئەمە بەسەر هاتەكەم بوو زۆر بەكورتی .. تیاماوم لەناو نارەحەتی و خەفەتا ... ڕووبەڕووی داهاتویەكی نادیار .. بەدڵنیاییەوە ئەو نەخۆشیە بۆ منیش گوازراوەتەوە .. ئێستا تیا ماوم نازانم چی بكەم ؟؟ كۆتایی بە قسەكانی هات ......

دوای ئەوەی ئەم چیرۆكە گریاناویە ئەخوێنینەوە .. حەقی خۆمانە بپرسین كێ بەرپرسە بەرامبەر ئەم قوربانیە ؟؟ لە كاتێكدا لە خێزانێكی چاك و باش پەروەردەكراوە !! بەلأم ئەوندە ماوە بڵێین بە هەموو كچێك ، ئاگاداربە و خۆت بپارێزە .. شتی گەورە بە بچوك مەزانە چونكە هەموو هەڵەیەك سەرەتا لە شتی بچوكەوە دەست پێدەكات بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار گەورە ئەبێ ... ئاگاداربە ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆش نەبیتە یەكێك لەو قوربانیانە .. پاشەڕۆژێكی نادیار چاوەڕێت

ئەکات ئەگەر بێت و تۆش بەورێگایەدا بڕۆی .. حیشمەت و حەیای خۆت لەدەست بدەی یان سنوری خوای گەورە ببەزێنی !!

## هیوایەتێکی لەدەست چوو

دایکی موحەممەد ئافرەتێکی تەمەن چل ساڵی کامڵە ئاوها ئەم بەسەرهاتە ی گێڕایەوە :

لەگەڵ مێردەکەم ئەژیاین ، بەلاّم ژیانێکی زۆرخراپ ، پەیوەندی نێوانمان زۆر لاواز بوو لەبەر ئەوەی پیاوەکەم کەسایەتیەکی زۆر بەهێزی نەبوو ، من خۆم وەکوو ژنێك توشی لەخۆ دەرچونێك ببووم تەنها ئەوە نەبێ پیاوێکی چاك بوو ، ئەمەش وای لێکردم تەحەمولی هەموو ئەو ناخۆشییانە بکەم سەبارەت بەو بڕیارانەی تایبەت بوو بە خێزانەکەم . زۆربەی جار مێردەکەم لەگەڵ شەریکەکەی پێکەوە بوون بەزۆری لە نوسینگەی تایبەتی خۆی کە بەشێك بوو لە شوقەکەمان دائەنیشتن بۆ ماوەی چەند ساڵ ، تاوای لێهات ئەو برادەرەی خۆی و خێزانەکەی هاتن بۆ ماڵمان ئیتر سەردانەکانیان دەستی پێکرد بەخێزانی ئەهاتن لەبەرئەوەی پەیوەندی لەگەڵ مێردەکەم زۆر بەهێزبوو سەرنجی ئەوەم نەدا کە چەند جار هاتن وە هەر هاتنێك چەند کات ژمێرێکی خایاند ... تاکوو وای لێهات بە تەنهاش ئەهات لەگەڵمان دائەنیشت بە چەند سەعات ، مێردەکەم زیاد لە پێویست متمانەی پێبوو ، ڕۆژ هات و ڕۆیی یەکمان ناسی . بەلاّم چەند پیاوێکی ڕێك و پێك و موحتەرەم بوو ؟؟ وای لێهات دڵم بۆی لێی ئەدا !! لەهەمان کاتدا هەستم کرد ئەویش دڵی بۆ من لێ ئەدا .. دوای ئەوە مامەڵەمان زۆر سەیر بوو ، گەیشتم بەو قەناعەتەی ئەمە ئەو پیاوەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان خەوم پێوە ئەبینی ... بەلاّم لەبەر چی ئێستا دێ دوای ئەو هەموو ساڵە ؟؟ هەمووجارێك کە ئەمبینی لەبەر چاوم بەڕێزتر ئەبوو ... لە هەمان کاتدا مێردەکەم لەبەر چاو سوك ئەبوو. وەکوو بڵێی وای لێهاتبوو پێویستم بە بینینی کەسایەتیە بەرزەکەی ئەکرد لە بەرامبەردا ئەوەش ناشرینی مێردەکەم بۆ دەرئەکەوت ... بە ینی من و ئەو نەم زانی گەیشتە چی ڕادەیەك تاوای لێهات شەو و ڕۆژ لەیادم بوو ... نە من و نە ئەویش ئەوەی لە دڵمانا بوو دەرمان نابڕی ، لەگەڵ ئەوەشدا ژیانم کۆتای پێهات !! باس ناکرێ کە چەند ڕقم لەسلوکی ناشیرینی مێردەکم دەبووەوە ، نازانرێ کە چەندێك دڵم پڕ لە قین بوو بەرامبەری ، پرسیاری ئەوەم لە خۆم ئەکرد کە من چۆن ئەم هەموو ساڵەم لەگەڵ ڕەتاندووە ؟ بارێکی قورس بوو لەسەر شانم ، من تەنها کەسێکم لە ناو ئەم هەموو ئاڵۆزی ژیانەیا ماوم ، بۆیە

وای لێهات داوای تەلاقم لێکرد !! بەڵێ ئەویش تەلاقی دام لەسەر داوای خۆم . دوای ئەمە بوومەهۆی بەفەتاردتدانی ئەو پیاوە .. بەو تەلاقەی من . ماڵ و حاڵی لێ تێکچوو .. منالەکانە سەریان لێ شێوا . وە ئەو ماڵەی تریش تێکچوو . چونکە ژنەکەی شتێکی لە دڵا دروست ببوو . ژیانی ئەویش بوو بە جەهەننەم ... گەیشتە ئەو رادەیەی خێزانی ئیردیی لێم ئەکرد جارێکیان نیوەی شەو ماڵی بەجێهێشت و هاتە سەرم هەر ئەگریاو هاواری ئەکرد بۆ وام لێ ئەکەی ؟؟ خەریك بوو خێزانەکەی داڕوخێ ... من ئێستا دان بەو ڕاستیانەدا ئەنێم ئەو دانیشتنانەی ئێمە و ئەو پێکەوە ژیانە ئەو هەلەی بۆ ئێمە رەخساند کە ئاوەها لە شوێنی خۆیا کاتمان بەسەر بەرئەبرد .. خێزانەکەی ئەو و خێزانەکەی منیش وێران بوو . هەموو شتێکم لەدەست دا ئێستا ئەزانە ژیانی من و ژیانی ئەویش هیچ هەنگاوێکی ئیجابی ئەناوە .. من هەردەم ناخ بۆ ژیانی رابردووم هەڵئەکێشم . بەدوای خۆشیەکانیا ئەگەرێم . بەدوای ئەو هیوایەتە لەدەست چووەم . بەدوای

# یەك بە یەك

دایکی ئەحمەد قسەی بۆ ئەکردین و ئەیووت :

مێردەکەم کۆمەڵێ برادەری هەبوون کە هەموویان زەواجیان کردبوو ، بەهۆی ئەوەوە پەیوەندی کۆمەڵایەتیمان بەهێزبوو هەر شەوەی لەماڵ یەکێکیان دائەنیشتن . بۆ خۆشی و کات بەسەر بردن ، بەڕاستی من زۆر بەو جەوە مورتاح نەبووم . شەوانە کە دائەنیشتن شیرینی و شەربەت و شتی شەوانەیان دائەنا . بەهۆی نوکتە و قسە خۆشەکانیانەوە ئەیاندا لە قاقای پێکەنین هیچ ئەدەب و ڕێزێك لە بەینیاندا نەمابوو ... بەناوی برادەرایەتی و تێکەڵ بونەوە وای لێهاتبوو لەژێرەوە قسەیان بۆ یەك باس ئەکرد ئەیان چپان بەگوێی یەکتردا و بەناوی گاڵتەوە ....ئەو ژن واو ئەو پیاو وا !! ئەمانە تا ئەهات زیادی ئەکرد بەبێ هیچ شەرم و حەیایەك تاوای لێهات کار گەیشتە باسکردنی جنس و شتی تایبەت بە ژنان!! ئەم باسانە زۆر ئاسایی بوو بەلایانەوە . لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خۆش و سەرنج ڕاکێش بوون .. زۆر حەزم بە مەجلیسیان ئەکرد بەلاَم ویژدانم ڕێی پێنەدادم . هەتا ڕۆژێ هات کە ئەو هەموو قەباحەت و خراپەکاریە ئاشکرابێ .. ڕۆژێ تەلەفۆن لێی دا هەڵمرگت یەکێك لە هاوڕێ شەلاتیەکانی مێردەکەم بوو . منیش گفت و لفتێکی شیرینم لەگەڵکرد . عوزرم بۆ هێنایەوە ووتم ببورە مێردەکەم لە ماڵ نییە . جوابی دامەوە ووتی ئەزانم لەماڵ نییە . بەلاَم لەبەر خاتری تۆ تەلەفۆنم کرد !! هەندێ قسەی لەگەڵ کردم پاشان داوای پەیوەندی خۆشەویستی لێکردم !! زۆر توڕەبووم و سەرکۆنەم کرد . بەلاَم دەستی کرد بە پێکەنین و ئەیووت ئەمە پاداشتی ئەو چاکەیەم ئەدەیتەوە کە لەگەڵتا کردومە . موراقەبەی مێردەکەتم ئەکرد ئەزانی چی کردووە ؟؟! ئەو قسەیە تێکی شکاندم . بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا لەدڵی خۆمدا ئەمووت ئەم کەسە ئەیەوێت ماڵم وێرانکا . لەهەمان کاتیشدا تووشی دڵەڕاوکە و گومانی کردم بەرامبەر مێردەکەم .. لەماوەیەکی زۆر کورتدا کێشەکە گەورە بووەوە .. زانیم کە مێردەکەم ناپاکی لەگەڵ کردووم وە پەیوەندی لەگەڵ ژنێکی تردا هەیە . سەبارەت بە من وەکوو مردن وابوو . ئەوەم بۆ مێردەکەم ئاشکراکرد ووتم تۆ تەنها کەس نیت بتوانیت ئەو کارە بکەیت . منیش ئەتوانم وەکوو تۆ بکەم .. چیرۆکی برادەرەکەیم بۆ گێڕایەوە .. خەریك بوو جەڵدە لێیدا . پێم ووت ئەگەر ئەتەوێ من ڕازیبم بەوەی من پەیوەندیت لەگەڵ ژنێکا هەبێ ئەبێ تۆش بۆ من ڕازی بی .. ئەو قسەیەم وەکوو بومەلەرزە هەموو گیانی هەژان .. ئەو ئەیزانی من ئامەوێ ئەو کارە بکەم . بەلاَم بۆ ئەوەم بوو کە واز لەو کارە بێنێ و دوورکەوێتەوە لەو کەشە فاسیدە کە تیا ئەژیا .. زۆر هەوڵم لەگەڵیدا هەتا وازی لەو ئافرەتە خراپە هێنا . لای من وای ئەووت بەڵێ وازی لێهێنا هاتەوە ناو ماڵ و مناڵەکانی .

بەلام چ کاتێك مێردەکەم گەڕایەوە ؟؟ وە چۆن گەڕایەوە ؟؟ دوای ئەوەی کە دڵی بریندار کردبووم بەو کەشە خراپ و نالەبارە . لە کۆتاییدا گەواهی ئەدەم لەسەر ئەو شەوانەی ناویان لێ ئەنا شەوە خۆش و پاکەکان ، بەلام هیچ خۆشی و پاکێتی تیا نەبوو . هەر ئەوەندە ماوە بڵێم خوای گەورە بەرەحمی خۆی لێمان خۆش بێ ....

## بێچوی مراوی نەزانە

### کچێك لە تەمەنی ( ١٩ ) نۆزدەساڵیا بوو بۆی گێڕاینەوە :

**کاتێك کە منداڵ بووم ،** بەچاوی خۆم چاوم لەو شەوانە بوو کە هاوڕێی خێزانەکەم تیانەمانەوە . هیچ کەسێکی وام لەیاد نەماوە تەنها پیاوێك نەبێ ئەویش باوکم بوو . ئاگام لە هەموو جوڵە و هەڵسان و دانیشتنیان بوو کۆمەڵە ئافرەتێکی لێبوو کە قاچ و سنگیان ڕووت بوو باوکم بە چاوو و قژ و لەش و لاریانی هەڵئەدا .. دایکم ئافرەتێکی بەستەزمان بوو بە ناچاری خواردنی ئەو دەعوەتانەی ساز ئەکرد کە باوکم بۆ مەبەستی خۆی ئەیکرد .. لەو کۆمەڵە ئافرەتەی کە هاتبوون یەکێکیان سەرنجی باوکمی زۆر بۆلای خۆی ڕائەکێشا بەلاکردنەوەوعیشوەوناز .. من زۆر سەرنجم ئەدا و ئاگام لێبوو بەلام دایکم لە مەتبەخ هەر خەریك خواردن ئامادەکرن بوو بۆ میوانەکان .. ئەو کۆڕوکەیف و سەفانە لەناکاو نەما !! زۆر هەوڵمدا بەو تەمەن منداڵیەوە ڕاڤەو تەفسیری ئەو وەزعە بکەم بەلام نەم ئەتوانی ... ئێستا ئەزانم ئەو کاتە دایکم چەند بەستەزمان بوو توشی خەم و پەژارەیەکی زۆر هاتبوو . تاقەتی گوێبیستی قسەکانی باوکمی نەبوو . من گوێم لە هەندێ قسەی شاراوە ئەبوو ئەیان چرپان بەگوێی یەکا وەکوو : ( ناپاکی . ژووری نوستن . بەچاو خۆم بینیم . لە ژێرەوە ، حاڵی زۆر خراپ بوو .... ) چەند قسەیەکی تریش تەنها گەورەکان خۆیان ئەیانزانی چی ئەڵێن ... ئێستا گەورەبووم ئەزانم دنیا چی یە ؟؟! ڕقم لە هەموو پیاوێك ئەبێتەوە . هەموویان ناپاکن ، دایکم ئافرەتێکی تێك شکاو بوو . ئەوەی بەسەرمان هات هەمووی خراپەکاری پیاو بوو .. هەمووی بەهۆی باوکمەوە بوو.. تەنها باوکم ؟؟ !! ئەو!! بەڵێ ئەو !! تاکوو ئێستاش مومارەسەی هیواو حەزەکانی خۆی ئەکا لەگەڵ ئافرەتان بەلام لە دەرەوەی ماڵ ... من ئێستا تەمەنم (١٩) نۆزدە ساڵە شارەزاییەکی باشم لە گەنجان هەیە . هەست بەخۆشیەکی زۆر ئەکەم تۆڵەیان لێ ئەکەمەوە ئەڵێی یەکێکم وەك باوکم . زۆر لە خشتەیان ئەبەم و نیغرایان ئەکەم بەبێ

ئەوەی دەست لە تالێکی بڕچم بدەن .... لە شوێنە گشتیەکان و بازاڕکان زۆر سەرنجیانم ڕائەکێشا بەهۆی عیشوە و نازدوە کە خۆم مەبەستم بوو ... تەلەفۆنم زۆر بۆ ئەهات زۆربەی جار قسەم نە ئەکرد بە فەخروشانازییم ئەزانی ئەوەی ئەمکرد تۆڵەی ژنانم ئەکردەوە بەتایبەتی ( حواو ) ی دایکم ، بەڵام هەندێ جار هەست بە ناخۆشی و نارەحەتی ئەکەم .. ئەگاتە ئەو ڕادەیەی خۆم بخنکێنم !! ژیان ئەڵێی پارچە هەورێکی ڕەش و تاریك بەسەرمەوەدیە ناوی ( باوکە ) !!!

## بەرلەوەی پەشیمانی داد ئەدات

### کچێك ئەزمونەکانی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

هەرگیز باوەڕم نەدەکرد هەڵو مەرجی کارکردنم وام لێبکات تاوەکو تێکەڵ بەرەگەزی بەرامبەر (پیاوان) ببمەوە. بەڵام ئەمە ڕویداوە. منیش لەسەرتاوە بەهۆی پەچەوە(نیقاب) خۆم لەچاوی پیاوان دەپاراست. بەڵام هەندێ لەخوشکانی هاوڕێم جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەم شێوازە جل پۆشینە زیاتر سەرنجی پیاوان ڕادەکێشێت. بەتایبەتی داوایان دەکرد پەچەکەم لابەم، بەتایبەتی چاوەکانم بڕێك تایبەتمەندی تێدابووو، ئەوەم لادروست ببو کەلادانی پەچەکەم بۆم باشترە. جا پەچەکەم لادا.

بەڵام پاش تێپەڕبونی ماوەیەك بینیم کەمن لەنێو هاوڕێکانم بەهۆی سیفەتی گۆشەگیری و تێکەڵاونەبونو گاڵتەوگەپ نەکردن لەگەڵیاندا جیاوازو دیارم. ئەوانیش دووره پەرێزیان دەکرد لەو ئافرەتەی کەترسناكو گۆشەگیرە — هەڵبەت لەچاوی ئەواندا — ئەمە یەکێك لەو هاوڕێیانە پێی ووتم کە حەز بەتێکەڵاوبوونو هاوڕێیەتی ناکات. لەگەڵ کەسێکی خۆبەزل زانو لوت بەرز. بەڵام بەپێچەوانەی ئەم وتەیەوە لەڕاستیدا من کەسێکی ئاوها نەبووم. ئەمەش وای لێکردم بڕیاری ئەوەبدەم کەجیدی ستەم لەخۆم نەکەمو لەو چوارچێوەچەق بەستووەدا خۆم ڕزگار بکەم، لەدەمەتەقێو هەڵسوکەوتەکانمدا بەشدارییان لەگەڵدا بکەم. بەمەش ئەوانیتر بۆیان ئاشکرابوو کەمن خاوەنی هێزێکی قسەزانی بەرزمو توانای کاریگەریم هەیە بەسەر نزیکەکانمدا. کەدەیان بینی من بەشێوەیەکی زۆر جدیانەو لەهەمان کاتدا سەرنجڕاکێش لەگەڵ هاوڕێکانم دەدوام. ئەمەیش زۆری ئەخایاند کە سەرنجم دەدا قسەکانم ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر بەرپرسی شوێنی کارەکەم دروستکردووەو بەشێوەیەك لەشێوەکان هەستم دەکرد مەبەستی خراپی هەیە سەرەڕای ئەوە بەهەندێ لەقسەکان دەشڵەژاو زەرد هەڵدەگەڕا، لەهەمان کاتدا

بەهەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا خۆی تێوە گلێنێ لەباس و ووتەکانمدا، منیش هەستم بە سەرنجە پیس و ژەهراوییەکانی دەکرد، نکۆڵی لەوەش ناکەم ئەو پیاوە بەشێوەیەك لەشێوەکاندا بیری منی سەرقاڵ کردبوو. بیرم لەوەش دەکردەوە ئەگەر بەم شێوە ترسناکە پیاوێك گیرۆدەی ئافرەتێکی باوەڕدار ببێت ئەبێ حاڵی ئەو پیاوە چۆن بێت بەرامبەر بەئافرەتێکی سفور کەبانگی بکات بۆ کردەوەی لاروەوێر.

لەڕاستیشدا بەشێوەیەکی ناشەرعیانە بیرم لەوپیاوە نەدەکردەوە بەڵام نکۆڵی لەوەناکەم بۆماوەیەکی درێژ پانتاییەکی بیرمی داگیرکردبوو. بەڵام ڕێگەم لەنەفسی خۆم گرت و قبوڵم نەکرد ببمە ئامرازی ڕابواردنی ئەم پیاوە ناموٚیە. تەنانەت ببمە ئامرازی ڕابواردنی مەعنەوی بۆی. هەوڵم دا بەهەموو شێوەیەك ڕێگە لەوەبگرم کەکاردەکەم وام لێبکات لەخەڵوەتدا لەگەڵی بدوێم و لەکۆتایشدا ئەم سودانەم دەست کەوت کەبریتین لە:

١/ سەرنج ڕاکێشان لەکاتی تێکەڵاوبونی هەردوو ڕەگەزدا لەلایەن پیاوو ژنانەوە ڕوودەدا هەرچەندە پیاوو ئافرەتیش نینکاری ئەوەبکەن و سەرنج ڕاکێشان لەسەرەتاوە شەرعیانە دەست پێدەکات و لەکۆتاییدا بەکردەوەیەکی ناشەرعیانە دوایی پێدێت.

٢/ تەنانەت ئەگەر مرۆڤ هەرچەندە خۆی بپارێزێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابێت لەفرت و فێڵەکانی شەیتان.

٣/ تەنانەت ئەگەر مرۆڤ لەکاتی هەڵس وکەوت لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا هەواو ئارەزووەکانی خۆی کۆت و زنجیر بکات ناتوانێ ڕێگە لەهەست و سۆزی لایەنی بەرامبەر بگرێت .

٤/ لەکۆتایشدا دەبێ بڵێم تێکەڵاوبوونی دووڕەگەزەکە بەوشێوەیەی ئێستا هەیە بەهیچ شێوەیەك خێری تێدانییەو هەرگیز بەروبومی باشی نابێت. بەڵکو ڕێگە دەگرێت لەبیرکردنەوە بەڕێگەیەکی ڕاست و دروست.

کاتی ئەوە هاتووە دان بەوەدا بنێین تێکەڵاوبونی دووڕەگەزەکەو ئالودەبوون پێوەی هەرچەندە بەسوکی بزانین بەڵام زیانەکانی لەگەڵماندایە. خێزان و بنەماڵەکانمان هەڵدەوەشێنێت و ویژدانی بەئاگاو پاکیش بەوە ڕازی نییە کەتێکەڵاوبوون بارێکی تەندروستی کۆمەڵایەتی بێت. ئەم ویژدانە پاکەش پاڵی ناوە بەزۆربەی ئەوانەی لەبواری تێکەڵاویدا کاردەکەن دوور بکەونەوە لەتێکەڵاوبوون. وەدەڵێن: تێکەڵاوبوون لەڕووی شەرعەوە پەسەند نییە، دەبێ ئەوەش بڵێین کەڕێژەیەکی کەمیش هەن کەتێکەڵاوبوون بەشەرعی دەزانن. ئەم کۆمەڵە دەبێ هیچ سنورێك تێکەڵاوبوون بەپەسەند دەزانن. بەڵام بەپێی مەرجە ئاینیی و کۆمەڵایەتی و بەهاو ویژدان و

بەمەرجی خۆداپۆشین و خۆپارێزی و زنجیرەیەك بەهای باڵاو جوان کەبەلای ئەوانەوە ئەمە سنوری تێکەڵاوبوونەکە دادەنێ.

پرسیاریان لێدەکەین: ئایا ئەو تێکەڵابونەی ئەمڕۆ لەزانکۆو بازاڕو شوێنی کاردەکان و کۆڕو خێزان و کۆمەڵگاکانمان دەبینرێ هیچ یەك لەدومەرجانەی سەرەوەی تێدایە کەباسمان کرد ؟ یان ئەم شوێنانە پڕن لەسنورشکێنی لەڕووی جل وبەرگ و هەڵس و کەوت و قسەو باسەکان و دەورو بەرمان پڕە لەبێڕەوشتی و بێویژدانی و ڕووتی و پەیوەندییە پڕلەفیتنەو گومانەکان، ئەمەش وامان لێدەکات بڵێین: تێکەڵاوبون بەم جۆرەی ئێستا هەیە تەنانەت لای ئەوانەی کەتێکەڵاوبونیان لەبارودۆخە پاکەکان دا پێدروستە،بەم جۆرە تێکەڵاوییەی ئێستا ڕازی نین.

ئەوەش ماوە بڵێین: تێکەلاوبوون ئەو کەش و هەواو پاڵنەرمیە کەبەزەوییەکی شێدار دەچێت تیایدا مشەخۆرو کەڕووە زەهراوییە کۆمەڵایەتییەکان لەگۆشەو کەنارو سەقفیدا گەشە دەکەن و زۆر دەبن و خۆیان ئەتەنن بەبێ ئەوەی کەس هەست بەوە بکات کەتێکەڵابوون هۆکارکەیەو تێکەڵاوبون سەرچاوەی ئاژاوەیەکی بێدەنگ و لەسێبەریدا دڵ و حەزو ئارەزووەکان گومڕادەبن و ناپاکی ڕوودەدات و دڵ و ماڵەکان تێك دەشکێنێ.

داواکارین لەخوای گەورە ساغ و سەلامەتی و پارێزراویمان پێببەخشێ، وەدرودو سەڵاو لەسەر گیانی پیێغەمبەری ئازیزمان

**کچێکی هەڵاتوو بەرەو نادیار**

کچکە دەستی بەقسە کردن کرد، دەتگوت بوارێکی دۆزیوەتەوە تاوەکو لەو ڕێگەیەوە داخی دڵی خۆی بڕێژێ و خەم و خەفەتە شاراوەکانی دەربڕێ، ئەوەبوو ووتی:

باوکم دایکمی مارە کردو بوونە خاوەن دوومناڵ، من و براکەم، پەیوەندییان زۆری نەخایاند لەیەکتری جیابونەوە، پاش دەمەقاڵەو شەڕوشۆڕی چەند ساڵێك، ئەوکاتە من مناڵ بووم و لەهیچ شتێ تێنەدەگەیشتم، بەڵام سێبەری ناکۆکییەکان هێشتا بەدوامدا دێت و دەنگی دەمەقاڵەکان لەگوێم دا دەزرنگێتەوە.

پاش جیابونەوەیان باوکم ڕاستەوخۆ کچێکی مارە کردو پاش ماوەیەکی کورتیش دایکم شویکرد، لەمێردە تازەکەشی مناڵی بوو، من و براکەشم پاش شوکردنی دایکم گەڕاینەوە لای باوکم تاکو ئەو بەخێومان بکات.

کەچوومە ماڵی باوکم هەروەکو بێگانەیەکی قێزەون لەلایەن باوەژنەکەمەوە سەیر دەکرام، هەرگیز هەستم بەوە نەدەکرد ئەوە ماڵی خۆمە. من تەنها لەوماڵەدا لەیەکەم ڕۆژەوە وەکو خزمەتکاریان

بووم، چێشتم لێدەناو جلم دەشوشتو چاودێری منداڵنم دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا خۆم هێشتا منداڵ بووم.

خواردنم جیاوازو بەدوور لەوان بوو، ئەگەر لەئامادەکردنی ژەمە خواردنێك دوابکەوتمایە لەلایەن باوکم بەسەختترینو توندترین ئامراز سزادەدرام، هەروەك خزمەتکارێکی ماڵ گەورەبووم، بەناچاری دەبوایە خۆم فێری چێشت لێنان بکردایەو سفرەم ئامادە بکردایە، نەمدەتوانی بچمە خوێندنگا، تەنها خزمەتکارێك بوومو خوێندنیش لەپیشە سەرەکی‌یەکەم کە چێشت لێنان بوو دووری دەخستمەوە.

فرمێسکەکانی سڕیەوەو درێژەی بەووتەکانی دا: ئەگەر لەلای دایکم بومایە دەمتوانی بەرەنگاری هەندێ لەکێشەکانم ببمەوەو بچمە خوێندنگا، هەروەکو کچانی‌تر، بەڵام بەوبارودۆخەی باوەژنەکەمو دڵ ڕەقیەی خوێندن مەحاڵ بوو.

ئەو دەیشکاندمو گاڵتەی پێدەکردم، تەنها لەبەرئەوەی کەمێك ڕەش ئەسمەر بووم، بەڵام منداڵانی خۆی پێستیان سپی‌بوو، باوکیشم لەبەر پێست ڕەشی‌یەکەم گاڵتەی پێدەکردم، بەڵام ئیتر نەمدەتوانی لەمەزیاتر ئەوشتانە قبوڵ بکەم، شەوێك لەشەوان بیرم لەهەڵاتن لەماڵەوە کردەوە، پاش ئەوەی کەسەرجەم هەوڵەکانم شکستی هێنا کەوەك ئەندامێکی ئەو خێزانە بژیم، ژیانم لەوە باشتر دەبێت کەئێستاکە تیام، بیرم لەوە دەکردەوە جیرانێکمان ژنێکی تەڵاق دراوەو تەمەنی لەهەژدە ساڵان تێناپەڕیو لەپیاوە پێشووەکەی منداڵێکی بچوکی هەبوو، پلانم داڕشتو جێبەجێشم کرد.

پەنام پێبردو داوای یارمەتیم لێکرد، ئەویش بەوپەڕی خۆشحاڵی‌یەوە پێشوازی لێکردمو یارمەتی دام، منیش بەنیسبەت ئەوەوە دڵخۆشی‌یەك بووم، چونکە ئەویش پاش جیابونەوەی لەمێردەکەی هەستی بەتەنهایی دەکرد، یارمەتیشم دەدا لەپەروەردەکردنی منداڵەکەی، چونکە ئەو هێشتا درێژەی بەخوێندنی ئێوارانی دەدا، دووبارە بوومەوە بەخزمەتکار بەڵام ئەمجارە بەخواستی خۆم.

ڕۆژانە لەگەڵ جیرانو هاوڕێکەم دەچوینە بەقاڵی تەنیشتمانەوە بەرلەوەی بچێت بۆخوێندنگاو منیش منداڵە تاقانەکەم بۆهەڵدەگرت.

لەتەنیشت بەقاڵەکەش کۆمەڵێك گەنج کۆدەبونەوە، هاوڕێکەشم بەتێپەڕبوون بەوێدا ڕایدەبوارد، دەیروانی‌یە ئەوەی خۆشی دەویست، داوای لەمنیش کرد وەکو خۆی بکەم. منیش بەردەوام ڕەفزم دەکرد.

ڕۆژێك منالّی هاوڕێکەم دەگریاو دایکیشی لەخوێندنگای ئێواران نبوو، هەڵم گرت بەرەو بەقاڵیەکە چووم. لەوێدا یەکێ لەگەنجەکان هەوڵیدا بم وەستێنێو پرسیاری دەکرد لەهۆی غەمباریو بێزاریم. وەڵامم نەدایەوەو لەڕۆیشتندا بەردەوام بووم.

ئەوگەنجە بەردەوام کەمنی لەگەڵ هاوڕێکەم دەبینی پرسیارەکانی دووبارە دەکردەوە، هاوڕێکەشم داوای لێدەکردم وەڵامی بدەمەوە. تاوەکو جارێکیان بەهەندێك ووتەی خێراو پڕلەپاڕانەوە داوای لێم کرد وەڵامی بدەمەوە. چونکە مەبەستی تەنها ناسینمەو بەس نیازی باشی هەیە لەوپرسیارانەدا.

منیش ڕووم لێکردو خۆم ئامادەکرد بۆبیستنی ووتەکانی. لەنێو وتەکانی هەستم بەمیهرەبانیو سوزی وون بووم کرد. گلەیی دەکرد لەدلەدەست دانی دایکیو باوکیو دوورکەوتنی لەسۆزو میهرەبانیان لەسەردەمی شیرەخۆریدا هەستم کرد ئێمە بۆیەك دەبین چونکە ئەویش هەرهەمان کێشەکانی منی هەبوو.

پەیوەندیەکانمان بەردەوام قوڵ بونەوە دەچوو. پێکەنینەکانم شکۆفەی دەکردو ژیانم بەشێوەیەکی جوان دەبینی. پەیوەندیم لەگەڵیدا بەردەوام بوو. دەرچونمان پێکەوە ڕۆژانە شتێکی ئاسایی بوو، ڕۆژێکیان مێردە پێشووەکەی هاوڕێکەمم بینی، کەدەیویست منالەکەی لێبسێنێت، دەمەقاڵەیان گەرم بوو. خەریك بوو چەقۆیەك لەهاوڕێکەم بدات. منیش بەمەبەستی ناوبژیوانی چوومە نێوانیان. ئەوەبوو چەقۆیەك بەرانم کەوتو بەسەختی بریندارى کردم، برینەکەم چارەسەر کردو لەڕۆژی دوای ئەوڕۆژەدا ویستم مالّی هاوڕێکەم بەجێ بهێلم.جگە لەمالّی هاوڕێ کوڕدکەشم هیچ شوێنێکی ترم شك نەدەبرد. ئەویش بەتەنها دەژیا.

چوومە لای. بەڵام ئەم چونە لەناکاوەی من بۆهاوڕێکەم شتێکی ئاسایی نەبوو. داوای لێم کرد بگەڕێمەوە. پاش بەستنی پەیمانی هاوسەرێتی بەشێوەیەکی شەرعی لای بمێنم. بەڵام من جەختم لەوە کردەوە کەلای بمێنم. پاش پێداگری من. داواکاریەکەی پەسەند کردو پێنج مانگ لەگەڵی بووم. پەیوەندیمان پێکەوە وەکو پەیوەندی نێوان ژنو مێردەکەی وابوو، پاش ئەوەی بەتەواوەتی لەهەستو سۆزی هەردولا دڵنیا بوینو ڕێکەوتین لەسەر دەست پێکردنەوەی ژیانی هاوسەریەتی بەشێوەیەکی شەرعیو یاسایی. هاوڕێکەم داوای لێکردم بگەڕێمەوە لای خێزانەکەم، تاکو بێتو داخوازیم بکات. لەگەڕانەوەم بۆماڵ دودڵ بووم. چونکە من بەهۆی خراپی باوەژنەکەم لەماڵەوە هەڵاتبووم. گەڕانەوەشم سەرلەنوێ تووشی سزاو لۆمەی دەکردم. بەدووریشم نەدەزانی باوکم لەتاو توڕەیا بمکوژێ.

بەڵام گەڕامەوەو خۆم ئامادەی وەرگرتنی سزای باوکم کرد، تەنها لەپێناو ئەوەی لەگەڵ خۆشەویستەکەمدا بژیم، بەهەمان شێوە کەبیرم لێدەکرد ڕوویدا، پێشوازیەکی زۆر توندو ناشرین کرام لەلایەن خێزانەکەمەوە، کەپڕبوو لەلۆمەو سەرزەنشت، پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك‌و دامرکانەوەی توڕەیی باوکم پێم ووت: لاوێك دەیەوێت بێتە خوازبێنیم، باوکم بەتوندی ڕەتی‌کردەوە، بەبێ ئەوەی هەست بەپەیوەست بوونی من بکات بەوگەنجەوە، هەرچەندە هەوڵم دا سوودی نەبوو وەوەڵامی هەر نەخێربوو، دڵی وەکو بەردی ڕەقی لێهاتبوو وە هیچ نەرمی‌یەکی تێدا بەدی نەدەکرا.

دەسەڵاتی یەکەم لەماڵەوە باوەژنەکەم بوو، قسەش قسەی ئەوبوو، بڕیارم دا سەرلەنوێ ماڵەوە بەجێ بهێڵم، بەڵام ئەمجارەیان هەڵاتنی یەکجارەکی بێ گەڕانەوە، شمەکەکانم کۆکردەوەو بەرەو ماڵی خۆشەویستەکەم کەوتمەڕێ، داوای لێکردم کەیەکێ لەبنەماڵەکەم بدۆزمەوە تاوەکو بۆبەرپابوونی مەراسیمی مارەبڕین یارمەتیمان بدات، ڕووم لەهەموو کەسێك کردو بۆ داوای یارمەتی، بەڵام دڵێکی نەرمم نەدۆزیەوە یارمەتیم بدات، داوای لێکردم بەشێوەیەکی عورفی ببینە ژن‌و مێرد، نەمدەزانی عورفی یانی‌چی، بەڵام قبوڵم کرد، بەهەرحاڵ ئێمە هەرلەحەرامدا بووین، هاوسەریمان دەستی پێکرد.

ئەمەش زیاتر لەچەند ڕۆژێکی نەخایاندو لەسەر شکایەتی باوکم بەتۆمەتی هەڵاتن لەماڵەوە دەستگیر کرام، پاش لێکۆڵینەوە بەزینا تۆمەتبار کرام، کێشەکەم بوو بودووکێشە، زیناو هەڵاتن لەماڵەوە، بۆیەکەمین جار زیندانی کرام، لەوماوەیەدا کەلەزیندانندا بووم زۆر هەوڵم دا بەشێوەیەکی یاسایی لەلایەن خۆشەویستەکەمەوە مارە ببڕێم، بەڵام بەهۆی کەمی تەمەنم نەدەکرا.

بەڵام ئێستا وانی‌یە، ئەوکاتە شانزە ساڵان بووم، ماوەی حوکمەکەم لەزینداندا بەسەربردو پاشان ئازاد کرام، بەڵام باوکم نەهاتەوە بۆوەرگرتنەوەم پاش ئازادبونم، منیش گەڕامەوە بۆلای هاوڕێ تەلاق دراوەکەم وەکو جارانی پێشووتر، تەلەفۆنم بۆ خۆشەویستەکەم کردو داوام لێکرد بگەڕێتەوە لام‌و بەهەرشێوەیك بووە ماردم ببڕێت، بەلکو کەمێك لەخەم‌و ئازاردکانم بەیارمەتی ئەو بسڕدرێتەوەو بتوانم درێژە بەژیانی ئاسایی خۆم بدەم. بەڵام داوای لێکردم کەنزیکی نەبمەوە، چونکە مارەبڕینی منی بەمەحاڵ دەزانی.

هاوڕێ ئافرەتەکەشم چونە زیندانمی بەهەل زانی‌و کەبینی خاوەن دۆسیەکەم زیاتر لەجاران هەوڵی ئیستغلال کردنی دەداو دەیزانی جگە لەوشوێنە شوێنی حەوانەوە شك نابەم، بۆیە داوای هەرشتێکی بکردایە بەناچاری جێبەجێم دەکرد.

ئامۆژگاری گشت کچان دەکەم، پەلەنەکەن لەوەرگرتنی هیچ بریاریکدا، پەنابەرن بۆکەسانی دلسۆزو بەئەزموون، تاوەکو یارمەتیتان بدەن، ئەگەر کەسیکی واش لەبنەمالەکەتان نەبوو برۆنە لای رینیشاندەریکی دلسۆز لەقوتابخانە یان مزگەوتەکان. بەردەوام دووربن لەوریگەیەی من گرتمەبەر ، بەردەوام لەگەڵ خیزانەکانتان بن.

## خۆپاراستن لەچارەسەرکردن باشترە

ماوەیەك بوو ئەو ژنەم دەبینیو کۆمەلیك نیشانەی سەیر بەسەر روخساریەوە دیاربوو، ئەویەکێ لەنزیکەکانم بوو، ئەمویست پرسیاری لیبکەم، بەلام بەردەوام دوام دەخست تاوەکو رۆژیك بەپەریشانیو ترسەوە هاتە لام، ئارامم کردو پرسیارم لیکرد چیبووە؟ پیی ووتم: دەیەویت سەبارەت بەشتیك قسەم لەگەلدابکات، داوایکرد ئەمانەت بیت، داواشی لیم کرد بابەتەکە بەنهینی لەلام بمینیت، منیش لەوە دلنیام کرد، هیچ خیزانیکیش بەبێ کۆمەلیك نهینی نییە، لەسەرەتادا نەیدەتوانی بابەتەکە بدرکینێ، پی م ووت: بۆ شەرم دەکەیت؟ وەها بدوێ وابزانە لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت، ووتەکانیشت لای من هیچ بچوکت ناکاتەوە، پەیوەندیشم لەگەلتا تیك نادات، پیی ووتم: کچەکەی خۆی کەتەمەنی چواردە ساڵان دەبیت لەگەڵ کچە پورەکەیدا بینیوە بەشیوەیەکی ناشایستە.

# خۆپاراستن لەچارەسەرکردن باشترە

ماوەیەك بوو ئەو ژنەم دەبینیی و کۆمەڵێك نیشانەی سەیر بەسەر ڕوخساریەوە دیاربوو، ئەویەکێ لەنزیکەکانم بوو، ئەمویست پرسیاری لێبکەم، بەڵام بەردەوام دوام دەخست تاوەکو ڕۆژێك بەپەرێشانیی و ترسەوە هاتە لام، ئارامم کردو پرسیارم لێکرد چیبووە؟ پێی ووتم: دەیەوێت سەبارەت بەشتێك قسەم لەگەڵدابکات، داوایکرد ئەمانەت بێت، داواشی لێم کرد بابەتەکە بەنهێنی لەلام بمێنێت، منیش لەوە دڵنیام کرد، هیچ خێزانێکیش بەبێ کۆمەڵێك نهێنی نییە، لەسەرەتادا نەیدەتوانی بابەتەکە بدرکێنێ، پێم ووت: بۆ شەرم دەکەیت؟ وەها بدوێ وابزانە لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت، ووتەکانیشت لای من هیچ بچوکت ناکاتەوە، پەیوەندیشم لەگەڵتا تێك نادات، پێی ووتم: کچەکەی خۆی کەتەمەنی چواردە ساڵان دەبێت لەگەڵ کچە پورەکەیدا بینیوە بەشێوەیەکی ناشایستە.

بەبێ ئەوەی کۆتایی بەووتەکانی بهێنێت لەگشت ڕووداوەکە تێگەیشتم، چاوانی پڕبوو لەفرمێسك، ئەمەش تاکەحاڵەتێك لەم شێوەیە نییە، بەڵکو ئەم بەڵایە لەکۆمەڵگادا بڵاوبۆتەوە، هەروەکو بڵاوبونەوەی شێرپەنجە لەلەشدا، لەشەرما ڕووی وەردەگێڕا تاوەکو نەیبینم، منیش نەمدەویست لەمەزیاتر ببینم، بەڕاستی ئابڕوچون مەترسیدارەو زایەبوونی نەوەدیەکیش برینێکی قوڵ و سارێژ نەبووە، دەستیکرد بەلۆمەو سەرزەنشت کردنی کوڕوکچەکانی ئەم سەردەمەو ووتی: کێشەکانیان لەبن نایە، جیرانەکەی پێی وتووە: خزمێکیان پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ هاوڕێیەکی هەبووە، خوشکەکەی پێیی وتووە کچی هاوڕێکەی لەلایەن شۆفێرەکەی دەست درێژی کراوەتەسەر، کچی ناسیاوێکیان لەلایەن براکەی کەتەمەنی حەڤدەساڵان دەبێت دەست درێژی کراوتەسەر، پاشانیش دەستی کرد بەلۆمەی هاوڕێی خراپ و هەرزەکاران.

پێم ووت: لۆمەی سەردەم و هەرزەکارو هاوڕێ و کچ وکوڕ مەکە، ئەبێ تەنها لۆمەی خۆمان بکەین لەوەیبەسەرماندادا دێت، خوای گەورەو پایەبەرز دەفەرموێت:( ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) (الروم:٤١) .

پێی ووتم: چیکەم و کوڕیەکیان هەیە، جل و خواردن و دەرچونیان بۆپیاسە دابین کراوە، پێم ووت: هەڵەکە لێرەدایە. وادەزانین منداڵەکانمان تەنها پێویستیان بە خواردن و ڕابواردنە لەسەیرانگاو یانەکان، بێئاگاشین لەگرنگترین کاروباریان، کەئەویش پەروەردە کردنیانە، تەلەفزیۆن و سەتەلایتەکان پەروەردەکردنی گەنجەکانیان قۆرخ کردووەو بێبەشن لەچاودێری

کەس‌وکاریان، لەسەرمان پێویستە بەهاو ڕەوشتە بەرزەکان لەناخی منداڵەکانمان بڕوێنین، هەروەها بیرو هۆشیان بنیات بنێین.

پێم ووت: بیرت دێت ئەو ڕۆژەی سەبارەت بەجل‌وبەرگی کچەکەت کەبەلای تۆوە تەمەنی سێ‌ساڵانەو ئاسایی‌یە ئامۆژگاریم کردی لاقەکانی بەدەردەوەبوون ئەگەر دەستی بجوڵانایە پشت‌و وورگی دەردەکەوتن، ئەگەر دەستی هەڵبڕیایە ژێر هەنگڵی بەدیار دەکەوت، ئەگەر دابنیشتایە یان یاری بکردایە ڕانی ئاشکرا دەبوو، پاشان کچەکەت بووە نۆساڵان جلی تەسکی وەهای لەبەردەکرد کەگشت لەشی بەدەردەکەوت، کەمنیش ووتم ئەمانە پەسند نی‌یە، داتە پرمەی پێکەنین‌و پشت گوێت خست !

پێی ووتم: ئەمە چی پەیوەندی‌یەکی بەوباتەوە هەیە ؟

پێم ووت: قۆناغی هەرزەکاری قۆناغێکە لەقۆناغەکانی تەمەن‌و چلەپۆپەی تەمەنی پەروەردەکردنی منداڵە، ئێستا ئەزانی چی پەیوەندی‌یەکی هەیە .. ؟ کچ‌و کوڕی هەرزەکار لەدەستی ئێمەدان، ئێمە کاریگەریمان هەیە بەسەریانەوەو نەخشەی ڕێگەیان بۆدەکێشین، بەلام بزانین هەرزەکاری لای یاران‌و تابعین‌و پێشینان چۆنە ؟

ئەوەتا سەعدی کوڕی موعاذ ئەوەی عەرشی خودا لەکاتی مردنیدا دەلەرزی‌و فریشتەکان لاشەکەیان بەڕێکرد، تەمەنی لەوسەردەمەدا ٣٧ساڵان بوو، موعاذی کوڕی جەبەل (ر.ض) قورئان خوێن‌و پێش نوێژ(ئیمام)ی مزگەوتی مەدینەی پیرۆز بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا(د.خ) کۆچی‌کرد تەمەنی ١٧ساڵان بوو، هەروەها ئوسامەی کوڕی زەید کاتێ سەرکردەی سوپای مسوڵمانان بوو تەمەنی ١٧ ساڵان بوو، ئەگەر خودی هەرزەکاری گرفت بوایە بۆلەم تەمەنە کاریان پێئەسپێردرا؟

هەرزەکاری پێگەیشتنە، پێگەیشتنیش سەرەتای کاری مرۆڤە، ڕێنمونی کردنیش بۆ ئەم کارە لەلایەن باوك‌و دایکەوە دەبێت، بەلام لە(سەعدی تۆستری) گێڕدراوەتەوە کەلەسێ‌ساڵیدا شەونوێژی کردووە، شەوانە خاڵۆی هەڵدەساندو ئەویش پەیڕەوی دەکرد، پاشانیش قورئانی لەبەرکرد، لەکاتێکدا شەش حەوت ساڵان بوو.

پێشەوا شافیعی قورئانی لەبەرکردووە لەتەمەنی حەوت ساڵان، هەموو (**الموطأ**)ی لەبەرکردووە لەتەمەنی دەساڵاندا، بەلام کێ ڕێنمونی کردووە بۆڕێگای زانست‌و زانیاری؟ دایکە باوەڕدارەکەی.

لەم سەردەمانەشدا نمونەی زۆر دەبینرێ، ئەگەر لەمناڵی‌دا ڕێگە بەمناڵەکەت پێشان بدەی ئەنجامەکەی دەبینی بەیارمەتی خودا، تۆبەتەنها مافی ئەوەت نی‌یە منالەکەت بەشێوەیەکی باش یاخراپ پەروەردەبکەیت، بەلکو دایك‌وباوك لەپلەی یەکەمدا بەرپرسن لەپەروەردەکردنی

بەئابروویی‌یە لەقۆناغی گەورەیی‌و ئابرو ئەوپەری خێرو خۆشی‌یە، بەئابروویش ڕێگەی پێشینەیە بۆپاکداوینی.

ئەو ڕەوشتە بەرزە ئیمانی‌یەی کە نەفس پێی ئاسودە دەبێت، ئەوەشە وا لەنەفس دەکات کەریگربێت لەزالبونی حەزو ئارەزووەکاندا، ئەوگەنجەی سەیری خوشکە نیوەڕوتەکەی خۆی دەکات چۆن فێری چاوگرتن دەبێت لەحەرام.

باوەرم وایە ئەمە خالیکی مەترسیدارە لەتەشەنەکردنی بێڕەوشتی‌یەکان، یان تووش بوونیان تەنانەت بیرکردنەوە لەوبارەیەدا، ئەوکچە لاوەی کەجل‌وبەرگی نیوەڕوتی لەبەردایە چۆن فێری ئابروپاریزی دەکەیت لەبەردەم فتنەی پیاوان‌و ژنان‌و بیرکردنەوە لەبێڕەوشتی‌و بەدوادا گەرانی‌دا.

تەنانەت ئیمە بەبێ گویدان لەکۆرە خیزانی‌یەکانمان دادەنیشین‌و سەیری تەلەفزیۆن دەکەین‌و دیمەنی وەها دیتە پیش چاومان موچورکە بەلەشماندا دەهینیت، ئەویش لەبەردەم کوروکچەکانمان لەگشت قۆناغەکانی تەمەن، ئیدی چاوەروانی چی لەمنالەکانمان بکەین؟

ئایا وادەزانین ئەوان پاریزگارو پاک‌و بی‌گەرد دەبن لەکاتیکدا ریگەی راستیان پیشان نەدەین؟ لەخواترسی‌و پاریزگاریش لەگرنگترین هۆکارەکانی لیپرسینەوەی نەفس‌و چاودیری خواین؟ کۆلنەدان‌و پشوو دریژیش لەگرنگترین هۆکارەکانی بیرکردنەوەمن لەکارە بەرزو بایەخ دارەکان‌و بیرنەکردنەوە لەکارو کردەوەی هیچ‌و بێسوود.

جل‌وبەرگی رووت‌و تەسک‌و تەنک ئارەزووە سیکسی‌یەکان لەکاتی ناوەختدا دەوورووژینن، تەنانەت ئەگەر لەنیو کەس‌و کارو ژنان‌و منالانی پینەگەیشتووش بیت، چونکە گەورە دەبن‌و ئەو دیمەنانەیان لەیاد ناچیت کەلەمنالی بینیویانە، ئەمە لەمیدیاکانی بینراوو بیستراویش ئەم کردەوەیە زیاتر برەوی پیدەدەن‌و ئاگر لەپوش بەردەدەن، پیشگری لەهۆکارەکانی خراپەو بێڕەوشتی ئاسانترە لەچارەسەرەکەی. چارەسەریش سودی دەبیت یان نا؟ بەلام پیشگری خۆپاریزی‌یەکە هەرکەسێ سنورەکانی خواپپاریزیت خوا دەیپاریزیت، یارمەتی‌ت دەدات لەکیشەکەت‌و چارەسەرەکەیت پیشکەش دەکات.

سەرەتای چارەسەرکردن هەست کردنە بەهەلەکان، چونکە بەبێ دەست نیشان کردن ناتوانی چارەسەری بکەیت، پاشانیش پیویستت بەپشتگیری کردنەو پشتگیری کردنیش بەم شیوەیە دەبیت:

- وازهینان لە بەکارهینانی وورووژینەرە بینراوو بیستراوەکان.
- دوورکەوتنەوە لەجل‌و بەرگی تەسک‌و تەنک‌و ناشەرعی.
- پاراستنی چاو لەروانینی حەرام، چونکە بەرەللا کردنی چاو ئەنجامی خراپی دەبیت.

کردەوەیە زیاتر برەوی پێدەدەن و ئاگر لەپوش بەردەدەن، پێشگری لەهۆکارەکانی خراپەو بێڕەوشتی ئاسانترە لەچارەسەرەکەی. چارەسەریش سودی دەبێت یان نا؟ بەلام پێشگری خۆپارێزییەکە هەرکەسێ سنورەکانی خوابپارێزێت خوا دەیپارێزێت، یارمەتیت دەدات لەکێشەکەت و چارەسەرەکەیت پێشکەش دەکات.

سەرەتای چارەسەرکردن هەست کردنە بەهەڵەکان، چونکە بەبێ دەست نیشان کردن ناتوانی چارەسەری بکەیت، پاشانیش پێویستت بەپشتگیری کردنەو پشتگیری کردنیش بەم شێوەیە دەبێت:

- وازهێنان لە بەکارهێنانی ووروژێنەرە بینراوو بیستراوەکان.
- دوورکەوتنەوە لەجل و بەرگی تەسک و تەنک و ناشەرعی.
- پاراستنی چاو لەڕوانینی حەرام، چونکە بەرەڵلا کردنی چاو ئەنجامی خراپی دەبێت.
- پاراستنی ئەندامەکان لەتێوەگلان لەحەرامەکاندا.
- کەمکردنەوەی خواردن و خەوتن، چونکە هەردوکیان وروژێنەری سێکسن.
- هەڵبژاردنی هاوڕێی باوەڕدار.

**پاشان ئەم چارەسەرانە بگرەبەر:-**

- خۆشەویستنی پاکداوێنی و ڕق بوون لە بێئابڕوویی.
- زۆر تەوبەو داوای لێخۆش بوون کردن لەخواو پەنابردن بۆی.
- دانانی ئامانجێکی بەرزو جوان لەژیاندا، بەدیهێنانی کارە بەرزو باڵاکان.
- لەبەرچاوگرتنی گرنگی قۆناغی لاوی لەژیانداو لەیادبوونی ئەوەی کەیەکێ لەوانەی لەژێر سێبەری خوادا دەبن لەڕۆژی دواییدا لاوێکە کەلە خواپەرستیدا لاوێتی خۆی سەرف بکات.
- خۆشەویستی بەهەشت و ترسان لەدۆزەخ، هەوڵ دان بۆڕازی کردنی خواو خۆشەویستی خوداو کارکردن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو زاتە پیرۆزە.
- بەردەوام بوون لەقورئان خوێندن و خۆخەریك كردن بەخوێندنەوەی کتێبی بەسوود.
- بەشداریکردن لەکۆڕو کۆبونەوەکانی زیکری خواو فێربوونی زانست و زانیاری.

زۆری ئـەنجامدانی پـدرستشـە جەسـتەیی‌و ماڵی‌یـەکان، بـەردەوام بـوون لەسەر ئەزکارو ویردەکان.

- خەریك کردنی بیرو ئەندێشە بەکارە باشەکان لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا جارێکی تر دەی‌لێمەوە ( خۆپاراستن چاکترە لەچارەسەرکردن).

## ئاگاداری تەلەفۆن بە

ئەمڕۆکە کچانی ئیسلام لـەکوێن؟! ئایـا کۆدەبنـەوە بـۆ دیراسـەکردنی قورئـانی پـیرۆز ؟ زۆربەیان کۆدەبنەوە بۆبەشداری لەیانەکان‌و کارە بێسـودەکان‌و ئینتـەرنێت‌و بەشـداری لەکاسێتە ڤیدیۆیی‌یەکان‌و بی‌س‌تنی گۆرانی‌یە ناشەرعی‌یەکان، هەروەها بەکارهێنانی تەلەفۆن بۆ قسەکردن لەگەڵ پیـاوان، قەسـەگەلی داشـۆراو لـەدین‌و پـەروەردە بـۆ باسـی چیرۆکـەکانی خۆشەویسـتی‌و ئەوینداری، نوێژو بانگیان لەبیرچۆتەوە، وازیان لـەقورئان هێنـاوەو خۆیـان بەسـتۆتەوە بـەم دونیـا بێبایەخەوە، تەلەفۆنیان پێیە نەك بۆهەواڵ پرسینی خزم‌و کەس‌و کاریان، بەڵکو بۆ بێزارکردنی خەڵکی‌و بەدواداگەڕانی هاوسەری ئایندە کەهەرگیز پێی ناگەن !!

چیرۆکێکتـان بۆدەگێڕمـەوە کـە لـەم ڕۆژانــەدا لـەکچێکەوە بیسـتوومە کـەژیانی بـەهۆی خـراپ بـەکارهێنانی تەلـەفۆن زایـە بـووە، ئـەم چیرۆکـەش یەکێکـە لەهـەزاران چـیرۆکی ڕاسـتەقینەی‌تر، خەیاڵ نی‌یەو ڕویداوەو ڕۆژانە ڕوودەدات.

کچی داماو پێی گوتم:-

کوڕێکم ناسیەوە بەهۆی تەلەفۆنەوە کەپرسیاری ماڵی فلانی دەکرد، ووتم: ژمارەکە هەڵەیـە، بەنەرم‌و نیانی‌و خۆشی لەگەڵی دوام، ئاگاداربن‌و بزانن چەندە بەنەرم‌و نیانی دوان لەگەڵ پیـاوان دا مەترسی‌دارە بۆسەردڵەکانیان .

کچی دامـاو ووتـی: کـوڕە وازی نــەهێناو بـۆدووەم‌و سـێیەم‌و چـوارەم جـار تەلـەفۆنی‌کرد هـەتا پەیوەندیم لەگەڵی پتەوبوو، هەروەکو ئـەوەی دەس‌اڵ بێـت ئـەوم ناسـیبێت، ئـەوەش هیـچ نـەبوو، مەگەر وەسوەسەی شەیتانی نەفرین لێکراو نەبێت. پاشانیش کوڕ ووتی: هەرلەیەکەم ساتەوە منی خۆش ویستووەو خۆشەویسـتی‌یەکەی بۆمـن شـەریفانەیە، هـەموو ئـەم شـتانەش بەرلـەوەی کـەبم بینێت.

(ئەی هاوار، کچەی داماو دۆڕاود، بەزمان لوسی خەڵەتاندی، شەیتانیش کارە ناشرینەکانی بۆڕازاندەود)، ڕاست دەفەرموێت خوای بالادەست:( فلا تخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض وقلن قولا معروفا)(الأحزاب: من الآيـة٣٢)، هـەروەها خـوای گـەورە سـەبارەت بەشـەیتان و فێڵـەکانی بەرامبەر مرۆڤــ دەفەرموێت:( قال رب بما أغويتني لأزينن لهم في الأرض ولأغوينهم أجمعـين، إلا عبادك منهم المخلصين) (الحجر:٩٩ - ٤٠)

کچی داماو درێژەی بەقسەکانی داو ووتی:

ژوانمـان دانــاو چـەند جـارێك یـەکترمان بینـی، ئـەویش لەڕێگـــەی نامـــەو پەیوەندی‌یـــە تەلەفۆنیەکانەوە، ئەم یەکتربینینەشمان نهێنی‌بوو، کەس‌وکارم ئاگاداریـان نـەبوون، درۆم لەگـەڵیان دەکردو پێم دەگوتن: دەڕۆم بۆلای فلان کچی هاوڕێم کەکەسێکی دیـندارو پـاکەو زۆر یـەکترمان خـۆش دەوێـت، پاشـانیش دەچووم بۆبینینـی، خۆشەویسـتی‌و پـاکیم تیـایدا دەبینـی، بەشـێوەیەك نـەیدەتوانی لێـم دووبکەوێتـەوە، تەنانـەت بۆسـاتێکیش بێـت، دەیـووت: ژیـانم بـەبێ‌تۆ دۆزەخـە، پاشانیش هەندێ وێنەی من‌و وێنەی هەردوکمانی لای خۆی هەڵگرت.

پـاش تێپـەڕبوونی چوارسـاڵ لەتەمـەنم بـەم شـێوەیە لەگـەڵ خۆشەویســـتەکەمدا داوای کــاری بێڕەوشتی(زینا)ی لێکردم، پێی ووتم: ئەوە فەرق ناکات ئەم کارە دوای پەیوەندی ژن‌و مێردایـەتی بێت یان بەرلە هاوسەرێتی‌مان بێت، چونکە ئێمە هەربۆیەك دەبین‌و مارەت ئەکەم.

ئالێرەدا بوو ئـەم ووشـانە لـەناخم دا هەڵوێستم لەسـەریان دەکـردو بـەردەوام لەخـەیاڵم دا بـوون، هەستم بەترسێکی بەهێز دەکـرد کـەئاگاداری دەکـردم لـەوکارە، چـی دەکـەیت؟ پاڵنـەرەکانی بـاوەڕ کەچەندین ساڵە پشت گوێم خستبوون لـەنێو دڵـم دەجـولان، پـاش خـەوتنێکی قوڵـی درێژخایـەن ویژدانم بەئاگا هاتبوو، بەئاگا هاتبوو بەلام دوای کات لەدەست چوون، بـەئاگا هـاتبوو بـەلام دوای بێئاگایی‌یەکی دوورو درێژ، یەکسەر پرسیارم لەخۆم کـرد: کوانـێ هاوسـەرێتی؟ کوانـێ دیـن؟ ....و کـەس‌و کـار؟ نـاموس؟ نـاگرو مرۆڤـــ ؟ شـەرەف ؟ کچێنـی ؟ ئەمـــە بێئابڕویی‌یەکـە لێ ڕزگــارم نابێت.

پێم ووت: ناتوانی ئەوکارەم لەگەڵدا بکەیت، هەتا ماردم نەکەیت.

ئەویش ووتی: داماو ناتوانی ئەمڕۆکە خـۆت ڕزگـار بکـەیت، لـەناو خـەڵکی‌و کـەس‌وکارت ئـابڕوت ئەبەم، بەڵگەی پێویستم هەیـە لـەدژت، ئەمانـە هـەموو وێنـەی تـۆن، هـەرمویان لـەلام پـارێزراون، نهێنی‌یەکانی خۆت‌و کەس‌وکارتم لەلایە.

ئەوساتەوەختە کچی داماو لەناو دۆزەخێکی وەهادا دەژیا کە بـاس نـاکرێت، ئـەویش خـۆی بۆخـۆی سازی کردبوو، ئەو پەیوەندیە تەلەفۆنی‌یە چی سـودێکی هـەبوو؟ ئـەم پەیوەندی‌یـە ناشـەرعی‌یە چی‌بوو؟بەچی بگەڕێتەوە؟ ئەو بێڕەوشتە لەعنەتی‌یە ناچاری کـرد ئـەوکارە بکـات؟ بـەو بـۆمبـە تـەوقیت کراوانـەی کەبـەهۆی سـەبری چـەندین سـاڵەیەوە بـۆی دانـابوو، کچەکـەش کەدەیروانی‌یـە دواوە جگـە لـەپەردە وێـران بوودکـانی هیچـی تـری نـەدەدی، نـەمێرد، نـەش‌دەوی بوکێنـی، نەشـایی، نەجلی بوکێنی، نەمارەیی، ئەم بچوکی‌و سوکای‌ەتی پێکردنە بۆچی، ئەمەیە خەمی هەمیشەیی.
چی بەکەس‌وکاری بڵێت؟ چی بەبراکانی بڵێت؟ ئەوانەی متمانەیان پێ‌کردووەو لایان بەڕێز بووە، چۆن پاش‌ماوەی تەمەنی لەگەڵیاندا بەسەربەرێت؟ ووتی: ئـەم هـەموو بێ‌ئابڕوویی‌یـە خوایـەگیان لەپێناو ئەو ووشەیە بوو کەخۆم بۆخۆمم بڕیاردا.

**خۆشکەکەم:-**

لەپاش ئەم چیرۆکە دڵتەزێنە، ئاگاداربە چارەنوسی تۆش وەکو چارەنوسی ئەوکچە نەبێت‌و خۆت‌و دەورووبەرەکەشت بەفەنا نەدەیت، گرانبەهاترین خشڵی ژیانیشت لەدەست نەدەیت کەئەویش پاک داوێنی‌یە، کەپێی شەرەف مەندی‌و شانازی پێوە دەکەیت‌و لەپێناویدا دەژیت.

ووتەیەك کەدەبێت بگوترێت

**یەکەم:** ئـەم چیرۆکـە یەکێکـە لەوهـەزاران چیرۆکـە ڕاسـتەقینەیەی کەلـەژیانی مسـوڵمانانـدا ڕوو دەدات، ئـەمیش یەکێکـە لەوهـەزاران کچـە مسوڵمانەی کـەقوربانی ئـــەم جـۆرە کارانـــەن، بـەداخ‌و پەژارەیەکی زۆرەوە، ئەگەر من لەشوێنی ئەو دەبووم .. لەو قۆناغەشدا بومایـە کەبمتوانیایـە خـۆم لەزیانـە چاوەڕوانکراوەکـاندا ڕزگاربکـەم، ئـەوەم دەکـرد، ئـەویش ئەوکاتـەبوو کـەکچی دامـاو، ڕووە پیس‌و ناشرینەکانی ئەو کوڕەی بۆدەرکەوت، کاتێ داوای ئەنجامدانی کاری بێڕەوشتی لێ‌کرد.
دەبوایە ڕێگەنەدات ئەوکارەی لەگەڵدا بکردایەو پارێزگاری لە نامۆسی خۆی بکردایە هەتا مـردن‌و .... چارەنووسی نەکردنی ئەوکارەشی قبوڵ بکردایە، چونکە زەرەرو زیانەکانی کەمتربوو لـەوەی پاش ئەنجامدانی ئەوکارە بێڕەوشتی‌یە تووشی دەبێت.
جا .. ڕووم لەوانەیە کەلەلایەن مایە پوچێکەوە داوای بێڕەوشتیان لێدەکرێت. لێدان‌و سزاو لۆمەی کەس‌وکاردکەیان هەڵبژێرن باشترە، ئەوان کەس‌و کاریانن‌و بەزەییان پێدادێتەوە، بەڵام ئەو گورگە خوێن مژانە کەدەیانەوێ بێ‌ئابڕویان بکەن بەزەیی نازانن . . .و دەیانەوێ ژیان‌و نامۆس‌و نامۆسی کەس‌و کاریان بسوتێنن. دەبێت سەرەتا بۆکـەس‌و کاردکـەیان ڕون بکەنـەوە بەتایبـەتی ئـەوەی زۆر متمانـەیان پێیـەتی، بۆنمونـە دایکیـان . . .بـەڵام ئەمـە دوای تۆبـەکردنیان دەبێـت لـەلای خـوداو

گریان‌و پەشیمان بوونەوە لەبەردەرگای ئەوداو داوالەخودا بکەن پەنایان بدات لەوخراپەیە ڕزگاری ببێت.

سوێند بەخودا، خوا یارمەتیان دەداتو . . .لەسزاو لۆمەی کەس‌وکارەکەشیان لەبەرامبەریاندا کەم دەکات، بەتایبەتی ئەگەر بزانن کەهێشتا تووشی بێڕەوشتی نەبووەو نەیهێشتووە دەست درێژی بۆسەر ناموسی بکرێت . . .و هێشتا کچێنی لەدەست نەداوە، بەو شێوەیە دەتوانیَ قسەی لەگەڵدا بکات تاوەکو بیخوازێت، ئەگەریش بەوەی زانی کەتەنها مەبەستی کوڕەکە ڕابواردن‌و بەتالکردنی ئارەزووەکانیەتی، ئەوا لێی هەڵبێت‌و لەهەڵەکانی دەرس وەرگرێت‌و ئەوا ئێستا تۆبەکارو پەشیمانە.

**دووەم:** باشتروایە کچ هەرکەگوێی لەدەنگی تەلەفۆن بوو پەلاماری نەدات تاوەکو نەزانێت پەیوەندییەکە لەلایەن کێوەیە .. . ئەگەریش ناچاربوو قسەبکات بەڵام بەشێوەیەکی بەڕێزو سنوردارو بەپێی پرسیاری بەرامبەر وەڵام بدات، دەرگای ئەوەش نەکاتەوە کەسی بەرامبەر بتوانێت چەواشەی بکات، چونکە لەوانەیە بڵێت بەڕاستی موعجبت بووم، بەڕاستی درۆزن‌و فێڵبازە.

باوەڕم پێبکە کچەکەم، ئەگەر خۆشی بوێت دێت لای کەس‌وکارەکەت بۆداخوازیت، چونکە خۆشەویستی ڕاستەقینە لەترسی داواکردنت لەلایەن لاوێکی دیکەوە هەرزوو ئەم کارەدەکات . . . بەڵام ئەگەر بیەوێت بەدزی ئەوانەوە پێت بگات بزانە دەیەوێت تەنها ئارەزووەکانی خۆی تێربکات . . .باش تێبگە.

* پێم باشە لێرەدا چیرۆکی کچێکی زیرەکی هاوسێمانت بۆبگێڕمەوە، کەبیست ساڵێك دەبێت هاوسێمانن، لەقوتابخانەیەکی کچان وەك مامۆستایەك کاردکانی ئەنجام ئەدات، وەلەوپەڕی تەمەنی لاویشە، خواش دەزانیَ کەئەم چیرۆکەم دێتەوە یاد هەست بەسەربەرزی‌و پتەوی دەکەم، کاتێك هەڵوێستی کچانی بەشەرەف‌و باوەڕدارو پاکداوێنی ئیسلام دەبینم‌و دەبیستم، بەهەرحاڵ کورتەی بەسەرهاتەکەئەمەیە: تووشی لاوێك هات کەدەیناسی، چونکە لەیەك گەڕەکدا دەژیان‌و لاوەکە وای بۆدەردەبڕی کەزۆر خۆشی دەویست‌و پێی سەرسام بوو بوو هەتا دوایی . . . . . . .

ئەبێ کاردانەوەی چی بوبێت خوشکەکەم ؟ ئایا وەکونەزانان قسەی ناشرینی پێووت؟ یان بەبێ دەنگی لەووتەکانی ڕاما تاوەکو بزانێت ڕاستگۆیە یان درۆزنە؟ لەبەردەم خەڵکیدا ڕووی تێکردو نەیوت باکەس دیارنەبێت، چونکە متمانەی بەخواو پاشان بەکەس‌وکاردکەی هەبوو، ئەوانیش متمانەیان پێی هەبوو، چونکە هیچی لێیان نەئەشاردەوە.

لەرۆژێکی ڕووناکدا ئەوکاتەی خەڵکی شەرم لەیەکتری دەکەن، بەکوڕەکەی ووت: فلانەکەس وتت تۆ منت خۆش دەوێتو لەیەکەم ساتەوە موعجەبم پێت، منیش پێت دەڵێم: منیش ڕازیم بەوەی ببیتە هاوسەرم، تۆش دەتوانیت لەگەڵ کەسو کارەکەتدا ئەمڕۆ یان بەیانی یان دووبەیانی بێیتو کەسوکارەکەم ڕازیبکەیت، من ڕازیم شووت پێبکەم.

ئالێرەدا لاوەکە بەوەی زانی درۆکانی ئاشکرابوودو پیلانەکانی هەڵوەشاوەتەوەو جگە لەڕاکردن هیچی لەبەردەمدا نەماوە . . . . نەك سەیری کچی نەکرد بەڵکو تاکە وشەیەکیش لەزاری دەرنەهات.

پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك گەنجەکە کچێکی تری مارەبڕی، کچەکەش شووی بەکوڕێکی دیکەکرد، ئاوەهابە کچەکەم، بەهێزو بەئاگا وەك ئەو کچە باوەڕدارە .. . .

هەرکەسێ نیازی خراپی هەیە لەبەرامبەرتدا دووری بخەرەوەو بابە زەلیلیو بچوکی بگەڕێتەوە، ئاگاداربە تەسلیمی درۆو بەڵێنە بێمایەکانی نەبیت، بەوخودایەی کەتاكو تەنیایە هەرلاوێك مەبەستی هاوسەرگیری بێت بەمەبەستی پاك داوێنی، خوا ئەوکەسەی لێدوورناخات، بەڵکو خوا بەڵێنی داوە دەوڵەمەندیان دەکات بەفەزڵو بەرەکەتی خۆی، خوای بالادەست دەفەرموێت:( وأنكحوا الأيامى منكمْ والصالحين منْ عبادكمْ وإمائكمْ إنْ يكونوا فقراء يغنهمْ اللهُ منْ فضله واللهُ واسعٌ عليمٌ) (النور:٣٢)

## بەشی نامەکان

### ( نامەیەك لەشەوی بوکێنیدا )

کارمەندی پۆستەو گەیاندن نوسراوێك و کۆمەڵێك وێنەی بۆپیاوێك هێنا لەشەوی بەکێنی خێزانە هەژارو بەستەزمانەکەیدا هی ژنەکەی بوو، بەرلەم پەیوەندی لەگەڵ دڵدارێکیدا هەبووە بۆماوەیەك، کچیداماو دەیویست بەم شوکردنە مێژووی ڕەش و پڕلەشەرمەزاری و تاوانی ڕابردوو وەلابنێت، بەلاّم کامە دڵدار- بەوەندە نەوەستا کەشەرەفی بەزایە بردبوو، بەلکو دەیویست ژیانیشی وێران بکات بەرلەوەی خۆشیەکەی بگاتە ئەنجام نامەیەکی بۆ مێردەکەی نارد، لەنامەکەیدا نوسیبوی:( بیستم فولانەکەست مارە کردووە، وەبەم زوانە دەبیتە هاوسەری، بزانە چاوت بەهەڵەداچوو هەرچی پێوتوی درۆو فێڵە، ئەوەی پێی وتوی کەبەهۆی ئەوەوە بەختەوەر دەبیت فێڵی لێت کردووە، بزانە ئەو هەرگیز تەنها بۆتۆ نابێت، هەروەکوچۆن لەمەوبەر وانەبووە، خۆشەویستی ئەو بۆتۆ ڕاستگۆیانە نییە، هەروەکو چۆن دڵی پڕە لەعەشقی خۆشەویستەکەی کەچاوێك بەخۆشەویستەکەت دا بخشێنە، واز بێنەو لەبەرامبەریدا توند مەبە، ئەگەریش دەتەوێ بزانی ئەو عاشقە کێیەو دڵنیابیت لەم هەواڵەو دڵسۆزیو ڕاستگۆیی من بۆتۆ، سەیری ئەو وێنەیە بکە کەلەگەڵ ئەم نامەیەدایە .. . . . والسلام

ئیمزا / خراپەکار

**خوشکەکانم**:- بەسەرهاتی گورگەکان ئەوەندە زۆرن کەلەژمارەنایەن، بەلاّم ئەوکەسە کەسە ئەلفێکی بەسە، کەم نین ئەوکچە بێڕەوشتانەی کەلەپاش شوکردنیان لەشەوی بوکێنیان دڵدارەکانیان بەنامەیەك خۆشیو ئاهەنگیان لێتێك دەدەن و ئەوانەی کەبەلایانەوە دڵسۆزو ڕاستگۆبوو، ژیانی نوێیان لێکردوون بەدۆزەخ و ئابڕوو چوون.

کچێکیش نییە ژیانی خۆی بە خۆشەویستیو وەفا دەست پێکردبێت و نەیتوانیبێت لەژیانێکی هاوسەرێتی شەریفانە بژیت، خواش ستەم لەکەس ناکات.

ئێستا کاتی ئەودیە کچەکەم: بەهەموو هێزێکەوە ئەوکەسە بناسی کەدەیەوێ پۆشتەو بەرێزو پاك داوێن بیت و ئەوەش بناسی کەدەیەوێت ڕووت و بێڕێزو گاڵتەجاڕی خەڵکیبیت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بەدەست گرتن بەحیجاب و پۆشتەییو پاکیو پاکداوێنیت ببیتە نمونەی ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە :( یا ایها النبیّ قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنین یدنین علیهن من

جلابيبهنَ ذلك أدنى أنْ يُعرَفن فلا يُؤذَين وكان اللهُ غفورا رحيما) (الأحزاب:٥٩)، واتـه: ئـەی پێغەمبەر بەخێزانو کچەکانتو ئافرەتانی باوەڕداران بڵێ، بەپۆشاکی بالاپۆش خۆیان داپۆشن، ئەوە لەبارترین شتە کەپێی بناسرێن، تائازار نەدرێنو توشی گرفت نەبن، هەمیشەو بەردەوام خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە، لەکەموکوڕی ڕابردوتان دەبورێت.

## ژیانی خەڵەفاویو ڕابواردن

کیژۆڵەیەك لەیەکێك لەووڵاتە عەرەبی‌یە مسوڵمانەکان کەقوتابی‌یەو تەمەنی(٢٥) ساڵە، لەیەکێك لەزانکۆ عەرەبی‌یەکان دەخوێنێت، توشی نەخۆشی ئایدز بووە، دەڵێت: هەموو ئەمانەم تووش بووە بەهۆی ژیانێکی خەڵەفاویو ڕابواردنەوە کەبەسەرم برد، ومن هیچ تاوانێکم نەبوو لەمەدا، بەڵکو تاوانی باوکم بوو، کەهیچ کاتێك ئاوڕی لێنەدەدامەوە، بەتایبەتی لەپاش مردنی دایکمو هێنانی ژنی دووەمی، هیچ ڕۆژێك لێی نەدەپرسیم بۆکوێ دەڕۆیت؟ کێن هاوڕێکانت؟ چۆن ڕۆژت بەسەردەبەیت؟ . . . چەند لێی پاڕامەوە کەگرنگیم پێبدا، بڕوام پی‌بکەن کاتێك پێتان دەڵێم : تاوەکو ئێستا نازانێت کەپۆلی چەندم، تائەوڕادەی قەناعەتم بۆدروست بووە کەئەو بیری ئەوەی نی‌یە کەکچێکی هەیە.

کوڕێکم ناسی، بەڵکو زیاد لەکوڕێك، دەرئەچووم لەگەڵیانداو پیاسەم لەگەڵیاندا ئەکرد ... بینینم کەگرنگیم پێ‌ئەدەن ئەگەرچی بەرستیشیان نەبوایە، هەموو ئیشێکی حەرامم ئەکرد، ومادە بێهۆشکەرەکانم دەخوارد، ودەڕۆشتم بۆهەموو شوێنێکی ووڵات لەگەڵیاندا ژیانم بەسەر ئەبرد، تاوەکو تووشی نەخۆشی ئایدز بووم، ومن هەستم بەم نەخۆشی‌یە نەدەکردو نەم دەزانی تالەڕێگەی پشکنینی خوێنمەوە لەنەخۆشخانە ئەمەم بۆدەرکەوت، کاتێك کەهەستم بەهیلاکی‌و لاوازی‌و بێ‌هێزی‌یەك دەئەکرد کەهەموو لەشمی داگرتبوو، وتاوەکو ئێستا باوکم هیچ شتێك نازانێت دەربارەی نەخۆشی‌یەکەم، تەنها ئەوە نەبێ کەمانگی جارێك سەرلەمنو خوشكو برابچوکەکانم ئەدات، تاوەکو خەرجی ئەومانگەمان پێبدات، چەند ئاواتمە کەبمرمو ژیانم کۆتایی پێ‌بێت، بەلام لەوەدەترسم کەخوشکەکانیشم دواڕۆژیان وەك دواڕۆژی من بێت ....

تەنها بۆلای خوای گەورە سکالاو غەمو خەفەتی خۆم بەرزدەکەمەوە .....

خوشکە وون بووەکەتان....!!

# پەرتەوازە بوون

من كچێكم حەزم بەوە نىيە كەكەس فەرمانم بەسەردا بكاتو بەربەستم بۆدابنىٚ، ززۆر بێزارم لەهەڵسوكەوتى كەس‌وكارم. لەمامەڵەكردنيان لەگەڵمداو چاوێرى كردنيان بۆم، ژيانم بەشێوەيەك بەسەربرد كەپڕبوو لەجەربەزديى‌ومەترسىو ڕوداوى كوت‌وپڕو لەناكاو، ناخۆشىو غەمو خەفەت، وەهەندىٚ جار بيرم لەخۆكوشتن دەكردەوە بۆدەربازبوون لەناخۆشىيەكانى ئەم دونيايە.

لەسەرەتاى قۆناغى زانكۆدا بووم كەدەستم كرد بەشكاندنى ئەو پەرژينە ئەمنيەى كەكەس‌و كارم بەدەورمدا دروستيان كردبوو لەكاتى پێگەيشتنمداو لەپێش ئەوكاتەشدا بەماوەيەكى كەم.

يەكەم هەنگاوێك كەنام بۆئەوەمەبەستەم لەڕێگەى هەندىٚ لەهاوڕىٚ كچەكانمەوە بوو لەزانكۆ (ڕەقەم پێدانو مۆبايل)و ئەم قۆناغە قۆناغێكى كات بەسەربردنو چێژ وەرگرتن بوو زياد لەهەموو شتێكى تر.

پاش ماوەيەك كەڕۆى بەسەر ئەم حاڵەمداو ڕاهاتنم لەسەر ياريكردن بەهەستو سۆزى گەنجان وەشكاندنى پەرژينى چاودێرى كردنى كەس‌وكار بۆم ئارەزووى زۆر لەمە زياترم بۆدروست بوو، وەئەمەش شتێكى گران نەبوو بەلامەوە، يەكەم جار دەستم كرد بەپرسيار لەهەندىٚ هاوڕىٚ كچى خۆم كەزۆر تايبەتى بوون لام ... وەهەرواش بوو يەكێكيان ڕێنمونى كردم بەچەند ڕێگەيەكى گونجاوى پارێزراو.

يەكێك لەوڕێگايانە لەڕێگەى ئافەرتێكەوە بوو كەئيشى ئەوەبوو كەسەرپەرشتى شوێنێكى دەكردو زۆر بەسەليقەبوو لەڕێكخستنى پەيوەندىو چاوپێكەوتن بەهەموو جۆرەكانيەوە (چاوپێكەوتنى تايبەتى تەنهايى، ئاهەنگى بەكۆمەڵ).

ئەمەش ئەزموونو تاقىكردنەوەيكى پڕبايەخ بوو، گونجاوبوو لەگەڵ ڕوحى جەربەزەيمدا، لەهەمان كاتدا پڕبوو لەمەترسىو نەگبەتىو بەدبەختى، بەرامبەرئەوەى كەمن شتێكى زۆرگەورەم لەژيانمدا لەدەست دا وەكو كچێك ... كچێتىو پاكێتىيەم لەدەست دا، بەداخەوە .. و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دوونەكەوتمەوە لەودوروبەرە تازديەى كەتێى كەوتبووم بەشێوەيەكى تايبەتى.

هەستم بەسەركەوتن ئەكرد بەسەر ئەوكۆتە تونددەى كەكەس‌وكارم بۆيان دروست كردبووم بىٚئەوەى هيچ ڕێگاو بەلگەيەكى ڕوونو ئاشكرا، وەهەندىٚ جار گومانيان لێم دەكرد بەلاّم من گرنگىيەكى زۆرم پىٚنەدەدا.

وەلەدوای ئەوەی تووشی زۆر ناخۆشیو ئازاربووم لەگەڵ ئەوکۆمەڵەدا کەوەکو شەمشەمە کوێرە شەویان بەهەموو جۆرە ڕابواردنێکو چێژ وەرگرتنێك بەسەرئەبرد ... و من وام هەست ئەکرد خۆشەویستم لەنێوانیانداو حەزپێکراوم تاوام لێهات لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕۆژگاردا وەکو پێڵاوم لێهات.

وەباری دەرونیم تادەهات بەرەوخراپتر ئەچوو، تاوای لێهات دونیا لەبەرچاومدا ڕەش بوو، کەس‌وکارم هەستیان بەمەکرد، و دایکم بردمی بۆلای یەکێ لەزانا ئاینیی‌یەکانو قورئانی بەسەرمدا خوێندو منیش دەستم کرد بەگریانو ئەو قورئانە واکاری تێکردم کەبەردەوام نوێژبکەم بەڕێکی، بەڵام ئەم کارەم زۆری نەخایاند، ئەویش کاتێك بوو کەنامەیەکم نووسی بۆیەکێ لەگۆڤارەکانو تیایدا سکاڵای باری دەرونیمو ناخۆشیو بەدبەختی خۆمم بۆکردبوو، وە ئەم نامەیە کەوتبووە دەست دەرهێنەری نوسین لەو گۆڤارەدا، وە هەوڵی ئەوەی ئەدا بم ناسێ، وەهەرواش بوو، کەئەوم ناسی کارەکە لەگەڵ ئەودا خراپتر بوو لەپێشتری، وە لەگەڵ ئەویشدا تووشی پەرتەوازەییو وون بونێکی تربووم، تاوەکو ئێستا لێی دەرنەچووەمە. . .

کچێکی خزمم پێی ووتم: (کە ئەو کچێکی پەیوەستە بەشەرعەوە) کەوا گۆڤاری خێزان گرنگی ئەدات بەکێشە دەرونی‌یەکان، وەمنیش بەسەرهاتو چیرۆکی خۆمم بۆنوسین، وەمن ئێستا لەناخۆشترین ڕۆژی ژیانمدام.

کچە پەرتەوازەوون بووەکە

# ( من پەشیمانم )

من کچێکم، لەتەمەنی بیست و سێ ساڵیدام . .بەبارێکی دەروونی زۆر خراپ دا تێئەپەڕم، بەهۆی کردەوەی شێتانەی خۆم کەهیچ لێپرسینەوەیەکم بۆنەکردبوو . . . . وەمن دان بەهەڵەیەکدا دەنێم کەتێی کەوتم تاوەکو تیاچووم لەدەریای پەشیمانیدا . . باوکم مردوو بەمردنی ئەو بۆشاییەکی دەروونی و سۆزداری گەورەی بۆدروست کردم، پەنام برد بۆبەکارهێنانی ئینتەرنێت، خۆمم پێوە خەریك كرد، وەکو هۆیەك بۆدەربازبوون لەغەم و ناخۆشی و خەمۆکی(کێبە) کە ڕۆشتنی باوکم دروستی کردبوو.

لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە چەند کچ و کوڕێکی گەنجم ناسی و قسەم لەگەڵیانا ئەکرد بۆماوەی چەند سەعاتێکی زۆر . . زۆری نەبرد کەکوڕێکی گەنجم ناسی کەنیشتەجێی شارێکی نزیك شارەکەی خۆم بوو . . . . .

قسەو گفتوگۆکانمان جۆراو جۆربوو، پاشان داوای ژمارەی تەلەفۆنەکەمی کردو منیش نارەزایی خۆمم بۆدەربڕی و نەمدایێ . . و لەپاشاندا زۆری لێکردم و زۆر لەسەری ڕۆیشت و پێی لێداگرتم، ژمارەی مۆبایلەکەمم دایێ و . . . تاوای لێهات زۆر تەلەفۆنی بۆدەکردم، پاشان داوای چاوپێکەوتنی لێکردم و منیش داواکارییەکەیم ڕەت کردەوە، دوای ئەوە کەهەر سوور بوو لەسەر داواکارییەکەی چاوم پێکەوت لەشوێنێکی گشتیدا،و چاوپێکەوتنەکانمان زۆر بوو.... و هەر لەوکاتەدا گەنجێکی ترم ناسی، کەزۆر ڕەفتار خۆش و هێمن بوو، زۆر زیرەك بوو لەبەکارهێنانی ئینتەرنێت دا، زۆر شتی لێوە فێربووم کەنەم دەزانی، قسەکردن و گفتوگۆکانمان زۆر بوو وەداوای ژمارەی تەلەفۆنەکەمی کرد ... وە دوای دڵڕاوکێیەکی زۆر ژمارەکەم دایێ و پاشان داوای چاوپێکەوتنی لێکردم و ڕۆیشتم بۆ چاوپێکەوتنی و لەنێوانماندا زۆر شت ڕویدا، ئەوەی کەلەنێوان کوڕو کچێکی گەنج دا ڕوودەدات کاتێك کەبەیەکەوە کۆدەبنەوە .. بەم شێوەیە من هەموو شتەکانم لێ تێکەڵ بوودو نازانم چی بەخۆم دەکەم؟! نازانم بڕوام پێدەکەن ...

پاش ئەوە کوڕێکی ترم ناسی کەئەمە سێیەم کوڕبوو، لەوانیتر ڕوخۆشترو هێمن تر بوو، وەدلەگەڵیدا هەستم بەخۆشەویستی دەکرد لەکاتێکدا لەگەڵ دوانەکەی پێشوودا هەستم دەکرد کەبرای منن ... گوێم لەهەواڵیان دەگرت و بەشداری چارەسەرکردنی کێشەکانیانم دەکرت ... ئابەو شێوەیە پەیوەندیم بەردەوام بوو لەگەڵ هەرسێکیاندا .. تاوەکو خوشکەکەم بەمەی زانی، ئامۆژگاری کردم کەوازیان لێبهێنم و منیش بەڵێنم پێدا کەوازیان لێدەهێنم تابێدەنگی بکەم . . . .

ودبەڕۆیشتنی ڕۆژگار، کوڕێکی زۆرباش داوای کردم ... زۆر دڵخۆش بووم، چونکە هەستم دەکرد کەئەو ڕزگارکەری منە تاوەکو هەموو پەیوەندییەکانم کۆتایی پێبهێنم لەسەر ئینتەرنێتەوە ... بەڕاستی ئەڵقەگۆڕینەوەکەمان سەری گرتو داوام کرد لەهەرسێ هاوڕێکەم کەوازم لێبهێننو پەیوەندیم لەگەڵیاندا کۆتایی پێبێت، دوانیان ڕازی بوون .. بەڵام سێهەمیان کەکەسی یەکەمیان بوو کەبۆچوونەکەمی بەدڵ نەبوو بەوەی وازیلێبهێنم، هەستا بەوەی کەیەکێکی شارەزا دەیکات لەبواری کۆمپیوتەردا بەچاودێری بەریدی ئەلیکترۆنیمی دەکرد، و هەموو ئەو نامانەی کەناردبووم بۆدووکەسەکەیتر، وەنامەکانی ئەوان بۆمن، هەموو ئەوانەی کۆپی کردبوو، وەناردبووی بۆم بۆماڵەوە، وەکاتێك کەبینیم، داچەڵەکامو خەریك بوو بمرم، بەپەلە سوتانم لەترسی ئەوەی نەوەکو کەبگاتە دەستی دەستگیرانەکەم، کەخۆشی ئەوێمو منیش ئەوم خۆش ئەوێ، بەڵام هەست بەترسو دڵەڕاوکێ دەکەم بەوەی کە ئەم شتانەم ئاشکرابێتو دەستگیرانەکەم کەخۆشم ئەوێت وازم لێبێنێت، وەهەست بەتاوانێکی زۆر گەورە ئەکەم بەرامبەری . . . .

لەترسو داچەڵەکانێکی ڕاستەقینەدا دەژیم بەتایبەتی کاتێك کەزەنگی دەرگاو تەلەفۆنەکەم لێدەدات، یان کاتێك کەنامەیەکی تایبەتیم دێت، یان تەنها بەباسکردنی خێزانەکەم بۆ هەربابەتێك .... واهەست ئەکەم کەئەوان لەوانەیە شتێکیان زانیبێت دەربارەی پەیوەندییە هەڵەشەییەکانم ... من زۆر ماندووم، ئاواتەخوازی مردنم ...و من هەست ئەکەم کەناتوانم بەکاری خۆم هەستم وەکو مامۆستا، واهەست دەکەم کەمن شایانی ئەوپیشە پیرۆزە نیم ...و شایانی ئەو متمانەیە نینم کەکەسوکارم پێیان بەخشیوم .. من پەشیمانم .. پەشیمانم .. پەشیمانم.

داواکارم لێت ... کەئەم نامەیەم بڵاوبکەیتەوە تاوەکو ببێتە پەند بۆ هەموو ئەوکچانەی کەوا لەپشتی کۆمپیوتەرەوە کاری بێهودە ئەنجام دەدەن، بەمەبەستی کات بەسەر بردنو گاڵتەکردن تاوەکو نەکەونە داوی کەسانی بێئابڕوو نامەردەوە.

## فریام کەون ئەی پیاوانی ئاینی

کچێك دەڵێت: من کچێکی گەنجم، تەمەنم بیست ساڵە، لەزانکۆ دەخوێنم، هاوڕێیەکی کچم هەیە کەخۆشەویسترین هاوڕێمە، بەڵام یەك عەیبی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کەهاوڕێیەتی کوڕی زۆر دەکرد، وەبەوە زۆر دڵخۆش بوو، هەرچەند ئەم کچە زۆر بەئەمەك و وەفاداربوو، لەکاتی ناخۆشیدا لەگەڵمدا بوو، وەپشتی تێ نەدەکردم.

ئەوەی گرنگە ئەوەبوو کەدەیویست بمناسێنێت بەگەنجێك، وەمنیش نارەزایی خۆمم بۆدەبڕی لەبەرئەوەی من نەم دەویست بەوڕێگایەدا بڕۆم، وەزۆر کات پێم دەوت ئەو ڕێگایەی کەگرتوتەبەر ڕۆژێك دەبێت کەپەشیمانی لێدەردەبڕێت.

لێتان ناشارمەوە کەوا لەناخمەوە پاڵنەرێك هەبوو کەوا ئەم ئیشە بکەمو تاقی بکەمەوە بۆتەنها جارێك .. ! وە ئەم هاوڕێیەم هەر لەهەوڵداندا بوو کەمن بەوکوڕە بناسێنێتو چاوپێکەوتنێکی لەگەڵیدا ڕێکخستبوو بەبێ ئەوەی من بزانم، کوڕەکە سڵاوی لێکردمو قسەی لەگەڵدا کردم، وەمنیش بەڕێزەوە وەڵامم دایەوە، وە هاوڕێکەم لەدوای ئەم چاوپێکەوتنە کوتوپڕە ڕەقەمی تەلەفۆنی کوڕەکەی داپێمو ڕەقەمی تەلەفۆنەکەی منیشی دابوبەئەو، لەڕۆژی دووەم دا کوڕەکە تەلەفۆنی بۆکردم، وەزۆر دوودڵ بووم لەوەڵام دانەوەی، چونکە ڕەقەمەکەیم ناسی، پاشان وەڵامم دایەوە، وەزۆر بەڕێزەوە قسەی لەگەڵمدا کرد، پاشان پرسیاری شتێکی لێکردم دەربارەی خوێندنو پێی ووتم لەزانکۆ یەك دەبینینو خەتەکەی داخست، وەلەگەڵ ڕۆژگاردا پەیوەندیم بەهێزتر بوو لەگەڵیدا، وام هەست دەکرد کەئەمە پەیوەندی خۆشەویستی‌یە، وەشتێکی نوێیە لەژیاندا، ڕزگارم دەکات لەبێزاری‌و شتە دووبارە بووەکانی ژیانم کەڕۆژانە دووبارە دەبێتەوە ....

وەئەو گەنجە کەسێکی جوانو بەقەڵافەت بوو، وە زمانێکی زۆر شیرینی هەبوو، تاوای لێهات گرفتاری بوومو بەدرێژایی چەند سەعاتێك گفتوگۆمان دەکرد لەکاتە درەنگەکانی شەودا ....

ئەوەی لێرەدا گرنگە ... بۆئەوەی زۆر درێژەی پێنەدەم، داوای لێکردم کەسەردانی بکەم لەشوقەکەی خۆیداو پەنای بردە بەرهاوڕێکەم تاشوێنەکەم پێبناسێنێتو بمگەیەنێتە ئەوێ، بەڵێ ڕۆیشتمو گەیشتینە ئەو شوێنەو هاوڕێکەم بەتەنها بەجێی هێشتم لەگەڵ ئەو کوڕەدا.

بینم کەکوڕەکە لێم نزیك دەبێتەوەو خۆشەویستی خۆیم بۆدەر دەبڕێت، وەهەستم کرد کەوا داوای ئەوەم لێدەکات کەئارەزووە جنسی‌یەکانی پڕبکاتەوە بەتەنها ... پاشان لەکاتی بێدەسەڵاتیمدا

بەرامبەری لەوکاتەدا ئیشەکەی خۆی لەگەڵمدا کرد، کۆتایی پێم هێناو وەکۆتایی بەژیانیشم هێنا لەپاش ئەوکارە، وە ئێستا من سکم پڕە لەو کورە ...

پشتی تێکردمو وازی لێهێنام .. پاش مانگێکیتر خوێندنی زانکۆم دەست پێدەکات .. نازانم چی بکەم ؟ وەکەسو کارم بەمە نازانن، وەهیچ کەسێکیش بەمە نازانێ بێجگە لەهاوڕێکەم کەسوێندی بۆخواردم کەئەو بەوەی نەزانیوە کەئەو کورە مەبەستی ئەوە بووە، وەتەنها وای زانیوە کەدەیەوێت تەنها چاوی پێبکەوێتو زیاتر بیناسێت ...

وەهاوڕێکەم پێشنیاری ئەوەی بۆکردم کەبچم ئەو منداڵە لەباری خۆم بەرمو ئەو پزیشك دەناسێت کەوا نەشتەرگەری لەباربردن دەکات لەماڵەوە بەنهێنی ...

ڕێنیشاندەریمبکەن، وەفریام گەوتن بۆدەرباز بوونم لەم کێشەیە، چونکە زۆر بیرم دەکردەوە لەخۆکوشتن یان کوشتنی ئەو منداڵەی کەهەڵم گرتووە بەلەباربردنی ... ئایا ئێوە هیچ چارەسەرکردنێکی ترتان هەیە بۆئەم کێشەیە ؟ چونکە گوێم لێبووە کەکچانێکی زۆر ئەم کاری لەباربردنەیان کردوە .. فریام کەون ئەی پیاوانی ئایینی، چونکە بێزارم لەژیانی خۆم ..و ئاشکرابوونی ئەو کارەخراپەی کەکردووەمە، هەموو ڕۆژێك مردنم پێشان دەدات ...

* وەڵام :

ئێمە هەموو بەندەی خوای گەورەینو بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، وەتەنها خوامان بەسەو وەئەویش چاکترین سەرپەرشتیارە، داواکارین لەخوای گەورە کەسزای شیاوی ئەوکەسانە بداتەوە کاتێك کەڕێگەیان دا بەتێکەڵاوی لەووڵاتی مسوڵمانانەدا ...

وە ئەمەوێت ئامۆژگاری هەموو ئافرەتان بەتایبەتی ئەوانەی لەتەمەنی لاوێتیو وەقوتابێتیو هەرزەکاریدان بەوەی :-

**یەکەم**: حەیاو ئابڕووی ئافرەت بواری ئەوە نادات کەتۆ تیایدا بڵێیت باگەنجێك بناسم وەکو تاقیکردنەوە، وەگۆڕانکارییەك لەژیاندا،وە بوڕەواندنەوەی بێتاقەتی، ئایا ئەمە ڕاستە کەوا لەئافرەت بکرێت کەئابڕوو ناموسی لابێنرخ بێت؟ بەم شێوەیەو بەوڕادەیەی کەوا یاری بەئابڕووی خۆی بکات وەکو شتێکی بێنرخ؟

**دووەم**: ئەم چیرۆکە پەندو ئامۆژگارییە، ئەوەمان بۆڕوون دەکاتەوە کەبۆچی شەریعەتی خوای گەورە تێکەڵاوی نێوان ئەودوو ڕەگەزەی (نێرومێ)یەی حەرام کردووە بەوشێوەیەی کەئێستا دەیبینین لەناو ولاتی مسوڵماناندا؟ چونکە خوای گەورە ئەیەوێت ئافرەت خۆی بپارێزێت، و پارێزگاری لە ئابڕووی بکات، ئەوەندە ئابڕوو بەرزبێت کەس توانای لەکەدارکردنی نەبێت،

بەتایبەتی ئەوگورگانەی کەلەپێستی بەشەردان، کەبەدوای ئابرووی ئافرەتدا دەگەڕێن و وکو نێچیرێك ڕاوی بکەن، وپاشان فڕێی بدەن و پشتی تێبکەن، وە ئەوانە زۆر لەوە ڕیسواو قێزەون ترن کەوا ئافرەت خۆی پێشکەشیان بکات بەشێوەیەکی سوك و بێ نرخ، گوێیان لەدەنگی بێت کاتێك ئارەزووی بیستنیان کرد، وەسەیری شکل و شێوەی جوانی بکەن هەرکاتێك ویستیان، وەچێژ لەجوانی یەکەی وەربگرن، وەلەکۆتاییدا کاری نادروست و ناڕەوای لەگەڵدا بکەن و کاتێك کەئیشیان پێی نەما فڕێی بدەن، پاش ئەوەی کەوا ناوبانگ و ناموسیان لەکەدارو پیس کرد.

**سێیەم:** کچی ساویلکەو خۆش باوەڕ، بەتەنها ئەوە باوەڕ بەگەنجێك دەکات کەبەسوك و بێ نرخ سەیری ئەو ئافرەتە بکات و بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵدا دەکات، چونکە ئەگەر گەنجێك ڕێز لەئافرەتێك بگرێت و بیەوێت هاوسەرداری لەگەڵدا بکات بەوشێوازە قسەی لەگەڵدا ناکات، بەڵکو دەچێتە لای کەس وکارەکەیی و داوای ئەکات، بۆیە پێویستە لەسەر کچی ڕێزدار واسەیری خۆی بکات کەجێگەی ڕێزو پلەوپایەیە، وە ڕێگەنەدات بەوگەنجانەی بەتەنها دوای تێرکردنی ئارەزووەکانیاندا دەگەڕێن، لەیەکەمجارەوە حەیای خۆی بەرز ڕابگرێت، تەلەفۆن نەکات بۆگەنجان و ڕازینەبێت کەوا کەس تەلەفۆنی بۆبکات.

**چوارەم:** بەهەموو ئافرەتان دەڵێم: بزانە ئەوانە مەبەستم پیاوانە کەوا ڕێز لەوئافرەتانە دەگرن کەبەوشێوەیە لەگەڵ پیاواندا نادوێن و خۆیان سوك ناکەن لای هەموو کەسێك و ڕێگە نادەن مەگەر کەسێك نەبێت کەدێت بۆلای کەس وکاریان بەمەبەستی داواکردنیان و پاشان هاوسەرگیریان،وە پیاوان زۆر ڕقیان لەئافرەتێکە کەوا ڕازییە بەوشێوەیە لەگەڵ پیاواندا قسە بکەن بەتەلەفۆن، چونکە ئەوپیاوانەی ئەمەڕەشەفتاریانە کەکاریان وایە ئافرەتیان دەوێت تەنها بۆتێرکردنی ئارەزووەکانیان دەوێت (وەکو ڕویداوە لەگەڵ ئەم کچەی کەپرسیارمان لێدەکات)، وە بزانە کەئەم پیاوانە باسی ئەوجۆرە ئافرەتانە دەکەن لەکۆڕو کۆبونەوەکانیان، وەتیایاندا هەیە کەدەڵێن: ناتوانم ئافرەتێك بکەمە هاوسەری خۆم کەلەگەڵ گەنجاندا قسەی کردبێت بەتەلەفۆن، چونکە متمانەی پێناکرێت وەکو هاوسەرو پاشان دایکی منالی، ئایا ڕازیت ئاوەها بێ نرخ و سوك بیت بەم ڕادەیە؟.

**پێنجەم:** زۆرکات ئافرەت بووە بەهۆی گومڕاکردنی ئافرەتانی تر، بەتایبەتی هاوڕێ، لەم بوارەدا گەر ئافرەتێکی خراپ و بەدڕەوشت بوو دەیەوێت کەسانی تریش وەکو خۆی لێبکات، تاوەکو کەسانی تریش جیاوازیان نەبێت لەگەڵیدا بەهۆی ئابڕویانەوە، لەبەرئەوە هاوڕێکەت لەهەوڵی ئەوەدا بوو کەوەکو خۆی بەدڕەوشتت بکات، وەهەر ئەو بوو هەموو شتێکی ڕێك دەخست، وە

ڕێکەوت لەگەڵ ئەو گەنجە خراپەدا بۆ خراپکردنی تۆ، چۆن پێشتر هاوڕێکەتی خراپ کردبوو، ئەمە بەئاشکرا دیارە بۆم. وەباوەڕناکەم کەسێك چیرۆکەکەتی خوێندبێتەوە پێچەوانەی قسەکانم بەڕاست نەزانێت لەم کاردەدا، وەلەبەرئەوە پێویستە ئافرەتی داوێن پاکی ڕێزدار کەهاوڕێیەتی ئافرەتانی خراپ نەکەن، وەخۆیان لێیان بپارێزن، وەباسی شتە تایبەتی‌یەکانی ژیانی خۆی بۆنەکات، لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە کەئەم ئافرەتەی پرسیارمان لێدەکات واباسی ئەو هاوڕێیەی دەکرد کەزۆر بەئەمەك و وەفایە، وە ئەو یارمەتی دەدات لەکاتی تەنگانەو ناخۆشی‌دا، ئایا جگە لەئەو هاوڕێی خراپەت کەسێکی‌تر خستیتیە ناخۆشی‌و تەنگانەوە؟ تا بیرت لەخۆکوشتن دەکردەوە، خوای گەورە تۆڵەی لێبکاتەوە بەوەی کەشایستەیەتی.

**شەشەم**: دروست نی‌یە ئافرەت تێکەلاوی پیاو بکات‌و خەلوەتی لەگەڵ بگرێ، وە ئەم چیرۆکە پڕئازارە یەکێکە لەو ڕوداوە زۆرانەی کەڕۆژانە دووبارە دەبنەوە.

وە ئەوانەی کەڕێگە بەتێکەلاوی دەدەن، ئەوانە هۆکاری یەکەمن لەڕودانی ئەو هەموو کارەساتە ناخۆشانەو وێران کردنی مالان بەهۆی خراپ کردن‌و تێکدانی گەنجەکان لەهەردوو ڕەگەز، وە پێغەمبەری‌خوا(د.خ) فەرمویەتی:( کلکم راع وکلکم مسئول عن رعیته)، واتە: هەمووتان لێپرسراون، وە هەمووتان بەرپرسن لەوانەی کەلەژێر چاودێری ئێوەدان.

وەدەمەوێت بەهەموو ئەوانە بڵێم کەلێپرسراون بەتایبەتی باوکان: کچەکەت دوور بخەرەوە لەوشوێنانەی تێکەلاوی تێدایە، ئەگەر دەتەوێت پارێزگاری لەئابڕووی کچەکەت بکەیت، وە بڕوای پێ‌مەکە کاتێك کچەکەت پێت دەڵێت: کەئاوڕ لەکەس نادەمەوە، بڕوای پێ‌مەکە ئەگەر تۆ بەرژەوەندی ئەوت دەوێت‌و پارێزگاری لەئابڕووی ئەو دەکەیت، وەئەگەر ویستی خراپەکاری‌و وێرانکاریت هەیە ئەوە بڕوای پێ‌بکە.

## کچی مەسینجەر ( چات کردن )

من کچێکم لەئەوپەڕی گەنجێتی‌دام، ئینتەرنێت بەکاردەهێنم وەکو هەموو کچێکی‌تر، جارێك لەجاران کەسێکم هێنایە مسنجرەکەم (مالپەڕی چات کردن)، وەلەگەڵ ڕۆژگاردا زۆرم خۆش ویست، وەزۆر بێ‌تاقەت دەبووم ئەگەر ڕۆژێك گفتوگۆم لەگەڵ نەکردایە، ئێوە هەست بەوەناکەم کەمن چەندە خۆشم ئەویست. وەزۆرکات داوای لێم ئەکرد کە بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵدا بکەم، وەمنیش بەتوندی داواکەیم ڕەت ئەکردەوە، وەزۆر هەولی‌دا قسەی لەگەڵدا بکەم بەتەلەفۆن، بەلام لەبەرئەوەی من مرۆڤێکم جیّی متمانەی هەموان بووم ئەمەم ڕەت کردەوە، وەبڕوام نەبوو

کەپەیوندیم هەبێ لەگەڵ گەنجێکدا تەنانەت لە( مەسنجەر)ی ئینتەرنێتیشەوە بێت، پەیوەندی نێوانمان نزیکەی مانگێکی خایاند، وەمن مەسنەجەردکەی وەم خستە پاڵ مەسنجەرەکەی خۆم، وە ئەونەیدەزانی ئەمە خوشکمە، وەرۆژێك لەرۆژان پچڕا لەگەڵمداو قسەی لەگەڵما نەکرد زیاتر لەهەفتەیەك ... زۆر توڕەبووم لەوکاتەدا، بەڵام کەگەڕایەوە بڕوام نەکرد، چونکە گومانم دەبرد کەوازم لێبهێنێت، وەمن لەوماوەیەدا سووربووم لەسەر وازهێنان لێی، بەڵام ئەو هەندێ قسەی نەرمو نیانی بۆکردم کەوای لێکردم زیاتر پێوەی ببەسترێمەوە، وەلەکۆتایی قسەکانمان لەوڕۆژەدا داوای لێکردم بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ بکەم، وەمن داواکاریەکەیم ڕەت کردەوە، وە دوای ڕۆژێك (مەسنجەردکەم) کردەوەو لەوێش بوو بەڵام وەڵامی نەدامەوە، وەناچار بووم کە(مەسنجەر)ەکەی تایبەت بەخوشکەکەم بکەمەوە، هەرلەوکاتەدا بینیم کەوا دەستی کردووە بەدواندنو داوای (تعارف) ناسینم لێدەکات، لەوساتەدا هەستم بەناپاکی ئەوگەنجە ئەکرد، وە گفتوگۆم لەگەڵیدا تەواو کرد، وەئەو نازانێ کەمن کێم، وەپاشان لە(مەسنجەرەکەی) خۆمەوە قسەم لەگەڵیدا کرد، وەدوایی دەرچووم وەئەو نازانێ کەمن بووم لەشوێنو مەوقعێکی دیکەوە قسەم لەگەڵیدا کردووە، ڕێنمونیم بکەن بۆڕێی ڕاست خوا پاداشتی چاکەتان بداتەوە.

وەڵام:-

ئەو پرسیارەی لەمێشکمدا جێگیر بوو ڕاستەوخۆ لەکاتی خوێندنەوەی نمونەی ئەم کێشەیەدا ئەوەیە: بۆچی ئەم کەسەت وەرگرت لەناو مەسنجەرەکەتدا ؟

تۆخۆت دەربارەی خۆت دەڵێیت:( من کەسێکم جێی متمانەی هەمووانم)، وە سوربونت لەسەر ڕەت کردنەوەی قسەکردن لەگەڵیدا بەتەلەفۆن بەڵگەیە لەسەر زیرەکی تۆ،و سوربونت لەسەر پاراستنی ئەو متمانەیەی کەبەتۆ بەخشراوەو کەتۆی پێسەیر ئەکرێیت، وەمن جارێکیتر ئەگەڕێمەوە بۆسەر پرسیارەکەی پێشووم: بۆچی ئەم کەسەت هێنایە (مەسنجەرەوە) ؟ لەوانەیە بڵێی: بەبێ هودە هێنامە ناویەوە بەبێ هیچ مەبەستێك، بەڵام من باوەڕ ناکەم، وەوەڵامت ئەدەمەوە بەوەی کەتۆش وەکو هەرکچێك بەدوای کەسێکدا دەگەڕێیت کەپەیوەندی لەگەڵدا دابنێی وەکو هاوسەرو وادەبینیت کەکۆمەڵە پەڵنەرێکی ناوەکی لەناختدا رات دەکێشن بۆئەوەی قسە لەگەڵ کوڕدا بکەیت وەهەست بەهەمان شت ناکەیت کاتێك لەگەڵ کچێکدا قسە ئەکەیت.

وە ئەمە شتێکی زۆر ئاساییە، چونکە ژیان بەوە پڕدەبێتەوەو مانادار دەبێت کەژنو پیاو بەیەکەوە بن. وەبەوەش جوانو ڕازاوە دەبێت، بەڵام کاتێك ئەمە ڕوودەدات لەدەرەوەی بازنەی هاوسەرگیری. ئەوە تەنها بۆپڕکردنەوەی ئارەزووە دەرۆینیەکانە، پاشان ئافرەتەکە بەجێ دەهێڵرێت بەدەردو ئازاری خۆیەوەو لەوانەیە ئافرەتەکە بمرێتو هێشتا ئەوشتە بەسەریەوە

دەمێنێت‌و ناسڕێتەوە ، وەئەو ئافرەتــەی کەئاوا شــودەکات زۆر شــتی ژیـانی هاوســەرداری لەدەست دەدات کەچاوەڕوان بوو بۆی .!!

**خوشکی بەڕێزم**: کاتێك کچێك بیر لەکوڕێك دەکاتەوە، کاتێك خەونی پێوە دەبینێت، بـەڵکو کـاتێك بەمێشکی‌دا دێت کەسـێتی کوڕێکی دیـاریکراو .. ئەمانـە هـەموویان شـتێکی ئاسایین، چونکە ئـەو خەونانە زوو دەڕۆن، وە لەوانەیە ماوەیەك لەلای بمێنێت، بەڵام ڕوداوەکانی ڕۆژانەی ژیان لـەبیری دەبەنەوەو دەیشارنەوە، بەڵام ئەم کارە نائاسایی دەبێت کاتێك کە کچ لەهـەوڵی ئـەوەدا بێـت چۆن ئەم خەوانانە بکات بەشتێکی ڕاستەقینە لەژیانیدا، بۆیە پەیوەندی دەکات بەگەنجێکەوە لەیـەکێك لەڕێگەکانی پـەیوەندی کردنـەوە ( تەلـەفۆن ئینتـەرنێت .....) و ئـەم کـارە زۆر خــراپ دەبێـت کاتێك کچەکە بەدەم ئەو شتانەوە دەچێت بۆی داڕێژراوە تاوەکو بکەوێتە داوەکەوە !

**خوشکی بەڕێزم**:- ئایادەتوانم پێت بڵێم کەوا تۆ ئەوداوەی بۆت داڕێژرابوو بەدەمیەوە چویتەوتامت کردووە، بەڵام زیرەکی‌یەکەت وای لێکردی کەنەیهێشت بکەویتە ئەوداوەکەی کەبۆت نرابۆوە، بزانە کەتۆ ئەوکەسـەت وەرگـرت‌و هێناتـە لای‌خـۆت ... وەئەمــەش هەوەڵێکـە بۆگۆڕینــی خەونــەکانت لە(فارس الاحلام)شۆڕەسواری‌خەونەوە بۆڕاستی‌و حەقیقەت ..

وەلەیادت نەچێت کەتۆ ئەوکەسە ناناسـیت .. بۆیـە پێـی دەڵێـم(کـەس)و نـاڵێم(گـەنج) !! وەپاشـان لەوانەیە هیچ شتێك نەزانی دەربارەی ئــەو .. وەئـەوەی کەسـەرنجی تـۆی ڕاکێشاوەو پێـی سەرسام بویت، تەنها کۆمەڵێك پیتی ڕێکخراوە بەدەم یەکەوە کەلەیانەیەکدا ڕێك دەخرێ.

ئاگاداربە جارێکیــتر: تـۆ دەربـارەی ئـەو دەڵێیــت:( لەگـەڵ ڕۆژگـاردا زۆر خۆشـم ویسـت)، وەلـەدوای ئەمەش دەڵێیت:( زۆر بێتاقەت‌و بێزار دەبووم گەر ڕۆژێـك بـڕواو قسەی لەگـەڵدا نەکـەم، وەئێـوە نازانن کەچەندم خۆش ئەوێن !! ).

**خوشکی بەڕێزم**: پرسیارت لێ‌دەکەم ئەی کچـی ژیـرو زیـرەك: ئـەو پاڵنەرانـە چی‌بوون لەپشت ئـەم خۆشەویستی‌یە(شێتانەیی‌یەوە)؟ ئایا بەتەنها قسەکردن‌و گفتوگۆ (لەمەسنجەرەوە) ئـەم هەسـت‌و سۆزەی بۆدروست کردی؟ وەئەوەی ڕاستی‌یە ئەوکەسە زۆر لێزانانەو خاوەن ئەزمونانە زۆربەباشـی توانیویەتی کەچۆن ئەو هەست‌وسۆزە لای‌تۆ دروست بکات ؟ !

بەڵام زۆربەداخــەوە ئـەو خۆشەویستی‌یەی (کەئێمـە هەسـتی پی‌ناکـەین وەك تـۆ دەیلێیـت) ڕەگـو ڕیشەی (چەنـد وتەیەك) بووە باهەرئاستێکی هەبێت لەڕەوانبێژی‌دا .....

ئایا ڕاستـە خوشکی بەڕێزم کەکچ ئەگـەرچی زۆر زیـرەك‌و ژیریـش بێت (هەردەکەوێتـە نـاو ئەوداوەی کەبۆی دانـراوە) کاتێك گەنجێکی لێزان چەند وتەیەك ڕێك دەخـات‌و هـەر دەیلێتـەوە ...

کوڕە گەنجەکان باسی ئەوە دەکەن کەباشترین ڕێگـە بـۆ دەستەمۆکردنی کچانو ڕاوکردنیـان زیـادە ڕەویکردنـە لەپیاهەڵدانیان !! وەدەبڕینـی تینـی خۆشەویستـیـیە لـەدەرونیدا بـۆی، وە ئـەم جـۆرە ووتانـە وا لـەکچ دەکـات بیروهۆشـی نـەمێنیێوچاوەکانی بنوقێنـێ، بەداخـەوە بـەبێ هـۆشو بـیرو پەیپێبردنێك !

پێم بڵێ    خوشکی بەڕێزم

ئایا تۆ لەسەر شاشەی ئامێرەکەت هیچ جۆرە ووتەو قسەیەکی ترت بینیوە بێجگە لەمجۆرە وتانە؟!

پاشان تێبینی ئەوماوەیە بکە لەنێوان کچێکدا هەیە (کەتۆی) دەڵێیت دەربارەی خۆت (بڕوام نەبوو کەڕۆژێك لەڕۆژان من پەیوەندیم هەبێ لەگەڵ گەنجێکدا تەنانەت لەمیسینجەریشدا) !!!

وە لەنێوان کچێکدا (کەهەر تۆی دووبارە) دەربارەی خـۆت دەڵێیـت:( زۆر بـێزارو بێتاقـەت دەبـووم گـەر ڕۆژێـك بـڕواو قسەی لەگـەڵ نەکـەم، ئێـوە هەسـت ناکـەن کـەمن چـەندم خـۆش دەوێـت ! )

وەئـەوەی کـەوای لێـت کـرد کـە پێشبینی ئــەو بکـەی لـەنێوان تـۆو هـەر گـەنجێك هیـچ جـۆرە پەیوەندیـیەك بەهـەر شێوەیەك بێت دروسـت بێـت، ئـەوەبوو کـەتۆ ئامانجـەکانی ئـەو جـۆرە پەیوەندیانەت دەزانـی، وەلەوانەیـە گوێگرتنـت بوبـێ لەهـەواڵی ئەوانـەی بونەتـە قوربـانی بۆئـەم جۆرە پەیوەندیـیانە کەلەسەرەتادا زۆر بێتاوانانە بەدەردەکەون !!! وەئەوەی کەوای  لێـت کـرد زۆر خۆشت بوێت، بریتـیـیـە لـە پێویستی تۆبـۆ خۆشەویستی، وەبـەتوانای ئـەو کـوڕە بـوو کـەوا خـۆی پێشان بدات کەتۆی خۆش دەوێتو شێتو عەوداڵی تۆیەو بۆت سوتاوە ... ئەو بەتواناییە بوو کەوا پـەردەی لەسـەر بـیرو هۆشـی تۆداهێنـابوو ، کـەچی ژیـریو هۆشـی تــۆ بەتــەواوی دانەپۆشـرابوو، وەئەوەتا تۆ هەموو جۆرە پەیوەندی کردنێك پێـوەی ڕەت دەکەیتـەوە بەتەلـەفۆن، چونکـە هەسـت بەئاکامە خراپەکمانی دەکەیت .

خوشکی بەڕێزم:-

زۆر سەرم سوڕماوە لەوجیاوازیەی کەتۆ پێی هەڵدەسیت ...و لەوانەشە هەسـتت پێکردبـێ، کـاتێك کەبـەناو خۆشەویسـتێکی نادیـار لـەدەرگای دڵـت دەدات بەچـەند وتەیـەكو گفتوگۆیــەك لـەماوەی مانگێکدا، وەتۆش هەردوو دەرگاکەی بۆدەخەیتە سەرپشت، وەئەوکەسە نادیارەی کەلەدەرگای دڵتی داوە زۆر دڵخۆشـە بـەوەی کەهەسـت دەکـات تەڵەکەبازیـیەکـەی خەریکە سـەردەگرێت، بۆیــە داوای قسەکردنت لەگــەڵدا دەکـات بەتەلـەفۆن، چونکـە تەڵەکەبازیـیەکـەی کـاریخۆی کـرد، هەسـتت بەخۆشەویستی کـرد بەرامبـەر ئەوکەسـە، هەسـتی خۆتـت بۆدەبـڕی بەووتـەی نوسـراو، پاشـان لەهەوڵیئەوە دایە کەوچۆن داوی کۆتایت بۆبنێتەوەو بەپێیەکانی خۆت بتبات بۆناوی. ! !

وە ئەوخۆشەویستە بەردەوام سەرۆکایەتی شەڕێك دەکات لەنێوان گەڕانەوەو پەلاماردانداا، بۆیە پێویستی بەڕاهێنانو مەشق کردنە تالەکۆتاییدا پیلانەکەی بهێنێتەدی .. هەربۆیە تۆش وازهێنانی خۆتت ئاشکراکرد، ئەوکاتەی کەوازی لێهێنای بۆماوەی یەك هەفتەو سوربوی لەسەر وازهێنان لێی ....

بەلام ئەوئەمەی نەویست، ئەبینی کەگەڕایەوەو ئەمجارەیان بەشێوەیەکی ترو فێڵێکیتردوە کەخۆت بەوە دەریدەبڕی کەدەڵێیت:( چەند قسەیەکی نەرمو نیانی بۆکردمو زیاتر پەیوەست بووم پێوەی) وەمن جارێکیتر یادت دەخەمەوە کەئەم کارە هەمووی (قسەیە) لەسەر (قسە) وە ئەو بەلای تۆوە وەکو سیحربازێك وایە کەدەیەوێت بۆئەوانەی بەرامبەری کۆمەڵە شتێکی خەیاڵی لەبەرچاویان دەرببڕێت لەڕێگەی چەند فلیمێکی سیحرییەوە ... دەبینیت ئەو پاش ئەوەی تۆی دەستەمۆ کردووە دەگەڕێتەوە بۆسەر داواکاییەکەی یەکەمی ئەویش قسەکردنە لەگەڵت بەتەلەفۆن.

خوشکی بەڕێزم :-

ئەگەر یەکێك پێی ووتی: کەئەم کەسە تۆ لەگەڵیدا لەئەزموندای، خۆشەویستی خۆی بۆیەکێکیتر جگە لەتۆ دەربڕیوە ئەوە تۆ دەت ووت لەژێر کاریگەری وتە سیحرییەکانیدا ئەمە ڕاست نییەو نەگونجاوە ! بەلام ئەوەتا خۆت ئەمەت ئاشکراکردو لەماڵی خۆتاندا کاتێك کەلەگەڵیدا دوای لەئامێری خوشکەکەتەوە وەك ئەوەی کەتۆ نێچیرێکی تری ....

خوشکی بەڕێزم :-

ئایا ڕاستە تۆ تاوەکو ئێستا بڕوات وایە کە ئەو خۆشی دەوێیت ؟ وەمن هەرچەندە پرسیارەکەت لەبەردەستمدایە بڕوام نییە کە تۆ تائێستا بڕوات وابێت ! ! !

خوشکی بەڕێزم :-

سوپاسی خواکەت بکە کەتۆ بەپشتیوانی خوای گەورە قسەکردنی تەلەفۆنت لەگەڵیدا ڕەت کردۆتەوە، وەمتمانەت هەبێت کەئەم کارەی لەگەڵ دەیەها کچیتر کردووە وەك چۆن لەگەڵ تۆدا کردویەتی ... وەئەو ووشانەی کەتۆی پێدەستەمۆ کردووە وەکردویەتی بەخۆراکی گیانت کۆمەڵە ووشەیەکن زۆر بەبێزاریو بێگیانی ئەینوسێت لەبەر زۆری دووبارە کردنەوەیان ... وەلەوانەیە لەپشتی ئامێرەکەیەوە (کۆمپیوتەرەکەیەوە) زمانی دەرهێنابێت. کاتێك هەست بە

ووتەکانی خۆی دەکات لە (مسنجر)دا وەسەری لەووتەکانی خۆی سوڕماوە کەوا تیایدا هەست بەخۆشەویستی‌یەکی زۆر دەکات کەبەسەر دەرونیدا زاڵە ! ! !

لەکۆتاییدا :- تۆداوای ڕاوێژی منت کردووە ... خێراکە بۆ سڕینەوەی لە(مسنجر)ەکەتدا لەپێش ئەوەدا سڕینەوەی لەدڵتدا ... بەئومێدی ئەوەی کەئەم ڕووداوە خۆراکێك‌و چێژێك بێت بۆزیاتر خۆپاراستنت لەم داوانەی کەبۆت نراوەتەوە لەخاوەنەکانیان ... و خوای گەورە ڕێنمونیت بکات بۆهەموو چاکەیەك‌و بتپارێزێت لەهەموو خراپەیەك، وەوات لێبکات بینا بیت بەوەی کەچاکە.

## بەلای شەیدایی‌و بەدڵداچوون

عبدالفتاح دەڵێت: من سەرۆکی بەشێکم لەیەکێك لەکۆمپانیا گەورەکاندا بۆماوەیەکی دوورودرێژ، یەکێك لەهاوڕێ کچەکانم بەدڵدا چوو، نەك لەبەر جوانی‌یەکەی ، بەڵکو لەبەر دڵسۆزی بۆکارەکەی، زیرەکی‌و سەرکەوتنی لەبوارەکەیدا، بێجگەلەوەش کەمرۆڤێکی زۆر بەڕێزە، وەزۆر داپۆشراوە، ئاوڕبەلای هیچ شتێك ناداتەوە جگە لەکارەکەی.

ئەم بەدڵداچوونە گۆڕا بۆپەیوەست بوون پێوەی، وەمن پیاوێکی ژندارم‌و لەخوا دەترسم، وەهیچ فەرزێکم نەشکاندووە، هەست‌و سۆزی خۆمم بۆدەربڕی، جگە لەپشت تێکردن نەبێت هیچی ترم لێنەبینی، وە ئەویش ئافرەتێکی بەمێردەو چەند منداڵێکی هەیە، وەئەو هیچ بیانویەك نادۆزێتەوە بۆدانانی پەیوەندی لەگەڵیداو لەژێر هیچ ناوێکدا، هاوڕێیەتی، برادەری، بەدڵاچوون ..... هتد.

وەچەندەها بیری چەپەڵ بەمێشکمدا دێت جاربەجارێك، لەناخی دڵمەوە ئاواتی ئەوەدەکەم کەمێردەکەی تەلاقی بدات، بۆئەوەی بۆمن بێت، وام لێهاتووە زۆر توندبم لەگەڵیدا لەکارەکەیدا، وەلەئاستی بهێنمە خواردوە لای بەڕێوەبەرکانم، وەئەمەم بەجۆرێك لەتۆڵەکردنەوە دەزانی لێی ... وەئەو ئەمەی لێم وەردەگرت بەسنگێکی فراوانەوە بێ‌هیچ ناڕەزایی دەبڕینێکیان قسە کردنێك ... وەئەو هەر ئیشی دەکرد ... کارەکانی ئەو بەتەنها دەبری پلەوپایە بەرزەکانی ئەون، وەخۆشی ئەمەی باش دەزانی.

وەلەگەڵ ئەوەشدا زیاتر پەیوەست دەبووم پێوەی، وەبەگوێرەی ئەوەی کەمن زیاتر پەیوەست دەبووم. ئەو ئەوەندە دووردەکەوتەوە لێم ... وەمن وام هەست دەکرد کەدەروونی من هیچ شتێکی

کەوابوو لەخوا بترسە، لەخوای گەورە، وەژیانی خۆشیان لێتاڵ مەکە، وەئامۆژگـاریت دەکـەم بـەوەی کەبگـەڕێیت بەشوێن ئیشێکی‌تردا، دووربێـت لەوئافرەتـەوە، وەهیـچ چارەسـەرێکی دیکـەم لانی‌یـە بۆئەم جۆرە کێشانەو هاوشێوەکانیان، بێجگە لەدوورکەوتنەوە، وەهەرئەوە چارەسەرێکی زۆرباشـە، بەپشـتیوانی خـوای گـەورە، وەئـەوەش پـاش تـەوبــەکردن‌و داوای کۆمــەك کــردن لــەخوای گــەورە بەکردنی کاری چاك‌و ڕێزدارو ئارام گرتن لەسەر نەکردنی بێفەرمانی خوای گەورە.

چونکە لەبەرئەوەی گەیشتن بەئامانجەکـەت لەوپـەڕی ئەسـتەمی‌دایە، پارێزگـاری لـەڕێزو شـەرەفی خۆت بکەو ئاگـاداری ئـارەزووە خراپـەکانت بـە لەوەسوەسـەی شـەیتان، چونکـە دوژمنـی ئاشـکرایە بـۆت، وەلەوفەرمودەیـەی کـەئیمام أحمـد گێڕاویەتی‌یـەوە لەمسندەکەی لەئەبی‌ئومامـەوە دەڵێـت:( گەنجێك هات بۆلای پێغەمبەری‌خوا(د.خ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(د.خ) مۆڵەتم بدە زینا بکەم، وەئەوانەی لەدەوروپشتی بوون هەمویان بەقسەی ناخۆش وەڵامیان دایەوەو ووتیان: بەسە بەسە بـەواتای قسـە مەکـە - ، وە پێغەمبـەر(د.خ) فـەرمووی نزیـك بـەرەوە: گەنجەکـە لێـی نزیـك بـوودو دانیشـت، پێغەمبـەر(د.خ) پێـی فـەرموو : ئەمـەت پێ‌خۆشـە بـۆ دایکـت ؟ ووتـی: نــەخێر بــەخوا خوابمگێڕێ بــەفیدات ، وە فــەرموی وەخــەڵکیش ئەمــەیان پــێ‌خۆش نی‌یـە بۆدایکـەکانیان)، وە فـەرمووی ئەمـەت پێ‌خۆشـە بۆکچەکـەت ؟ ووتـی: نـەخێر ، بـەخوا ئـەی پێغەمبــەری خـوا، خـوا بمگــێڕی بــەفیدات، فــەرمووی: وەخــەڵکیش ئەمــەیان پــێ خــۆش نی‌یــە بــۆ کچــەکانیان، وەفـەرمووی(د.خ): ئەمـەت پی‌خۆشـە بـۆ خوشـکەکەت ؟ ووتـی: نـەخیر، خـوا بمگـیری بـەفیدات، فەرمووی : خەلکیش ئەمەیان پێ‌خۆش نی‌یە بۆ خوشکەکانیان).وە فەرمووی: ئەمەت پێ‌خۆشە بۆ پورەکانت (خوشکی باوك)؟ ووتی: نەخیر ، بەخوا ئەی پیغەمبـەری خـوا، خـوا بمگیری بـەفیدات، فەرمووی: خەلکیش ئەمەیان پی‌خۆش نی‌یـە بـۆ پورەکانیـان)، وەفـەرمووی: ئەمـەت پی‌خۆشـە بـۆ میمکەکانت(خوشکی دایك) ؟ ووتی: نەخیر ، بەخوا، خوا بمگیری بـەفیدات، فـەرمووی: خـەلکیش ئەمەیان پێ‌خۆش نی‌یە بۆ میمکەکانیان)، پاشان راوی ئەلێ: پیغەمبەر (د.خ) دەسـتی خسـتە سـەر سەری گەنجەکەو فەرمووی: خوایە لەگوناهی خۆش ببەو دلی پاك کـەرەوەو داوینـی بپاریزە )، وە دەلیت: لەدوای ئەوە ئەو گەنجە ئاوری لەهیچ شتێك نەدەدایەوە

والسلام

## نامەیەك لەژنیكەوە

من ئافرەتیكم سوپاس بۆخودا شووم كردووە بەپیاویكی دیندار، كیشەم ئەوەیە كاتێكە فیری بەكارهینانی ئینتەرنیت بووم، چومە ناو مەوقعی چات (دواندن)ەوە، لەویدا گەنجیكنم ناسی، زۆر خۆشم دەویستو میردەكەم بەمەی نەدەزانی، وەمن نیستا دەمەویت رزگارم بیت لەدەسیو وەلەدەست ئەم كیشەیە، وەمن زۆر پەشیمانم هەست بەترسو دلەراوكێ دەكەم، وەنامەویت میردەكەم بەم كارەم بزانیت، چیبكەم ؟

زۆر سوپاس

**وەلام:-**

خوشكی بەریز: هەرچەند تۆ دەلییت: كەمیردەكەم دیندارە، وەئەمە شتیكی باشە، من بەدوری نازانم چەند كەلینیك لەژیانتدا هەبیت، لەگەلی وەكو ( زۆر لەمالْ نەبوون، یابیدەنگی، یاتیر نەبوونی سۆزو خۆشەویستی ....) لەوانەیە ئەم شتانە یان هەندیكیان پالنەرت بوبیتن یەك لەدوای یەك بۆكەوتنە ناو ئەم زەلكاوەوە، وەئەگەر ئەمەی پیشبینم كرد راست بیت ئەمە ئەوە ناگەیەنیت كەتۆ بڕۆی ئەم كارە ساویلكەیە بكەی چونكە تۆ ئافرەتیكی پیگەشتویت لەرووی بیرو هۆشەوە، ئەگەر مرۆڤ بگاتە بەئەوپەری برسیەتیش خەلكی بەباشی نازانیت وەرێ پێنادەن دزی بكات، یان مالەكانیان ببریت، وەزۆریك هەبوون كەكەوتنە ئەم زەلكاوەوە توانای دەرچونیان نەبوو خنكان ...

جالەبەر ئەوەی سوپاسی خودا بكە كەوتنەكەی تۆ تەنها پیسیەك بوو، وەدەتوانیت پاشماوەكەی بەصابونی تەوبەو گەرانەوەی راستەقینە لابەری، وەكاتیك ئامارژە بەوەدەكەیت كەمیردەكەت دیندارە سوپاسی خوات كرد ... وە ئەمە ئاماژەیەكی ئاشكرایە بەوەی كەتۆ بەشیوەیەكی گشتی لێی رازیت بەلای كەمەوە، وەكاتیك دەلییت ( كەسیكم ناسیو زۆر خۆشم ویست) ئاگاداربە كەتۆ لەگەلْ یەكیكدا گفتوگۆت كردووە هیچ شتیك نازانیت دەربارەی ئەو، تەنها ئەوەندەبیت كەئەو هەستیكی وای بۆدروست كردووی (بەهۆی چەند ووتەیەكی ناسكەوە) كەوا زۆر خۆشی دەوییت !

لەگەلْ ئەوەشدا تۆبەدەربرینی (زۆر) خۆشەویستی خۆتی بۆدەردەبری !! وە جیاوازیەكی زۆری هەیە لەنیوان ئەوەی كەتەنها گویت لەچەند ووشەیەكی خۆشەویستی ببیتو خۆشت بویت، چونكە تۆئەمەت لای میردەكەت بزركردووە، وە لەنیوان ئەوەی كەتۆ ئەوكەسەت خۆش بویت وەك خۆی ... بەواتایەكیتر لەوانەیە بەهۆی هەلەیەكی تایبەتی یا شتیكی لەوجۆرە میردەكەت ئەو

یەکێکدا گفتوگۆت کردووە هیچ شتێك نازانیت دەربارەی ئەو، تەنها ئەوەندەبێت کەئەو هەستێکی وای بۆدروست کردووی (بەهۆی چەند ووتەیەکی ناسکەوە) کەوا زۆر خۆشی دەوێیت !

لەگەڵ ئەوەشدا تۆبەدەربڕینی (زۆر) خۆشەویستی خۆتی بۆدەردەبڕی !! وە جیاوازیەکی زۆری هەیە لەنێوان ئەوەی کەتەنها گوێت لەچەند ووشەیەکی خۆشەویستی ببیتو خۆشت بوێت، چونکە تۆئەمەت لای مێردەکەت بزرکردووە، وە لەنێوان ئەوەی کەتۆ ئەوکەسەت خۆش بوێت وەك خۆی ... بەواتایەکیتر لەوانەیە بەهۆی هەڵەیەکی تایبەتی یا شتێکی لەوجۆرە مێردەکەت ئەو بوارەی کەپێویستی بە زمانێکی سۆزداریە نەیتوانیوە بۆتیپڕبکاتەوە .. بۆیە بەچۆڵی ماوەتەوەوو تۆش بەو ووتانە پڕی دەکەیتەوە . . . .

وادابنێ ئەو کەسە (نادیارە) کەئەو ووتانەت بۆدەنێرێت .. وەتۆش کەسەکەو ووتەکانیت تێکەڵ بەیەکتری کردووە وای لێکردووی ( کەزۆر خۆشت بوێت ) .. لێرەدا پرسیارێك قسەکانم پێدەبڕێت تاوەکو بڵێیت: ئەی مێردەکەت، ئایا پێشتر خۆشت نەدەویست ؟ یان خۆشەویستیت بۆئەو کەمە ؟ وەمن دڵنیام کاتێك باسی دینداریەکەی دەکەیتو سوپاسی خودا دەکەیت لەسەر ئەوە، تۆخۆشت دەوێت، بەڵام لەوانەیە کەمو کورتییەکەیت خۆشناوێت لەپڕکدنەوەی بوارە سۆزداریو دەروونییەکەت ... وە ئەوەی گومانی تیادا نییە ئەو گەرمو گوڕی خۆشەویستییەی کەئەو کەسە (نادیارە) بۆتی دەردەبڕیت ئەگەر بێتو مێردەکەت بۆتی دەربڕیایە ئەوا بەشێوەیەکی بێسنوور خۆشت دەویست، ئەوەتە تەنها بۆلای ئەو دەهاتیتو هەموو کەلێنەکانت دادەخست لەڕووی کەسانی تردا !! وەلەوکاتەوەی کەبیرتی دەخەمەوە ناڵێم فێرت دەکەم کەئەو پیاوەی کەقسەت لەگەڵدا دەکات لەڕێگەی چاتەوە بازرگانی خۆشەویستییە، بەواتای ئەوەی کەئەو لەکەمترین بوارەکانیدا تواناکانی بەفیڕۆ دەدات ئەگەر لەپشتی شاشەوەش بێت !!!

وەلەزۆربەی کاتەکانیشدا هەموو مەبەستو ئارەزووەکانی لەم سنورەدا ڕاناگرێت، وە ئەو زۆرکات ئەگەرەوای پێشان دا بۆت کەتەنها تۆ لەدڵیدا نیشتەجێ بوویت ... ئەوە بزانە کەئەو یەك بەدوای یەکدا چەندەها هاوشێوەی تۆی پشت گوێ خستووەو وەکو چۆن بڕوات بەسەر ڕێگایەکدا زۆر بەخێرایی !!!

ئەوکەسە(نادیارە)ی ووتەکانی خۆشەویستی بەکار دەهێنێ بۆ هەڵخلیسکاندنی هەموو (ئافرەتێکی بێدەسەڵات) ئەوانەی کەلەپشتی شاشەوە ڕاوەستاون لەدڵیاندا ( گوڵێکی پوکاوەی سیس بوو ) هەیە چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆرێکیانە. ئەگەر ڕاستیش نەبێت تاوەکو ببوژێتەوەو سەرهەڵداتەوە، دەیەوێت لەڕێگای ئەو ووشە خۆشەویستیانەی ڕووکەش کراوە تۆڕێك دروست بکات بۆڕاوکردنی (نێچیری لاواز ) لەناو ئافرەتاندا.

وەئەم کارە ناوەستێت لەسنووری ئەم ئامانجە، وەلەپاش ناڵەناڵی ووتەکانیەوە شۆڕ دەبێتەوە بەردو باسکردنو پیاهەڵدان بەجوانی قەدو باڵاو بەشەکانی تری لاشەی ئافرەتی بەناو خۆشەویست تاوای لێبکات ئارەزووی جنسی خۆی لەگەڵیدا پڕبکاتەوە لەپشتی شاشەوە ... وەکاتێك ئافرەتەکە کەوتە ئەم کارە نارەوایەوە .. بەوە ڕاناوەستێ کەژیانی هاوسەرگیریو خێزانداری لێبشێوێنێت بەتەنها .. وەلەوانەیە خۆت شتت خوێندبێتەوە دەربارەی هەندێکیان، بەڵکو لەوانەیە پاڵنەرێ بێت چونکە ئەو سەرخۆش کراوە بەخۆشەویستی‌یەکی خەیاڵی بۆکەوتنە ناو کاری خراپو بەدڕەوشتی .. پاش ئەوەی لەمێشکی خۆیدا کەشتی‌یەکی خەیاڵی دروست کردبوو، کۆتایی بەوەدێت کەبەتوندی خۆی کێشابێت بەتاشەبەردەکانی واقعو ڕاستی‌دا، بەڵام پاش ڕوخانو وێرانی بەصرە وەکوچۆن وتراوە، وەئەو خۆشەویستی‌یە شەیداییە ئەگوازرێتەوە بۆ کەشتی‌یەکی‌تر زۆر بەلەسەرخۆیی، بی‌ئەوەی کەدەست بەرزبکاتەوە بۆخوا حافیزی کۆتایی، چونکە ئەمەپیشەیەتی وەکو بازرگانێکی جنسی زۆر قێزەون ...

بەڕێزەکەم :_ ئایا ئێمە ئەوەندە ساویلکەین بڕوامان هەبێت بەڕاستێتی ئەم جۆرە کردارانە ؟ تاوەکو ببینە یەکێك لەقوربانیەکانی ! ! وە ئایا پەند وەرگرتنو وانە سوودی دەبێت ئەوکاتە ؟! !

ئایا ساویلکەیەتی وای لێکردویین لەگەڵ ئەوەی زۆر لەبەرسەرهاتی ئەو قوربانیانەمان بیستووە کەوا دابنێین خۆشەیستی‌یەکەی ئێمە لەجۆرێکی زۆر جیاوازو ڕێزدارە ؟ ! بۆچی هیچ ڕێگەیەکی تری نەدۆزیەوە بێجگە لە ئینتەرنێت تاوەکو لێوەی بمان ناسێت ؟! وە ئایا ئەوکەسە نازانێت کەئەو ئافرەتەی قسەی لەگەڵدەکات ئافرەتێکە نایناسێتو هیچ شتێك دەربارەی نازانێت، لەگەڵ ئەمەشدا دەڕوات لەگەڵیداو ستایشی دەکاتو پیای‌هەڵدەداتو شەیدای دەبێت، بەهۆی دەبڕینی چەند ووشەیەکی ئافرەتەکە کاریگەری لەسەر دڵی کردووە تائەو قسانەی بۆدەبڕیوە.

**خوشکی بەڕێزم:-٠**

ئەم پرسیارەت ...... ئارەزووی ڕزگاربونت .. بەڵگەیە لەسەر بەخەبەرهاتنەوەی هۆشو بیرت لەوخەوەی لێت کەوتبوو، وە ئاواتەخوازم وەڵامەکەم پاڵنەربێت بۆبەتەواوی خەبەربونەوەتو پاڵنەری هزرو بیرت بی‌بۆ هەستانت بەئەرکی خۆت لەڕێگەگرتن لەخراپەکاری.

سوپاسی خواکەت بکە کەمێردەکەت جێی تۆی لەدڵی خۆیدا کردۆتەوەدو سیقەو متمانەیەکی بێسنوری پێبەخشیوی، ئینتەرنێتی لەبەردەستتدا داناودو بەبیریدا نەهاتووە کەتۆ بیرلەشتێکی ئاوا بکەیتەوە، نەوەکو تۆ ئێستا کەوتویتەتە ناویەود، وەردوە سەرخۆت بەیەکجاری ... تاوەکو هەزروبیرت بەئاگابێتەوە لەو خەوەی لێی کەوتووە، وەئاواتمە کەدرێژە نەکێشێ .. ئەو ئارەزووە

لەوە خراپتر بۆدروست دەكات، لێرەدا ئەوەی گرنگە ئەوەیە كەچارەسەری كێشەكانت بكەی بەشێوەیەكی ڕاستو دروست . . .
مێردەكەت نزیكترین كەسە بۆتۆ ...و پرۆژەكانتان هاوبەشە، لەسەرووی هەموویانەوە منداڵەكانتان لەگەڵ هاتنە دنیایان ئەگەر تا ئێستا نەهاتبێتنە دنیاوە وە پەروەردەكردنیان... وە ئەگەر كرانەوە بەرووی یەكتردا پەیوەندییەكانتان بەرێوە نەبات ....و مامەڵەیەكی جوانو ڕێك لەگفتوگۆتاندا نەبێت ... وەهەستو سۆزێكی قوڵ لەناخی دڵەوە بۆلای یەكترتان ڕانەكێشێ، وەدەست پێشخەری تایبەت لەیەكێكتانەوە وە پاڵنەری ئەوی تریان بێت بۆبەشداری كردن تیایدا، ئەگەر وانەكەن ئەوا ژیانی هاوسەرگیریتان پاش ماوەیەك خۆشییەكەی لەدەست دەدات، وەوای لێدێت كەهەریەك لە ژنومێرد لەڕێگایەكی جیاواز لەیەكتردا بڕۆنو هەلگری بیرو بۆچونی جیاواز بن، لەوانەیە تەنها شتێك كەكۆكەرەوەی هەردوكیان بێت تەنها سەرجێیەكی ساردو سڕبێت .
**دواووتە**:- خوشكی بەڕێزم: كاتێك دەچیتە ناو جیهانی ئینتەرنێتەوە دەبێت چاوكراوەو ئامانجدار بیت بۆهێنانەوەی سودێكی زۆر .. لەوانەیە كەمترین زەرەرێك كەدەیگەیەنین بەخۆمان بەفیڕۆدانی كاتە لەژیانماندا و لەڕۆژی دواییدا پرسیارمان لێدەكرێت لەسەری.
خوای گەورە پەردەی بێئاگایی لەسەر چاوەكانت لابەرێتو بتگێڕێتەوە بۆسەر ڕێگای ڕاست

## بەتەنیابوون لەگەڵ داواكەردا

دەقی پرسیارەكە:- چووم بۆداوای كچێك لەكەسو كاریو ڕازی بوونو بەوبۆنەیەوە ئاهەنگێكمان گێڕا، بانگهێشتی خزمو كەسو كارمان كرد، وە ئەم داواكردنەو ڕازی بوونی كەسوكارمان ڕاگەیاند، وەسورەتی فاتحەمان خوێند، وەدەنگی دەفەكان بەرزبونەوە، ئایا ئەوە دانانرێ بەڕازی بوون؟ وە ئەم ئاشكراكردنە بەگواستنەوە دانانرێت، لەڕوانگەی شەرعەوە؟ وەئایا دەتوانم بەتەنها لەگەڵ ئەوكچەی داوام كردووە دابنیشم؟ لەكاتێكدا بارودۆخی من ڕێگەم پێنادات بەڕەسمیو لەلای مەلای ڕێپێدراو لەنوسراوی حكومیدا تۆماربكرێ ؟
وەڵام:- ناوی فەتوادەر( دوكتۆر یوسف عبدالله قەرزاوی):
بەناوی خودا، سوپاس بۆ خودا، وەدرودوسڵاو لەسەر پیغەمبەری خودا(ﷺ)، لەپاشان:-
ئەو كچەی كەداوات كردووە بێگانەیە بەداواكەر تاوەكو مارەی دەبڕێت ، وە ئافرەتەكەش ناچێتە بازنەی هاوسەرگیرییەوە ئەگەر بەعەقدی شەرعی مارە نەبڕدرێت، وە گرنگترین لایەنی سەرەكی لەعەقدەكەدا (ئیجابو قەبوڵ)ە، ئەم دوو وشەیە ناسراوو كارپێكراوە لەنەریتو شەرعدا.

وەلەبەرئەوەی ئەم عەقدە به إيجابەکەی‌و قەبولەکەیشیەوە پیك نەهاتووە، ئەوا هاوسەرگیری دروست نەبووە، نەبە پیی نەریت عرف و نەبەپیی شەرع‌و قانونیش، وە ئەو کچە داواکراوە هەر بەبێگانەیی أجنبي دەمینیتەوە بۆئەوکەسەی داوای کردووە، ریگەی بەتەنیابوونی پێنادریت لەگەلیدا، وەهەروەها سەفەرو گەشت کردن لەگەلیدا بەبێ بوونی یەکیك لە کەس‌وکارە نزیکەکانی وەکو باوك‌و برا دروست نی‌یە . .

**بەریز شیخ یوسف قەرزاوی دەلیت :-**

داواکردن: لەزمانەوانی‌و شەرعیشدا شتیکی جیاوازە لەمارەکردن، چونکە داواکاری پیشەکی‌یەکە بۆئەوکارەو رێخۆشکەرە بۆسەرگرتنی، وەهەموو پەرتوکەکانی زمانەوانی جیاوازیان کردووە لەنێوان هەردوو ووشەی (داواکردن)و(مارەکردن) و تەنانەت نەریتی کۆمەلایەتیش جیاوازی کردووە لەنێوان پیاوێکی داواکەرو پیاوێکی مارەبڕ، وەشەریعەتیش جیاوازی کردووە لەنێوانیاندا بەشێوەیەکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرا، داواکردن تەنها بریتی‌یە لەئاشکراکردنی ویست‌و ئارەزوو بۆ مارەکردنی ئافرەتێکی دیاریکراو، وەمارەبڕین عەقدێکی بەتین‌و پەیمانێکی توندوتۆلە، سنورو مەرج‌و ماف‌و شوێنەواری خۆی هەیە .

وە لەقورئاندا هەردوو لایەنەکە ڕوونکراوەتەوە، وە دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کەمێردەکانیان مردووە دەفەرموێت:( وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ أَوْ أَكْنَنْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَكِنْ لا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّا أَنْ تَقُولُوا قَوْلاً مَعْرُوفاً وَلا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ)(البقرة: الآية٢٣٦) واتە( هیچ گوناهێکتان لەسەر نی‌یە لەوەی بەناڕاستەوخۆ خوازبێنی ژنانی مێرد مردوو بکەن(کەهێشتا ماوەی دیاریکراویان تەواو نەبووەو دروست نی‌یە شوو بکەنەوە ) یاخود لەدلی خۆتاندا بڕیاری خوازبێنێتان دابێت، خوای گەورە بەڕاستی زانیویەتی، کەئێوە لەمەودوا ناویان دەبەن‌و باسیان دەکەن، بەلام نەکەن بەنهێنی بەلێنیان لێوەربگرن، مەگەر بەشێوازی گوفتارێکی چاك‌و دروست‌و باو نەبێت، وە نەکەن بڕیاری تەواوی مارەبڕینیان بدەن هەتاماوەی دیاریکراو تەواو نەبێت ...).

وە داواکردن هەرچی لەدەوریدا دەگرێت لەشێوازی ئاشکراکردن هیچ شتێکی بۆزیاد ناکات کەمتمانەو چەسپاوی‌یەکەی بۆبسەلێنێت.

وە داواکردن بەهەرحالێك بێت هیچ مافێك نادات بەداواکراو، تەنها ئەوەنەبێت کەئەوکچە داواکراوە کەسی‌تر ناتوانێت داوایبکات بێجگە لەوەی کەداوایکردووە وەکو فەرمودەیەکی

وە داواکردن هەرچی لەدەوریدا دەکرێت لەشێوازی ئاشکراکردن هیچ شتێکی بۆزیاد ناکات کەمتمانەو چەسپاوییەکەی بۆبسەلێنێت.

وە داواکردن بەهەرحاڵێك بێت هیچ مافێك نادات بەداواکراو، تەنها ئەوەندەبێت کەئەوکچە داواکراوە کەسیتر ناتوانێت داوایبکات بێجگە لەوەی کەداوایکردووە وەکو فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ دەفەرموێت:( ولا يخطب أحدكم على خطبة أخيه )) متفق عليه،واتە: هیچ کەسێکتان داوای کەسێك مەکەن کەبراکەتان براى مسوڵمان داوای کردووە ).

ئەوەی گرنگە لەم شوێنەدا ئەوەیە کە کچە داواکراوەکە بێگانەیە بۆکەسە داواکارەکە تاوەکو مارەبڕینەکەی بەتەواوی سەردەگرێت لەگەڵیدا، وە ئافرەت ناچێتە بازنەی هاوسەرگیریەوە تەنها بە عەقدێکی شەرعی ڕاستو دروست نەبێت، وەلایەنی سەرەکی لەعەقدا بریتییە لە (إيجابو قەبول) وەبۆ(ایجابوقبول) چەند ووشەیەکی دیاریکراوو ئاشکرا هەیە لەنەریت(عرف)و شەرعدا، وەئەوەی کەبڕیاری لەسەردراوە لەشەرعدا ئەو پیاوەی کەمارەی ئافرەتێك دەکاتو پاشان وازی لێدێنێت تەڵاقی دەدات- پێش گواستنەوەی، واجبە لەسەری نیوەی مارەییەکەی پێبدات، خوای گەور دەفەرموێت :( وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ)(البقرة: الآية٢٣٧) واتە: خۆئەگەر ژنانتان تەڵاق دا پێش ئەوەی بچنەلایان، لەهەمان کاتیشدا مارەییتان بۆدیاری کردبوون، ئەوە دەبێت نیوەی مارەییە دیاریکراوەکەیان بدەنێ، مەگەر خۆیان نەیانەوێتو چاوپۆشی لێبکەن، یان ئەوکەسە چاوپۆشی لێبکات کەمارەبڕینەکەی بەدەستە .....).

بەڵام داواکەر کاتێك واز لەکچە داواکراوەکە دەهێنێت لەپاش ماوەیەکی درێژ یان کورت، هیچ شتێکی لەسەرنییە مەگەر ئەوەی کەڕەوشت دەیسەپێنێت بەسەریدا، وەکو گلەییو سەرزەنشتو تانوت لێدان، ئیتر چۆن دەتوانین بەم شێوەیە بڵێین کەئەوەی بۆ مارەبڕاو دروستە بۆداواکراویش دروستە وەکو یەك؟

وەئامۆژگاریمان بۆئەوبەڕێزەی پرسیاری لێمان کردووە، کەپەلە بەکات لەمارەبڕینی ئەو کچەی کەداوای کردووە، چونکە تەنها ئەوکاتە ئەوەی پرسیاری لێکردووە بۆی حەڵاڵ دەبێت، وەئەگەر بارودۆخی ڕێگەی پێنادات کەهەستێ بەم کارە، ئەوا باشتروایە لەڕووی دینداریو پیاوەتییەوە ئارەزووەکانی خۆی بگرێتو زاڵ بێت بەسەر خواستی دەرونیدا، ولغاوی بکات بەتەقوا، وخێرو چاکە لەئیشێکدا نابێت ئەگەر سەرەتاکەی بەحەرام دەست پێبکات، هەروەها ئامۆژگاری باوکانو بەرپرسیارانی خێزانەکان دەکەین کەوا ئاگاداری کچەکانیان بن، زیادەڕەوی نەکەن بەناوی

لەخۆیان کردووە، (ومن يطع الله ورسوله ويخش الله ويتقه فأولئك هم الفائزون) (النور:٥٢) واتە: هەرکەسێك گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی(د.خ) بکاتو لەخوا گەورە بترسێتو خۆپارێزبێت بەڕاستی ئەوانە براوەنو سەرفرازن، وەخوای گەورە لەهەمووکەس زاناترە.

## بەتەنیا بوون لەگەڵ دەزگیراندا

مەبەستمان لەدەزگیران ئەو کچەیە کەمارەبڕابێت لەدەزگیرانەکەی، بەلام هێشتا نەگوازرابێتەوە، ئایا ڕێگەی پێیدەدرێت کەلەگەل دەزگیرانەکەی بەتەنیا بێت؟

**وەڵام**:- هیچ گومانی تێدا نییە، ئەوکەسە لەڕوانەگەی شەرعەوە بووە بەهاوسەرو خێزانی ... هەموو مافێکی هەیە بەسەریەوە کەشەرع بۆی دیاریکردووە، بەلام ئەو پرسیارەی کەرێگەی دەربازبونی نییە: ئەگەر هاتوئەم دەزگیرانە بەتەنها لەگەڵ دەزگیرانەکەیدابوو کەهێشتا نەی گواستبۆوە پاشان لەکاتی لاوازیو بەسەرخۆزاڵ نەبوون دا جووت بێت لەگەڵیدا پێش گواستنەوەیو ئاشکراکردنی ئەو گواستنەوەیە... پاشان ڕۆژگار بڕواتو ڕووبدات کەئەم پیاوە دەزگیرانە بمرێت بۆنمونە ... یان سەفەربکاتو دووربکەوێتەوە یان بەهۆی کێشەو گیروگرفتێکەوە کەلەژیاندا سەرهەڵدەداتو وازلە دەزگیرانەکەی کچەکە بهێنێت، ئایا هەڵوێستی ئەم کچە چیبێت ؟؟!!

سوێند بەوخوادایەی کەلەهاوشێوەی ئەو نییە، ئەمە ڕویداوەو چەندەها جاری تریش ڕوودەدات ...و تەنها قوربانییەکیش لەم حاڵەتەدا کچەکەو کەس‌وکاریەتی ... دەڵێرەدا چیرۆکێکی ڕاستەقینەتان بۆباس دەکەم، کەلەیەکێك لەولاتەکانی خۆماندا ڕویداوە، ئەویش ئەوەیە : کەکچێك گەنجێك داوایکردو هەردوکیان یەکتریان دەناسیو ڕەچەڵەکی یەکتری شارەوابوون، وەهەردوکیان لەیەك شاردا دەژیان وەکو نەریتی زۆربەی زۆری کەس‌وکاری کچەکانی ئەم ڕۆژگارە کەزۆر بەلایانەوە ئاساییە کەئەو کوڕەبێتو بڕوات چونکە واهەست دەکەن کەبەتەنها مارەبڕینێك هەموو شتێك کۆتایی هاتووە.

کچەکە دەڵێت: ڕۆژێك لەڕۆژان شەوی گواستنەوەمان پێشخستو جوت بوین لەژێر کارتێکردنی هێرشی ئارەزوو کەلەلای هەریەکێك لەکوڕوکچ دروست دەبێت، کاتێك بەتەنیا دەبن بەیەکەوە، وەلەگەڵ یەك جووت بوون .. وە ڕۆژگار ڕۆیشتو ئەو دەهات بۆلامو جووت دەبوو لەگەڵم وەوکو خێزانی خۆی بەبێئەوەی کەس‌وکار ئاگای لێبێت.

وەپاش ماوەیەك ڕۆژی گواستنەوەمان دیاریکرد، بڕوام پێبکەن لەشەوی گواستنەوەداو بەهۆی فرۆفێڵی دایکییەوە کەحەزی دەکرد کچێکی خزمیخۆی بۆ بهێنێت، کێشەیەکی دروست کرد کەهیچ بناغەیەکی نەبوو پاش ئەوەی ڕێکەوتبوو لەگەڵ کوڕێکی گەنجی زۆر ناوبانگ خراپدا کەهاوسێمان بوو، هەندێ لەشتومەکەکانی منی بۆبردبوو، ئەم چیرۆکە زۆر بەئازارە .. کورتەکەی ئەوەبوو کەدایکی تۆمەتبارمی کرد بەزینا لەگەڵ ئەو کوڕەدا ... تاوەکو کوڕەکەی ئەوکچە خزمەیان بهێنێت، کەخۆی مەبەستی بوو .. وە خوای گەورە دەزانێت کەمن بێتاوانم .. و ئەنجامی ئەم کارە چاوەڕوان نەکراوە ئەوەبوو پاش ئەوەی ئەوەم بۆدەزگیرانەکەم باس کرد کەئەم چیرۆکە خۆی ڕێکی خستووە واتا دایکی ئێمە وازمان لەیەکتری هێناو جیابوینەوە لەیەکتری‌و تەلاقمیدا ... وەکەس‌وکارم هیچ شتێك نازانین دەربارەی ئەم شتەم .. وەواهەست دەکەن کەمن هێشتا کچەعازەبم، وەخوای گەورە دەزانێت کەمن زۆر پەشیمانم لەوەی کەزیادەڕەویم کرد لەخۆبەدەستەوەدانم لەکاتی بێئاگاییدا ... چونکە من زۆر متمانەم پێهەبوو، وەهیچ کاتێك گومانی ئەوەم نەدەکرد یان بەمێشکمدا نەدەهات کەئەو ڕۆژێك لەڕۆژان وازم لێبهێنێت ....

بەڵام ئەوەی کەزۆر ئازارم ئەدات .. ئەوەیە کەهەرکاتێك گەنجێك دێت بۆداوام، توانای ئەوەم نییەو زاتی ئەوەناکەم ڕاستی بەکەس‌و کارم بڵێم، کەمن کچێتی خۆمم لەدەست داوەو ژنم، وەئەوەی منی گەیاندە ئەم هەموو ناخۆشییە .. ئەوکەسەبوو کەوام دانابوو هاوسەری ژیانم بێت ....

وەمن ئێستا ناخۆشترین ژیان بەسەرئەبەم‌و چاوەڕوانی مردنم .... چاوەڕوانی سۆزو میهرەبانی خودای گەورەم ... چی بکەم ؟ چۆن پاشماوەی ژیانم‌و تەمەنم بەسەربەرم .. ئەترسم لەگومانی خراپ .. وەلەوانەیە ئەوکەسەی کەوای لێکردووم نکوڵی لەکردەوەی خۆی بکات کاتێك کەکەس‌وکارم ڕۆژێك لەڕۆژان ڕاستیان بۆئاشکرابێت، ئەو کەسەی کەوای لێکردم دەزگیرانەکەم بۆخۆی ژنی هێنا .. ئەو کچەخزمەی کەدایکی بۆیدانابوو بەهۆی ئەوەوە ستەمی لەمن کرد .. بەڵام خوای گەورە بۆئەوو دایکی لەکەمیدندابوو .. کوڕێکی بوو، کەم ئەندام بوو، دایکی تووشی نەخۆشییەکی زۆر خراپ بوو، وەئەمەش بڕوام وایە کە بەشێك بێت لەوسزایەی کەچاوەڕوانیانە .... هەموو سزاکە نییە ... وەمن هیچ شتیك نالیم تەنها ئەوە نەبیت کەخوای گەورەم بەسەو هەرئەو باشترین کەسیکە کەسکاڵاو لالانەوەی خۆمی ببەمە لاو ئەوم بەسە .. چیرۆکەکە بەکورتی کۆتایی هات ..

بەپشتیوانی خوای گەورە دەلیم: ئەمە وەڵامی منە بۆباوکان‌و دایکان ...

ئەگەر شیلگیربن لەچاودیری کردنی دەزگیرانی کچەکانیان .. چونکە لەوانەیە ئەوەی تووشی خاوەنی ئەم چیرۆکەبوو، تووشی کچە بەریزەکەی ئیوەش ببیت .. بەوشیوەیە دایك و باوك ببنە هۆیەك بۆروخاندنی کچەکەیان .. وە کۆتایی بەژیان و ریزی بهینن لەم دونیایەدا وەلەوانەیە پاشان لۆمەی کچەکانیان بکەن و ئەو تۆمەتبار بکەن .. وەهیچ بەلگەو بیانویەکی بۆنەهیننەوە بۆئەو کارەی ..

پیغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرمویت :( إن الله تعالى سائل كل راع عما استرعاه، أحفظ ذلك أم ضيعه ؟ حتى يسأل الرجل عن أهل بيته ) (رواه النسائي وهو حديث حسن )، واتە: خوای گەورە لەهەموو بەرپرسیك پرسیار دەکات لەوەی پیی سپاردبوو، ئایا پاراستویەتی یان لەدەستیداوەو تووشی لەناوبردنی کردووە؟ تاوەکو پرسیار لەپیاوو سەرداری ماڵ دەکریت دەربارەی خیزانەکەی و ماڵ و منالەکەی ..)، وەها دەفەرمویت :( كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته، فإمام راع وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راع في أهله وهو مسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها وهي مسؤولة عن رعيتها، والخادم راع في مال سيده، وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راع في مال أبيه وهو مسؤول عن رعيته، فكلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته)(متفق عليه). واتە: هەمووتان بەپرسیارن لەوەی پیتان سپیردراوەو لەژیردەستتان دایە، پیشەوا بەرپرسیارە لەوەی لەژیر دەستی دایە، وەپیاو بەرپرسیارە لەکەس وکاری خیزانەکەی ، وە ژن بەرپرسیارە لەمالی میردەکەی وەئەو لیپرسراوە لەوەی لەژیر دەستیدایە، خزمەتکار بەرپرسیارە لەماڵ و دارایی خاوەنە مالەکەی، وە پیاو بەرپرسیارە لەماڵ و دارایی باوکی، وەهەمووتان لیپرسراون لەوەی پیتان سپیردراوەو لەژیر دەستان دایە ..).

داواکارم لەخوای گەورە کەئەم چەند ووشەیەمان بۆبکات بەمایەی پەندو ئامۆژگاری و سود لیوەرگرتن، وەلەژیانی هەموو خیزانیکی مسولماندا جیی خۆی بگریت و کاری پیبکەن ، ئامین خوایەگیان ئامین.

## گفتوگۆی نیوان کچ و باوکیك لەخەوندا

گفتوگۆیەك لەخەونی باوكیكدا كەلەگەڵ كچیكدا دەیكرد كەمردووە بەهۆی تووش بونی بەنەخۆشییەك، فرمیسكەكانی دەهاتنە خواردوە لەچاودكانیدا... باوكی لەخەوەكەیدا بینیو گفتوگۆی لەگەلدا كرد ، وەدەیوت:

كچەكە: (حسبي الله ونعم الوكيل)، واتامن هەرخودام هەیەو هەرئەوم بەسە، چونكە ئەو باشترین كەسیكە كەپشتو پەنات بیت).

باوكەكە: كەگوێی لەمەبوو هەلدەلەرزیو لەترسدا ووتی:بۆچی وادەلییتو ئەمەت بەكێیە ؟

كچەكە/ ئایا دەتەویت پیت بلیم بەكێ وادەلیم ؟

باوكەكە: بەلی بەكێتە .. پیم بلێ ؟

كچەكە: ئایا چی لەوكەسە دەكەیت كەمن وای پێدەلیم؟

باوكەكە: تۆلەی تۆی لێدەكەمەوە .

كچەكە: ئایاتۆلەی چی لێدەكەیتەوە دوای ئەوەی كەهەمووشتێ كۆتایی پێهاتو كارلەكار ترازا؟

باوكەكە: بەلێ تۆلەی تۆی لێدەكەمەوە، بەلام پیم بلێ ئەوە كێیە ؟

كچەكە: دەزانمو خوایەگیان تۆم بەسە .....

باوكەكە: توخوا پیم بلێ كێیە ؟

كچەكە: دەزانمو خوایەگیان تۆم بەسە .....

پاشان هەلچوو تورەبوو، وەدەموچاوە جوانەكەی گۆرا بە دەموچاویكی زۆر ناشرینو ناحەزو ترسینەر، وای لەباوكی كرد كەلەترسا هەلدەلەرزیت .....و ئارەق بریژیت، كچەكە بەردەوام بوولەسەر قسەكانی پیی گوت: لەگەل تۆمەو لەسەرتۆ ئەوشتە دادەنیمو دەلیم: (حسبی الله ونعم الوكیل) دوعایە لەكاتی بێدەسەلاتیدا دەكریت لەیەكیك كەستەمی لێكردبیت - ئەی ئەوكەسەی كەزیادەرەویت پێكردم، ئەی ئەوكەسەی كەخیانەتت لێكردم لەوئەمانەتە كەلەبەردەستدا بوو، هەوالەی خوات دەكەم ئەی ئەوكەسەی كەچاودیریت نەكردم، ئەی ئەوەی كەپاریزگاریت نەكردم لەدونیادا، ئەی ئەوەی بویتە هۆی ئەو ناخۆشییەی كەئیستا منی تیدام.

باوكەكە: ئیستا تۆ لەكویی ؟

كچەكە:(پاش ئەوەی هەناسەیەكی قولی هەلكیشا) گوتی: ئیستا لەناو چالیكم لەچالەكانی ئاگر ....

باوكەكە: من چیم پیت كردبوو كچی خێم ؟

كچەكە: پرسیارم لێدەكەیت ؟ ئەی تۆ منو خوشكەكانمت پشت گوێ نەخستبوو ؟

باوکەکـە: مـــن ئێـــوەم پشــتگوێ نەخســتووە بەپێچەوانـــەوە، مـــن هـــەموو پێداویســتی‌یەکانم بۆپڕدەکردنەوە لەخۆراكو پۆشاكو خۆشگوزەرانیو هەموو شتێك کەداواتان دەکرد !!

باوکەکە: ئەوەچی‌یە کەپێویست بوو لەسەرم بیکەم لەدوای ئەم هەموو شتە ؟!!

کچەکە: تۆ ئێمەت پشت گوێ خستبوو لەزۆر شتدا، پاش ئەوەی کەدەمو چاوی زۆرتر ناشرین کرد وەکو چۆن دوکەڵ لەکونی چاوەکانیەوە دەربچێت، تۆ ئێمەت خەبەر نەدەکردەوە بۆ نوێژی بەیانیان، وەرێگرمان نەبووی کاتێك کەبەتەنها هاتوچۆی بازاڕو شوێنانمان ئەکرد ... وەوازت لێمان دەهێنا کەلەبازاڕو ئەملاوئەولاکردندا بەتەنها شت بکرینو سەفەربکەین، وەرێگریت نەدەکرد لەسەیرکردنی فیلمی خراپو، ئەوفیلمانەی کەرەوشتمانی پێ‌لەدەست دا، بەسەوگاری درەنگ بەدیاریەوە دادەنیشتین بەبێ هیچ چاودێریو سانسۆرێك، وەبەدەنگی مۆسیقا دەنوستینو وەخوومان پیوە گرتبوو .. وەدەرۆیشتین بۆدوکانەکانی فرۆشتنی کاسیتی گۆرانی، وەئەوکاسیتانەمان دەکریو خاوەنی دوکانەکە چەندەها قسەی سوكو ناشرینی پیمان دەگوتو ئیمە هیچ گویمان پێ‌نەدەدا، چونکە ئیمە راهاتبوین لەسەر ئەوجۆرە قسە ناشیرینانە لەریگەی سەیرکردنی تەلەفزیۆنو ڤیدیۆ کەتۆ بەپارەی گیرفانی خۆت بۆمانت کریبوو.

لەناکاو باوکەکە بەخەبەرهات لەخەوەکەیو ترسی لێ نیشتبوو، هەرچەند زۆربێ‌تاقەتو دڵتەنگ بوو بۆ پاشەرۆژی کچەکەی کەتیی کەوتووە، بەڵام ئاواتی ئەوەبوو کەبەخەبەرنەیت تاوەکو کچەکەی گفتوگۆی تەواو دەکات، چونکە بریاری دا کەهەموو ئەو هەڵانە راست بکاتەوە، وە هەولی رزگارکردنی مندالەکانی تری بدات تاوەکو نەکەونە هەمان هەلەوە ... ! !

## لەبەرهەمەکانی بەدرەفتاری
## ئایـدز

ئیسلام بە تەواوی سورە لە سەر پێکهێنانی کومەلگایەکی خاوێن، کومەلگایەك دوورلە هـەموو ئـەو هوکارانـەی کـە ئارەزووەکـان زال دەکاو ئـابرووی دەبـری، ئەمـەش بـو پاراسـتنی پـاکیزەییبوون و نەشیواندنی وەچە، وە دانانی یاساکانی شەریعەت بو پاراستنیئەم ئامانجە بەرزەیـە، کـە فـەرمانی بەبالاپوشیو پاراستنی چاو کردووە، وەهانی هاوسەرگیری داوەو سنورەکانی داناوە.

لـەم پێناوەشـدا خـوای گـەورە ئاگـاداری کردوینەتـەوە لەخراپـەکاری پەنـهان وئاشـکرا ، وە فەرمودەکانیپیغەمبـەر(صلی الله علیـه وسـلم)ئاکـامی بلاوکردنـەوەی خراپەکاریوئاشـکراکردنی لەنیوەندی خەلکیداروون دەکاتەوەولە وانە فەرموودەی : (خمس بخمس ،ما نقض قوم العهد الا سلط علیهم عدوهم،وماحکموا بغیر ما انزل الله الا فشا فیهم الفقر، ولا ظهرت فیهم الفاحشة الا فشا فیهم الموت، ولا طففوا المکیال الا منعوا النبات واخذوا بالسنین، ولامنعوا الذکاة الا حبس عنهم القطر) ( الطبرانی فی الکبیرو هو حدیث حسن ) واتە پێنج شت بەرامبەر بە پێنج شتی دیکە،هەر کومەلیك پەیمان بشکێنی خودا دوژمـن بـە سـەریاندا زال دەکات، وەگـەر فـەرمانردوایییان بـەوەی خـوا دایبـەزاندووە نـەبێت ئـەوا خـودا هـەژاریان تـوش دەکـات،وە ئەگـەر بـەد رەفتاریـان تیـادا سەرهەلبدات خودامردنیان تیادا زور دەکات، وە ئەگەر فێـلو تەلەکە لـە کێشانەو تـەرازودا بکـەن مەگەر خودا بەرهەمەکانیان پێ نابەخشێتو توشی دەردە سـەرییان دەکات،وە ئەگـەر زەکات لـە مالەکانیان دەرنەهێنن خودا بارانیان لێ دەگرێتەوە.

وەلە فەرمودەیەکی دیکەدا کە(ابـن ماجـەو حـاکم) دەیگێرنـەوەو (صحیـح)ەبەگوزارشتی(لم تظهر الفاحشة فی قوم قط،حتی یعلنوا بها،الا فشا فیهم الطاعون والاوجاع التی لم تکن مضت فی اسلافهم الذین مضوا، واتە ((بەدکرداری لەناو هـەر گەلیکداسەرهەلبداوبە ئاشکرا ئـەنجامی بـدەن ئەوا تاعونو جورەها نەخوشی دیکە لە ناویاندا بلاودەبێتەوە کە لە پێشینانی خویـاندا لـەوجورە نەخوشـیانە نـەبووە))بارودوخیسەردەموزانسـتی نوێـش سـەلمێنەری واتـای فەرمودەکەنوراستییەتیپیغەمبەرایەتی (محمـد المصطفـی)ن لـە کـاتێکدا خـەلکی دەرکیـان بـە حەقیقـەتی نـەدەکرد تـا سـەدەی بیست کـە جورەهـا بـەدرەفتاریو بـەدکرداری تیایـاندا بـلاوەی کردوجورەها نەخوشی(جنسی) بەدیارکەوتن کەبوونیان لەرابردوودا نـەبووە،ئەمـەش هـەمووی بـەهوکاری سـەرهەلدانی بـەدرەفتاریو ئاشکراکردنی، یەکەم دەرکەوتـەش نەخوشـی(الزهری) لـە

ساتەوەختی جەنگی نیوان(ئیتالیاوفرنسا) کاتیك کە(زینا)لەناو سەربازەکانیاندا بلاوبویەوەوئیتالیە کان بە(الداء الفرنسی) ناویان دەبرد وە کاتیك کە داگیرکەرانی روژئاوایی ولاتانی عەرەبیان داگیر دەکرد ئەم جورە نەخوشیانەیان دەگواستەوەکە، لەو کاتەدا عەرەبەکان بە ((الداء الفرنجی))ناویان دەبرد کە تائەمروکەش بەو شیوەیە ناو دەبریت.لە سە ردەمی نویشدا نەخوشی(الهربس) بە دەرکەوت وەکو نەخوشیو درمیکی بەربلاوی(جنسی)لەکاتیکدا ریژەی توشبوانی سالانەی ئەم نەخوشی‌یە لە ئەمریکادا دەگاتە نیو ملیون، لە سالی ١٩٧٩ وە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بو یەکەم جار نەخوشی لەدەست دانی بەرگری وەرگیراو((المناعة المکتسبة)) ناسراو بە((ئایدز))ئەمەش ڤایروسیکە خروکە سپیەکان کە هیزی بەرگری لە لەشی مروڤدا دروست دەکەن تیك دەشکینن، تاوەکو توانای بەرگری نەمینی بەرامبەر هەر نەخوشی‌یەك کە توشی جەستەی مروڤ دەبیت، تا بە هوی ئازارو ئەشکەنجەیەکی‌دریژ خایەن‌ەوە بی چارەسەر دەمردن‌و کوتایی بەژیانی دەهینیت ئەمەش بەهوکاری نەمانی‌توانای بەرگری لە لەشدا.

## (نەخوشی گەلیکی جنسی دیکە)

بابەتی نەخوشی (جنسی)گرنگیەکی گەورەی لەلای‌پزیشکەکان هەیە ئەمەش لەمەر مەترسی گەلیك کە لە سەر باری تەندروستی‌وجەستەو باری دەروونی تاك‌و کو مەل دروستی دەکات باشترین بەلگەش بوگرنگی پیدانی جیهان بەم نەخوشی‌یە ئەوکونگرە گەورەیە بوولە سالی١٩٧٤ ز.لە ئەمریکا بەسترا بو لی‌تویژینەوە لە نەخوشی(الزهری)و هاوشیوەکانی، لەم کونگرەیەدا نزیکە(١٥٠٠ ) پسپور لە (٥٠)دەولەتەوە ئامادەبوون‌و هەموو بابەتەکانیان لە کتابیکی (٥٠٠ ) وەرەقەیی گەورەدا کوکرایەوە. لە سەرچاوەی (مرك) پزیشکی چاپی سی‌یەمی سالی(١٩٧٧ )م گوتوویە: ئەو نەخوشی‌یانەی کە لە ر یگەی جنس (الزنا)و پەیوەندی شیواوی جنسیەوە دیتە ئارا بەربلاوترین نەخوشین لەجیهانی ئەمرودا. وە لەماوەی دوو سەدەی رابردوودا ژمارەی توشبووان روژانە لە زیادبوندایە، وە دەزگای تەندروستی‌جیهانی‌ژمارەی توشبوان بە نەخوشی دەلاندن ((السیلان))بە زیاتر(١٥٠ )هەزار کەس لە سالیکدا وهەروەك ژمارەی توشبوان بە((الزهری))ناسراو بە ((الداء الافرنجی)) لە ولاتە عەرەبی‌یەکان سالانە زیاتر لە (٥٠٠٠)هەزار کەس دەخەملینن وە

بنكەی (ئـەتلانتا) لەویلایــەتی (جورجیــا) بوبنەبرکردنــی نەخوشــیەی درمیــەکان، لەویلایەتــە یــەکگرتووەکان ریـژەی توشـبوانی بـە نەخوشـی دەڵانـدن ((السـیلان)) بـە(٢)ملیـونو توشـبوان بـە (الزهـری) بــە(٤٠٠ )هــەزار لــە ســالی(١٩٧٦)دەژمــیریت. گوڤــاری(Gradguate Doctor) ژمارەی(مایو)(١٩٨٣)وگوڤاری(التایم)ی ئەمریکی (٤ ی یولیو١٩٨٢ ) گوتویانە (٢٠ملیون) ئەمریکی بە ئازاری نەخوشی((الهربز)) ی ئەندامی زاوزی دەنالینن، وریژەی نیو ملیون دیاردەی تازە سالانە لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان دیـاری دەکریـن وەلـە بریگانیالـە سالی١٩٨٢ز(١٥٠٠٠ )هـەزار حالـەتی تــازە دیـاری کـرا.ویـرای تویژینــەوە گـەلیکی چرونابوریـەکی زور لـە ر وژنـاوا لــە مــەر ئـەو نەخوشـیە زایندیانـە سـەرف دەکریـن کـەچی ر وژانـە ر ادەی توشـبوانی نەخوشـیەکە زیـاتر دەکـات ئــەوەی تیبینـی دەکریـت لـەم نەخوشـیـە خـیرایی بلاوبونەوەیـەتی لـە توشـبوەوە بـو کەسـیکی دیکـە کـە هەندیکیان لە ریگەی سەرجیی بەهوی ماچ کردنودەست لیدانوبــەکارهینانی کەلوپـەلی توشـبوەوە دەگویزریتـەوە من لەم پەراوەدا باسەکەم لەسەر چـوار نەخوشـی زایەندی((جنسـی)) چرکردوتـەوە کە دەلاندن (السیلان) و(الزهری) و(الهربز) و(الایدز) لەگەل هەندی نەخوشـی جوراوجـور کـە لـە کتیبو گوڤارە تەندروستیەکاندا لەسەر نەخوشی زانیدی نوسراون لەوانە:

## یەکەم: دەلاندن(السیلان)

دەلانـدن نەخوشـیـەکی سیکسـی بــەربلاوە ودرمەکــەی بــە ئاســانی بلاودەبیتــەوەو نیشــانەکانی لەماوەی(٣ تا٧ ) روژدا بە دەردەکەون لە ئاکامی پەیوەندیەیە سیکسیە نەشیاوەکاندا.نیشانەکانی لە پیـاواندا دەرهاویشــتەی بــە ئازاروســوتانەوە لــەکاتی مــیزکردندا، بــەلام لــە ئافرەتــاندا هــەندی دەرهاویشـتەی دیکــەی هەیــە. دەلانــدن گـەرچارەســەری کی یــەکجارەکی نــەکری ، میکروبەکــەی کومەلیك کاریگەری تر لەلاشەدا دروست دەکات وەك نەزو کیوهـەوکردنی جومگـەکانو پەشـیوی دل، دەلا ندن لەو نەخوشیـە سیکسیانەیە کە بلاوەو بەخیرایی دەردەکەوی خـودا پـەنامان بـدات لیی.

ریگەی گواستنەوەی:

بەهوی پەیوەندی سیکسیەوە(الاتصال الجنسی)، وەهەندی جار ئەوتەختەیەی کەبەو(میکروب)ە پیس بووە لەحەمامدا لەسەری دادەنیشین یاخود بە کارهینانی خاولی یاخود کەفاو یاهەر شتیکی دیکە کەهەلگری ئەومیکروبە بی بەهوی دەست لیدانی راستەوخووە.

## نیشانەکانی نەخوشی دەلاندن:

سەرەتا لەبوری میزەوە دەست پیدەکات کەهەندی جارئازاری لەگەلدایە، هەندیك بەنارەحەتی میزیان بودەکری، وە دوای(٢٤)کاتژمیر توشبوو هەست بەهاتنی کیم دەکات لەبوری میزیدا کیمیکی خەستیلینج بەپیی جوری میکروبەکە. ئەوەی کەسەرنجی توش بووبەئاگادەهینی دەرهاتنی دەلاندن لەریگەکانی میزکردن وپیسایی کردنەوەو لەگەل بەرزبونەوەی پلەی گەرماو سەرئیشەو زیاترکردنی ترپەی دل. وە دوای دوو هەفتە سوتانەوەیەکی زیادئازار لەبوری میزدا لەگەل میزە جورکی یا بەپیچەوانەوە نیشانەکان وەدەرناکەونو توشبو هەستی پیناکات بەلام میکروبەکە خوی دەگەیەنی بەسوری خوینودەرەنجامی خراپی بودلوکاژالی میشكوجومگەکان یاهەندیك جار دەگاتە گونە ویلەکان. وە ناتوانری بوتری کە نەخوش توش بووە بە دەلاندن (السیلان)) تا بەتەواوی دلنیا نەبیت لەبوونی میکروبەکە، وەدەرنەکەوتنی ئەو میکروبە لەپشکنیندا واتای توش نەبوون ناگەیەنیت بەنەخوشییەکە هەربویە واپیویست دەکات کە چەند روژیك پشکنین بکات بوتەواوی دلنیابوون.

## دوێەم: نەخوشی( الزهری)

ئەم نەخوشییە مەترسییەکی گەورە لەسەر لاشەی مروڤ دروست دەکات جەستە هەمووی دەکەویتە ژیر کاریگەرییەوە تاچەند سالیك، ئەگەر بیت و چارەسەری بوبە کارنەهینریت دەرەنجامی ترسناکی لیدەکەویتەوە،نیشانە سەرەتاییەکانی ئاساینو گرنگی پینادریت، وەبرینی

بێئازار دروست دەبێتولەروکەشدا ساریژدەبێت بەلام دوای دوو تاسی هەفتە برین زوربەی لاشەی توشبودەگریتەوە.

**ریگەی گواستنەوەی :-**

**ئەم نەخوشییە بەهوی پەیوەندی سیکسیو ماچ کردنو خوین پیدان لە توشبویەکەوە بوکەسی دیکە وە چارەسەرکردنی توشبوو، یاخود بەکارهینانی ئەو کەلوپەلوشتومەکانەیکەبەکاری دەهینیت**

## نیشانەکانی ئەم نەخوشیە

ئەم نەخوشییە سی قوناغی هەیە :

**١-قوناغی سەرەتاییەکەی:**

((قرحةالسفلس))،لەبەر بچووکی برینەکە توشبو زور گرنگی پینادات، پاشان گەورە دەبێتولەپاش (٧)هەفتە ساریژدەبێت .وە ماوەی کوشگیری نەخوش لەسی تاچوار هەفتەیە پاشان برینەکەی لەسەرئەندامەکانی لاشەی بەدیار دەکەون لەسەر ئەوشوینانەی کە دەیخورینن .

**٢-قوناغی نیوەندی:**

پاش دەرکەوتنی برینی((الزهری))میکروبەکەی بە هەموو لاشەدا بلاودەبێتەوە ودەدەشبێت بوچەند مانگیك دوابکەویت، لەم قوناغەدا زیپکەیەکی زور کەلە(٨٠٪)حالەتەکەیە لەسەرپیست بە دەردەکەون، لەگەل توشبوون بەهەوکردنینیسكوچاووجگەروهاتنەوەیئاو بەدەمو لووتو ر شانەوەو نەخوریو ئازاری لە(ماسولکوکان)، وە بەرزبونەوەی پلەی گەرمی سەرئیشەو، پاش تەواوبونی ئەم قوناغە لەچەند هەفتەیەکدا قوناغی سییەم کە بە قوناغی شاراوە (الکمون) ناودەبریتو هیچ نیشانەیەکی پیوە دیارنییە

**٣-کوتا قوناغ :**

لاشە توشی دومەل دەبی کە هەموو جەستە دەگریتەوە ماوەکەشی لە(٣تا٧)هەفتە یە، خوای گەورە بە سوزومیهرەبانی خوی پەنامان بدات لەم دەردە کوشندانە.

## سێیەم: نەخۆشی ( الهربز )

لە مەترسی دارترین نەخۆشی یە سێکسیەکانە بەخێرایی بڵاودەبێتەوە بەهۆی مامەڵەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ توشبودا وە لەرێگەی ماچ کردنەوە یاخود دانیشتن لە نشینگەی توشبوان یاوەخود نزیك بونەوە لەکەسی توشبوو، ئەم نەخۆشی یە تەنها ڕۆژئاوای نەگرتۆتەوە بەڵکو بەهۆی ئەوانەی سەردانی ڕۆژهەڵاتیان کردووە گوێزراوەتەوە.

<u>شوێنگەی نەخۆشیەکە :</u>

ئەندامەکانی زاووزێو پاشی مرۆڤ و پندۆکیو سەروی ڕانەکانو تورەکەی گونو ملکی رەحەمو، بنەتۆو یائەندامی زاووزێ توش دەبێ.

<u>نیشانەکانی :-</u>

بەدەرکەوتنی زیپکە یا دومەڵ لە سەرئەندامی زاووزێ دەست پێدەکات، نەخۆشە کە هەست بەماندوو بونێکیگشتی دەکات، تەندروستی نالەبار دەبێ ڕاستەوخۆ دوای توش بوونی نەخۆش بە نەخۆشییەکە، ماوەی کۆشگیرییەکەی پێشدەرکەوتنی نیشانەکانی نزیکەی(٥)ڕۆژێکە، لەسەر پێستی نەخۆشەکە چەند پەڵەیەکی سوورهەڵگەڕاو دەردەکەوێت، لەسەر پەڵەکان چەند دومەڵ یا زیپکەی بچوکی ئاودار دەردێتو تلۆقەکان خەرمانەیەکی سوور دەوری دەدا پاشان روش هەڵدێت سەرەوەی کاژێکی تەڕی تەنك دایدەپۆشێ

## چوارەم :ئایدز

بریتییە لە نەخۆشی لە دەست دانی بەرگری وەرگیراو ((المناعة المكتسبة))، دەردێکی چاوەڕوانکراوەلە بەرەنجامی فەسادی رەوشتی، پرۆفیسۆر(لوك مونيانيه) بە یەکەم دۆزەرەوەی دادەنرێ، کەلەساڵی(١٩٨٥) زیاترلە(٧٤٠) دیاردەی دۆزییەوە، بەپێی لێدوانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی، نەخۆشییەکە تاهەنوکەش مردنی لە سەرخۆ چاوەڕوانیەتی.

ئەم نەخۆشیە هەروەکو نەخۆشییەکانی دیکە ماوەی گۆشگیرییەکەی لە(٣)تا(٧)ساڵەکە دەگونجێ توشبو هەڵگری نەخۆشییەکە بێو نیشانەکانیشی لێدەرنەکەوتبێ. گۆڤاری(الحوادث) ژمارە(١٥٢٦) کە لە (٢١یەنایر١٩٨٦ز) بڵاوبویەوە لەگەڵ پرۆفیسۆرو دکتۆر (ماتفريدفرانكيه) کە دکتۆرێکی تایبەتو ئاوداره بەنەخۆشی ئایدز چاوپێکەوتنێکی بڵاوکردەوە کەلێرەدا هەندێك لەو پرسیارانەی کە سەبارەت بەونەخۆشییە ئاراستەی کرابوو دەخەینە ڕوو:

پ/دەڵێن ماچ کردن نەخۆشی ئایدز دەگوێزێتەوەچی دەڵێی؟

و/بەڵێ ئەمە راستە، ئەمە ڕوودەدات لەکاتێکدا گەرماج کردنەکە زۆرخەستو توندبێ لەوکاتەدا لیکیان تێکەڵ دەبێ، وەئەگەر برینێك لە دەمدا هەبێ لەرێگەی ئەو بڕینەوە گەر بچوکیش بێ ڤایرۆسی ئایدزەکە دەچێتە لوولە خوێنەکانەوە.

پ/نیشانەکانی توشبوون بەو نەخۆشییە چییە،وەچی لەناولاشەدا روودەدات ؟

و/گەر کەسێك توش ببێ بەو نەخۆشیە، ماوەی تووش بونەکەی (٣ تا٧) ساڵ دەخایەنێت.وە ئەوەی کە ڕوو دەدات لەلاشەدا، ڤایرۆسەکە لەڕێگەی لوولە خوێنەکانەوە دەچێتە ژوورەوە ئیتر لێرەوە، مەترسی سەرهەڵدەداو کارلەسەر لێکترازانی ئەو خانانەی کەتایبەتن بەبەرگرییەوە دەکات کەخانەی خڕۆکە سپییەکانن، ئیترکاری ئەم خڕۆکانە کۆتایی دێتو بەرگری لەلاشەدا بە تەواوی بەرەو نەمان دەچێتو میکرۆبەکەش بەرەو زیادبوون، پاشان هەرنەمانی بەرگری، توانای بەرەنگاری هیچ نەخۆشییەکی نامێنێت.

## پ/چیرۆکی ئایدز چیە؟ لەکوێوە هات؟چۆن سەری هەڵدا؟

و/ئەم ڤایرۆسە یەکەم جار لە حەفتاکان لەنێوەندی ئەفریقادا دەرکەوت، ئەم میکرۆبە جۆرێك لەمەیمونەکان کە خۆراکی خەڵکەکە بوو هەڵگری بوو، وە دەگونجێ کە کەسێکی ئەمریکایی گەشتیار لەناوچەکە، تێکەڵ بەکەسێکی ناوچەکە بوبێ کە توش بەو نەخۆشیە بووە، ئەویش ڤایرۆسەکەی وەرگرتبێو لەگەڵ خۆی بۆ ئەمریکای هێنابێت، وەبە ممارەسەی(شذوذالجنسی) لەگەڵ خەڵکانی تردا نەخۆشییەکە گواسترابێتەوە بۆمان.

## نەخۆشی گەلێکی سێکسی جۆراوجۆری تر

١/لووی(القنيطي المؤتف):لە ڕێگەی لێك خشاندنو دەست لێدانی راستەوخۆوە دەگوێزرێتەوە ماوەی نەخۆشییەکە لە مانگێکەوە بۆشەش مانگ، لە شوێنە شێدارەکان بەدیار دەکەوێت وەکو لای تۆواوی نێرو(الذکر)، کیسەی گونو کۆم، سەرەتا بەزیپکەیەکی لەشێوەی سەرد دەبوسێکداو پاشان گەشە دەکاتو بەتەواوی هەستی پێدەکرێو دەبیرێ.

٢ /پەتای (المليساء الرخوية): ئەم نەخۆشییە لەمەلەوانگەو گەرماوەکاندا بلاودەبیەوە بە ڕیگەی لێك خشاندنو پەیوەندی سێکسیەوە دەگوێزرێتەوە، وەکو دومەڵێکی خڕی سپی کاژێکی مۆمی لەسەرە لەگەڵ ووشك هەڵگەڕانی بنکەی نەخۆشییەکە، ئەندامەکانی زاووزێ و ئالەتی توش دەبن، نەخۆش هەست بەئازار ناکات تا هەوکردن ڕوونەدات.

٣/دومەڵ (بەتایبەتی دومەڵی توکەبەر):

بە ڕێگەی بەریەك کەوتنو پەیوەندی (سێکسی)راستەو خۆدەگوێزرێتەوە.

٤/الجرب(خرولكه)ياگەڕی :

هەموو لاشە دەگرێتەوە تەنها دەموچاوو ڕوخسار نەبێ بـە لێکخشاندن دەگوێزرێتـەوە خورینێکـی زۆر دروست دەکات .

٥/نەرمەبرین:

بریتی‌یە لەبرینێکی بە ئازار توشی ئەندامـەکانی زاووزێ دەبـێو وە ئـازارێکی تونـدو هـەوکردووی هەیەو لەماوەی کەمتر لە هەفتەیەکدا نیشانەکانی دەردەکەوێ.

٦/التورم الحبیبی اللمفي التناسلی :

نەخۆشـی‌یەکی سێکسی ئەندامـەکانی زاووزێیـە ، ماوەکەی لەهەفتەیەکەوە بـۆ شـەش هەفتەیـە، زیپکەیـەکی بچوکـی ئـاوداروڕوون لەسـەر ئەندامـەکانی زاووزێ دەردەکـەوێ توشـبو هەسـتی پێناکات.

٧/ورم حبیبی اربی: نەخۆشی‌یەکی سێکسی زاووزێییـە و درێژخایەنـە لـە شێوەی دومـەڵو تلۆقـە پاشان دەبێت بە برینو شین هەڵگەڕانی بـەردەوام لـە سـەر ئەندامـەکانی زاووزێو بـەرو نەرمـەی ڕانو وورگیو پاشەڵو دەروازەی کۆم.

## چیرۆکێکی پەند ئامێز

بۆ پەند لێ وەرگرتن بە کورتی ئەم چیرۆکە باسدەکەین: باس لە گەنجێکە سەفەری یەکێك لـە وڵاتە ڕۆژئاوایی‌یەکان دەکاتو لـەوێ(شـوقە) یـەك بـە کـرێ دەگرێـت، شـەوگاری لەگـەڵ ئافرەتـاندا بەڕێ دەکاتو توانای بەرگری بەرامبەر ئارەزووەکانی نامێنێت، بەڵام ئەفسوس لـەو مەیدانـەدا بـە تێکشکاوی‌دەگەڕێتەوەو لەگـەڵ خۆیـدا (میکـرۆبو ڤایرۆسـەکانی ) نەخۆشـی‌یەکانی (الزهـریو السیلان) هـەڵدەگرێت.پـاش چـەند سـاڵێك ئـافرەتێك دەخوازێـت بـەڵام منداڵیـان نـابێت. دەچنـە سـەردانی پزیشـك لـەوێ (تحلیـل) ی بـۆ دەکـەن ، دەردەکـەوێت کـە هـەموو (الحیوانـات المنویـة)ی مـردوون بـە هـۆی هـەڵگرتنی ئـەو میکـرۆبو ڤایرۆسـانە وە تـازە چارەسـەرکردنی سـوودی نی‌یە...لەوێدا پزیشکەکە پێی دەڵێ...ئەمە تۆڵەی خوایی‌یە لە دنیادا بۆت، گەر پاشگەز نەبیـەوەو تۆبە نەکەیتو داوای لێ خۆش بوون نەکەیت سزای قیامەتت توند تر دەبێت.

## هاوارێك بۆ داوێن پاكی لە بریتۆریاوە بۆ واشنتۆن

لــە بــەرەنجامی بڵاوبوــەوەی بەدڕەوشــتیو بــەد ڕەفتــاری، ســەر ژمێریــەكان ڕادەی بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەتك كردن لە باشوری ئەفرقیا ئاماژە پێ دەكەن . بـە پـێی توێژینـەوەكان هەر (٣٠) چركەیەك بەهۆی پەرتەوازەییو جیاوازی ڕەگەزیەوە ئافرەتێك هەتك دەكرێن .یەكێ لە ڕۆژنامەنوسان دەڵێت كە ناوی (چـارلین سمیـپ )ە دەڵێـت جارێك نـۆرەی مـن هاتو كـێردێكی بـە دەستەوە بوو. خۆی كرد بە ماڵەوەمداو هەردوو دەستی بەستمەوەو هەتكی كردم پاش ئەم هـەتك كردنە (سمیث) ڕووی كردە ئەو پەرستیارو بیمارستانە خراپانەی كە چارەسەریتوشبوان بە ئایدز دەكەن لە ڕێگەی دژە چارەسەرەوە .

باشوری ئەفریقا یەكێكە لەو وڵاتانەی لە جیهاندا زۆرتریـن تـاوان تیـایدا ڕوو دەدات، ڕێـژەی هـەت كردن بە ڕێژەی(١١٦) بۆ هەر (١٠٠٠٠٠) كەسێكە. كە ئەمە نزیكەی چەند ئـەوەندەی ڕێـژەی تـاوانی كۆشتنە ساڵانە، كە لە ساڵی (١٩٩٨)ز، (٥٩) كەس لە هەر (١٠٠٠٠٠) كەسێك.

بە پێی ڕیپۆرتاژێك كە لە سەر دەانی یەكێ لە قوتابخانە باڵاكان كرابوولە(٦٠٪)پێش بینیـئەوە دەكەن كە پێش تخرج كردنیانیان هەتك بكرێن، وە بە پێی دەزگاكانی ئاسایش ئـەو ڕێژەیـەی كـە ئاشكرا دەكرێت لە هەتك كردن لە( ٩٪)تێ پەڕ ناكات لـەوەی كـەڕوو دەدات لـە باشـوری ئـەفریقیا، بەڵكو ڕێژەكە بە گشتی بۆ كچانو ئافرەتانی هەتك كراو زیاتر لە ملیوێنێك لـە كۆی دانیشـتوانی مێینەی ئەو وڵاتە.

لە لای خۆیـەوە كۆمەڵەی دژایـەتی كردنـی ئـەتك كردنـی ئافرەتـان (مناهضة اغتصاب النسـاء ) دەڵێن ئەوەی پۆلیسەكان ڕای دەگەیەنن لە ڕێژەی ڕاستی ئـەتك كـردن كـەمترە، لـە بەرامبـەر هـەر ڕووداوێكی هـەتك كـردن كـە بـاس دەكرێـت(٣٥) دیكـە ئاشـكرا نـاكرێن. پاشـان لـە بـەرەنجامی ئـەم ڕووداوەدا . ئایدز بڵاودەبێتەوە وە لەهەر (٨) كەسێكی بـالغ یـەكێكیان هـەڵگری ڤایرۆسـی ( HIV )و وە ڕێژەی توشبوان لە ڕۆژێكدا دەگاتە (١٥٠٠) كەس.

ڕاپۆرتەكان ئەوە ئەڵێن كەزۆرینە . ئەوانەی قوربانی هەتك كردنن لـە باشـوری ئـەفریقیا تواناى كڕینی چارەسەری دژی ئایدزیان نیـیە بە هۆی گرانی نرخەكەیەوە كە لە نێوان (٢٠٠٠ بـۆ ٤٠٠٠) رانـدە واتـە(٣٢٠) بـۆ (٦٦٠) دۆلار.كەئەمـە چارەسـەرێكە لـە دەزگاكـانی دەوڵەتـەوە نـادرێت، هەربـەو هۆیـەوە ڕووبـەڕووی زۆر لـە ڕەخنــە بۆتــەوە لــە لایــەن بەرهەڵســتكارانو حیزبــە نەیارەكانەوە.و لەبەر نەتوانینی ڕێگە گرتن لە دیاردەی هەتك كردن، وە لە بەر كەم تەرخەمی لـە بنـە بڕكردنـی سـەرچاوەكانی تـاوانو نەهێشتنی شـوێنەوارەكانی، سسـتەمی قـەزائی بـێ توانـاو

دەسەوسانە لەوەی ئەو کێشانە یەکلایی بکاتەوە. ئەخۆشخانەکان شتو مەکە پێویستیەکانی تێدا نیە. ڕۆشنبیری بێدەنگی. گوێ پێنەدانی وڵات کەمتەرخەمی لای خەڵکی بەرهەم هێناوەو شکستیان هێناوە لەوەی تاوانی هەتك کردن کەچەندە ترسناکە وەك خۆی هەست پێ بکەن!!

لەلایەکی تردەوە لە توێژینەوەیەکی ویلایەتە یەکگرتوودکانی ئەمریکادا بە هاوکاری وەزارەتی دادوتەندروستیو کارو باری کۆمەڵایەتی ڕێکخرا:نزیکەی لە(١٨٪) ی ئافرەتان،کە(١٧،٧) ملیۆن ئافرەتە لە ویلایەتە یەکگرتوودکان ئەتك کراون یان هەوڵ دراوە بۆ ئەتك کردنیان لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی تەمەنیانو وە لە نیوەی زیاتری قوربانیانی هەتك کردن لە تەمەنی (١٧)ساڵیدا بوون.

لە لێدوانێکی وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتیو تەندروستی ئەمریکی(دونا شەلالا) لەسەر ئەو ژمارانەو ووتی ((هەر ژمارەیەك لەو ژمارانە یا کچمانە یا دایکمانە یاخود هاوسێیەکانمانە، بۆیە پێویستە دان بەوەدا بنێین ئەو توندو تیژییە کە لە بەرەنجامی تێکەڵاویو ئازادییەوە دژی ئافرەتان دەکرێت قوربانیەکەی کیشەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەی لێکەوتۆتەوە.لە ڕوویەکی دیکەوە ئەو (مسح)ەی کە بنکەی توێژینەوە سیاسیەکان ئەنجامی داوەو بنکەکەی (دیفر)لە ژێر ناونیشانی ( توندو تیژی ئەتەوەیی دژی ئافرەتان )ئاماژە بەوە دەکات کە زیاتر لەنیوەی ئافرەتان ڕووبەڕووی دەست درێژی جەستەییبەتەوەلە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیاندا، هەر لە لێدانەوە تابە کارهێنانی چەك. ئەم (مسح)ە چاو پێکوتنی لەگەڵ (٨٠٠٠ پیاوو ٨٠٠٠ ئافرەت ) دا ئەنجام داوە.

ئایا پێویست نییە لە سەرمان کە سوپاسی خودا بکەین لەو بەڵایەی کە زۆرێك لە دروست کراوەکان پێوەی دەناڵێننو بەردەوام ئەم ئایەتە پیرۆزە بخوێنین کە دەفەرموێ( ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا ) الاسراء ٣٢ .

## لە بەرهەمەکانی پاکیزەیی

((پاکیزەیی )) وازهێنانە لە حەرامکراوەکان وەکو (زینا و ئەوانی دی). ونەمانی پیاوەتی. ( صاحب المحكم) دەڵێ: پاکیزەیی وازهێنانە لەوشتانەی کە ناشرینن و حەرامن دەوترێت ( عف يعف عفة و عفافا و تعفف و استعف . و رجل عف و عفيف. والانثى عفيفة و جمع العفيف اعفة و اعفاء). وتراوە پاکیزەیی : مانەوەیە بە پاکیەتیو وبە ئارام گرتن لە سەر شتەکان. و لە قورئاندا دەفەرموێ (وليستعفف الذين لا يجدون نكاحا حتى يغنيهم الله من فضله) النور: من الاية٣٣ . ئەمە فەرمانی خودایە بۆ ئەو کەسانەی دەرامەتی پێکەوە نانی ژیانی هاوسەرایەتیان

نیە بۆ پاکیزدیی بوون و داوێن پاکی لە حەرام .هەرودك پێغەمبەری خوداش (دروودی خوای لێبێت) فەرمویەتی ( و من لم یستطع فعلیه بالصوم فانه له وجاء ) هەر کەسێك کە لە توانایدا نیە با بەڕۆژوو بێت چونکە پارێزەریەتی. وە لە فەرموودەیەکی دیدا پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێ: (( ثلاثه علی الله عونهم : المجاهد في سبیل الله و المکاتب الذی یرید الأداء، والناکح الذی یرید العفاف )) سێ کەسێك مافیانە خوا هاوکاریان بکات : تێکۆشەرێك لە ڕێگەی خودا ، قەرزارێك بە هیوای دانەوەی قەرزەکەیەتیو ، وە ئەوەی ژن هێنەرە هاوسەرگیرییەکەیبۆ ئەوەیە بە پاکیزدیی بمێنێتەوە . رواه احمد ، الترمذي و هو حدیث حسن .

وە لە نزاو پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو ( الهم انی اسئلك العفة والعافیة فی دنیاي و دیني واهلي ومالي الهم استر عورتي و امن روعتي واحفظنی من بین یدي ومن خلفي وعن یمینی وعن شمالي ومن فوقي . واعوذ بك أن أغتال من تحتی) رواه البزاز. وهو حدیث حسن . هەروەها ( الهم اني اسألك الهدی و التقی، والعفاف والغنی) رواه مسلم والترمذي وابن ماجه .

ئەمەش چەند بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی پاکیزەیی بوون

١/ گیرابوونی نزا و پاڕانەوەی ئەوانەی خۆ پارێزی لە حەرام دەکەن :

باشترین نمونەیەك کە پەندی لێ وەربگیرێ بە سەرهاتی پێغەمبەر یوسفە (سەلامی خودای لە سەر ) کاتێ خێزانی عەزیزی میسر هەموو دەروازەکانی لە سەر دادەخات و داوای ئەنجامدانی کاری خراپی لێدەکات ( وقالت هیت لك)(یوسف: ٢٣) بەلاٌم پێغەمبەر یوسف (سەلامی خودای لە سەر) پەنا بەخوا دەگرێ لەو جۆرە کردەوانە ، وە کاتێ زانی کە ئەم ئافرەتە سورە لە سەر ئەنجامدانی ، پاڕایەوە لە خودای گەورە کە فێلٌ وتەڵەکەی ئەم ئافرەتەی لە سەر هەلگرێ، و خوای گەورەش بە دەنگی پاڕانەوەکەیەوە هات.

خوای گەورە دەفەرموێ ( قالتْ فذلكُنّ الذي لُمتنّني فیه ولقدْ راودتهُ عنْ نفْسه فاسْتعْصم ولئنْ لمْ یفْعلْ ما آمرُهُ لیُسْجننّ ولیكُونا من الصاغرین ، قال ربّ السّجْنُ أحبُّ إليّ ممّا یدْعُونني إلیْه، وإلّا تصْرفْ عنّي كیْدهُنّ أصْبُ إلیْهنّ وأكُنْ من الْجاهلین ، فاسْتجاب لهُ ربُّهُ فصرف عنْهُ كیْدهُنّ إنّهُ هُو السّمیعُ الْعلیمُ)(یوسف:٣٢ ٣٤ )

لە بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەي بەنی اسرائیل کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دەیگێڕێتەوە، چوونەتە ئەشکەوتێکەوە لە ناکاوێکدا بەردێك دەرگای ئەشکەوتەکەیان لێ دادەخات و نیتر خەریکە بە هیلاك بچن، بەلاٌم دەست دەکەن بە نزاو پاڕانەوەو باسکردنی کردەوە

چاکەکانیان تاوەکو خوای گەورە لەو ناڕەحەتیە ڕزگاریان بکات ...با بە یەکەوە بچینە خزمەتی دەقی فەرموودەکە:

قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) (( انطلق ثلاثة نفر ممن كان قبلكم حتى اواهم المبيت الى غار فدخلوه ، فانحدرت صخرة من الجبل فسدت عليهم الغار. فقالوا انه لا ينجيكم من هذة الصخرة الا ان تدعوا الله بصالح اعمالكم .....تا کۆتایی فەرمودەکە).

فەرمودەکە باس لە سێ کەس دەکات کە شەویان بە سەردا دێتو دەچنە ئەشکەوتێکەوە، لە ناکاو تاوێرە بەردێکی گەورە دەخزێو دەرگای ئەشکەوتەکەیان لێ دادەخاو ئەوانیش لە کۆتاییدا پەنا دەبەنە بەر ئەوەی هەر یەکەیان بە کردومیەکی چاکی خۆی لە خوا بپاڕێتەوە، پاشان هەر یەکەیان بە کردەومیەکی چاکی خۆی دەپاڕێتەوە، تاوەکو خوای گەورە بەردەکە لە دەرگای ئەشکەوتەکە دەخزێنێو لادەچێ، یەکێك لەو کەسانە کردەوە چاکەکەی بریتی بوە لەوەی ئافرەتێکی ئامۆزای زۆر خۆش ویستووەو ویستویەتی خراپەی لەگەڵ کابەلام ئەو ڕێگەی نەداوە، تا کاتی گرانی دێو ئافرەتەکە ناچار دەبێت داوا لەم بکات، ئەمیش بە مەرجی کاری خراپە سەدو بیست دیناری پێ دەدات، کچەکەش لە ناچاریو گرانیدا تەسلیم دەبێت، کاتێك نزیکە کارەکە ڕووبدات، کچەکە پێی دەڵی لە خوا بترسەو بە مافی خۆی نەبێ کچێنیم ئەتك مەکە، کوڕەش لە بەر ترس‌وخاتری خوای گەورە وازی لێ دێنێو پارەکەشی پێ دەبەخشێ، لە ئەشکەوتەکەشدا بەم کردەومیەی لە خوا دەپاڕێتەوەو خواش لێی وەردەگرێ، دوانەکەی تریش باسکردنە لە پاراستنی ئەمانەتو چاکە کردنلەگەڵ دایكو باوك.

لەم فەرموودەیەدا گرنگی پاڕانەوە لە کاتی بەڵاو هەر کاتێکی دیکەدا وەپشت بەستن وداواکردن لە خوا بە کردەوە چاکەکانمان لەگەڵ سووربون لە سەر چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك وپاراستنی ئەمانەت و پاکیزەیی بوون و داوێن پاکیمان بۆ دەردەخات .

٢/ هەرکەسێ داوێنی خۆی پاراست لەگەڵ ئەوەدا کە دەیتوانی(زینا) بکا، خوای گەورە دەیخاتە ژێر سایەی خۆیەوە لەڕۆژێکدا هیچ سایەیەك نیە تەنها ژێر سایەی خودا نەبێ. هەروەك لە (ئەبو هورەیرەوە) ڕەزای خودای لەسەر لە پێغەمبەری خودا( صلى الله عليه وسلم) فەرمودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل الا ظله ، امام عادل ، وشاب نشأ في عبادة الله عزوجل، ورجل قلبه معلق بالمساجد، و رجلان تحابا في الله اجتمعا عليه، وتفرقا عليه، ورجل دعته امرأة ذات المنصب والجمال : فقال انى اخاف الله، ورجل تصدق بصدقة، فاخفاها حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه، ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه ) متفق عليه.

٣/ دوور كەوتنەوە لە تووڕەیی و خەشمی خودا :

هەر کەسێك بکەوێتە ناو تاوانی زیناوە خودا لە خۆی تووڕە دەکا، برایان و خوشکان خودا غیرە دەکا وە (غیرە) ی خودا کاتێ کە دەبینێ بەندەکانی (ئافرەتان و پیاوان ) زینا دەکەن. لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا هاتووە لە ( ئەبو هورەیرەوە ) ڕەزای خودای لە سەر لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) فەرموویە. ـ( ان الله تعالى يغار و غيرة الله تعالى. ان ياتي المرء ما حرم الله عليه ).متفق عليه .

واتە: خودا غیرە دەیگرێ. ئەوەش لە کاتێکدایە مرۆڤ حەرام کراوەکانی خودا ببەزێنێ.

# بە شایەت بن کچەکەم کرد بە هاوسەری

ئەوەی ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێ لە ماڵی (شێخ حمید النعیمی ) بووم، ئامادەی کۆڕێك لە کۆڕەکانی ئافرەتێك بووم کە باسی لە هاوەڵێکی بەرێز دەکرد( ابو درداء ).... وە ئەوە یەکەم جاربوو زۆر دڵخۆش بم بە ئافرەتێك کە وتار دەدات لە ڕاستیدا شێوازێکی سەرنج ڕاکێش و نایابی هەبوو خوای گەورە تەمەن درێژی بکاو تەرازووی چاکەکانی پێ قورس بکا.ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام بە سەر هاتێك بوو لە سەر بارودۆخی گشتیمان و گەنجەکانمان خوای گەورە ڕێنموکاری هەموو لایەکمان بێت.با زۆر درێژەی پێنەدەین و بچینە سەر گێڕانەوەی بە سەر هاتەکە :

بە سەرهاتەکە لە شام و بە سەر پەریەکانی دیمەشقدا هاتووە کچێکی تازە پێگەیشتووی قوتابی زانکۆ کە ڕۆژانە بۆ زانکۆ دەچوو، باوکی سەرۆکی لقێك بوو لە زانکۆ. ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی زستاندا ئێوارە پاش تەواوبوونی دەوامی زانکۆ هاتە دەرێو ویستی بەرەو ماڵ بچێتەوە ، بەلآم بە هۆی چڕی هەوری ئاسمان و دەنگی هەورە گرمە و بریسکەی چەخماخە و لەگەڵ دابارینی تەرزەیەکی گەورەوپاشان بارانێکی بە لێزمە . ئەم کچە نەیتوانی بگەڕێتەوە ماڵی خۆیان دوای ئەوەی کە جل وبەرگەکەی تەواو تەڕ بوون ناچاری وای لێکرد لە دەرگای ماڵێك بدات، پاشان کوڕێکی گەنج کە هەر قوتابی ئەو زانکۆیە بوو لە نزیکی زانکۆ ژوور و هەیوانێکی بە کرێ گرتبوو، فەرمووی لێکردو چوونە ژوورەوە کوڕە گەنجەکە کە بارودۆخی کچەکەی بینی بردیە ژوورەوەو هیتەرەکەی بۆ داگیرساندو . خۆی لە هەیوانەکەدا مایەوە پاش تێپەڕینی ماوەیەك کچەکە لە سەر جێگاکە ڕاکشاو پاشان خەوی لێ کەوت دواتر کوڕەکە ویستی هیتەرەکە بهێنێتە هەیوانەکە بۆ خۆی بینی پەریەك والەسەرسیسەمەکە ڕاکشاوە و خەوی لێکەوتووە، پاش ئەوەی کە هیتەرەکەی هێنایە لای خۆی نەفسی. بەلآم شەیتان خۆی کردە دڵیەوەو ختووکەیدا ئیغرای کرد بە وێنەی ئەو کچەی لە سەر جێگاکەی خەوی لێ کەوتبوو. . بەلآم ئەم گەنجە بۆ ئەوەی نەفسی سەرکەشی تاقیبکاتەوەو بزانێت چەندە دەتوانێ بەرگەی تۆڵەی خواو ئازارەکانی دۆزەخ بگرێت. بەڵێ چەندە شەیتان و دەروونی ختوکەیان دەدا هەرجارەو پەنجەیەکی دەخاتە سەر هیتەرەکە تابە تەواوی هەردوو دەستەکانی سوتاو لە هۆش خۆی چوو. کاتێك کچەکە بە خەبەر هات دەبینێ کوڕەکە دەستی سووتاوەو لە هۆش خۆی چووە هەر بۆیە بە خێرایی خۆی دەگەیەنێتە ماڵەوەو بەسەرهاتەکە بۆ باوکی دەگێڕێتەوەوە و دەڵێ ئەوەی کە ڕوویداوە من هیچی لێنازانم .

بۆ ڕۆژی داهاتوو باوکی کچەکە هەواڵی کوڕەکە دەپرسیّو دەزانیّ کە لە نەخۆشخانەیە ئیدی دەچیّ بۆ لای، دەبینیّ هەردوو دەستی بە لەفاف پێچراوە، سەرەتا خۆی ئاشکرا ناکات و دەڵیّ کوڕم بەم گەنجێتیەت ئەم دستانەت بۆ سوتاون ، کوڕەکەش تەواوی بە سەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، باوکی کچەکەش لە ناو خەستەخانەکەدا دەڵیّ خەڵکینە بە دەنگی بەرز بە شایەت بن واکچەکەم کرد بە هاوسەری، ئەمەیە بەرهەمی داوێن پاکیو پاکیزەیی بوون ، زۆر جار لە زانا پایە بەرزەکانمان بیستووە فەرمویانە : هەر کەسێك ئارام بگریّ لە سەر ئەنجام نەدانی حەرام لە کاتێکدا توانای کردنی هەیە، خوای گەورە بە حەڵاڵی پێی دەبەخشیّ.

## چیرۆکی ئیمان

چەندە سەرنجی ڕادەکێشام کچی پوورەکەم ئەو لە تەمەنی٢٠ ساڵیدا بوو، بە تایبەتی ڕەفتاری بەرزیو لە سەر خۆیی‌یەکەی....کێشمی دەکرد بۆ دەروازەکانی (ورع)و ڕێگاکانی ڕزگاربوون، بە ووتە سەرنج ڕاکێش و متمانە بەهێزیو شەرم و شکۆکەیەوە، کچێکی خاوەن ڕێبازێکی دروست بوو لەم ژیانەی پڕە لە ئاڵۆزیو دنیای فیتنەوحەزەکانە.

کچێکی سادەو ڕەوشت بەرز، دڵ فراوان بوو بەرامبەر بە کەسانی دی، ئەم ڕەفتارەی وای لە (ئیمان) کردبوو، لە ناو کچەکانی خێزانەکەماندا وەك نموونەیەك باس دەکرا،لەگەڵ ئەوەی کچێکی ژیرو بە سەلیقەش بوو، هەموونەو وانەو خوڕەوشتانەی کە لە ئەنجامی پەیوەست بوون و هاوەڵیەتی کردنی قورئانەوە بۆ بەدی هاتبوو کە خەریکی لەبەرکردن و خوێندنەوەو پیادە کردنی بوو.زۆر جار پێم ناخۆش بوو کە هەڵەیەکم دەکرد، دایکم سەرزەنشتی دەکردم ودەیگوت نامەویّ بەو شێوەیە بی ئەی((عەبیر)) دەمەویّ وەکو ((ئیمان)) دەربچی؟! منیش بە توڕەییەوە وەڵامم دایەوە : دەمگوت من (ئیمان) نیم، ئەو لە من گەورەترە دایە. لە ڕاستیشدا کەسێکی باشتر لە (ئیمان ) لە دەوروبەرو کەسە نزیکەکان وتاکو هاوڕێیانی قوتابخانەکەشمدا شك نەدەبرد.

بەداخەوە زۆربەیان بە دنیا هەڵخەڵەتابوون، گۆرانیو گێڕانەوەی فلیمەکان گەورەترین خەمیان بوو. لەگەڵ گرنگیدان بە دیمەنی دەرەوەیان لە خۆ ڕازاندنەوە، بەڵام(ئیمان ) تەواو پێچەوانە بوو. کەسێکی کەم وێنە بوونەو شتانەی بەلاوە گرنگ نەبوو، ئەوەی ئەو پێی هەڵدەستا دوای( خانەی لە بەرکردنی قورئانی پیرۆز) پێداچوونەوەی وانەکانی بوو لەگەڵ هاوکاریکردنی پوورم لە کاروبارەکانی ماڵەوەدا. پاشان بەرەو گوڵستانی نوێژکردنیو لەویّ دەپاڕایەوەو بەوپەڕی خشوعەوە، نوێژەکەی دەکرد.بەم شێوەیە (ئیمان) خشتەی ژیانی ڕۆژانەی خۆی بە سەر دەبرد، قسەو

قسەلۆکی خەلکانی نـەفامی بـەلاوە گرنـگ نـەبوو. ئەوانـەی کە پروپاگـەندەی ئـازادیو رۆشـنبیری سەردەمیان دەکرد. بەلکو بـە سـەربەرزیو متمانـە بەخۆبوونیـەوە. بـە زمـانی گفتوگۆو دانایـیـەوە وەلامی دەدانەوەو سەردەکەوت بـ. ـەریاندا. لەم بارەیەوە با یادگاریەکتان بۆ باس بکەم: بانگهیشت کرا شەوێکیان بۆ (وەلیمە) یەك لە مالْ یەکێ لە دۆستەکانمان. یـەکێ لـە ئامـادەبووانی ئاهەنگەکـە بە چاوێکی گالتەپێکردنەوە بە (ئیمان) ی ووت. تۆ هێشتا سەرەتای تەمەنتە بۆ وا دینت بە توندی گرتووە ؟ (نیمان) زۆر بەهێمنی وەلامی دایـەوەو گوتـی:مـردن گـەورەو بچوکـی ناناسێت. قـەدەری خوای گەورە جاری وا هەیە کتوپڕە کەسمان نازانین کەیو لەکوێ وچۆن دێتە پێشمان.

یەکێکی دیکەیان بە لووت بەرزیەکەوە گوتی: سەردەم گۆڕاوە پێویستە لەگەلْ گۆڕانیدا بگۆڕێـین و بە پێی مۆدیلەکانی بڕۆین. نەوەکو ئەم پۆشاکەی کە لە بەری تۆدایە بەپێکەنینێکەوە گوتی: پیری کردووی. (ئیمان) بەوپەڕی متمانە بە خۆبوونەوە: گوتی ئایـا لـە بـەرکردنی پۆشـاکێك کـە شـوێنە هەستیارەکانیلاشەم بەدەربخات مانای وایـە مـن کەسـێکی پێـش کەوتووم؟ یـاخود پێویسـتە ببمـە دومیەی نەخشەسازانی پۆشاك فرۆشانی جیهانی. بە دلّی ئەوان بپۆشم و برازێمەوە؟ ئەوانـەی کـە دەیانەوێ ئابڕووم بەرن گەر شوینکەوتەیان بم ئیتر من کەسێکی سەردەمیو شارستانیم؟ یـا ئـەوە تەقلیدێکی کوێرانەو بە کۆیلەبوونی شەیتان و مرۆڤەکانە.

کەسێکی دیکەیان گوتی: ئەوەندەش وا بیر مەکەرەوە خودا(غفور رحیم)ە .ئیمـان ئـەمجارەش بـە لەسەرخۆییەکەوە گوتی: بەلێ بـەلام لـە بەرامبەریشیدا (شـدید العقـاب)ە، لـەو کاتـەدا ئامـادەبوان سەیرێکی یەکتریان کردو بە شەرمەوە هەستیان بە شەرمەزاری کرد.لە رۆژێك لە رۆژەکاندا پوورم بە سەردان هات بۆ لامان و هەوالّی ماردبڕینی (ئیمان)ی پێداین بە خۆشیەکەوە گوتی: سوپاس بۆ خوا ئەوەی کە خۆی پێی خۆش بووهاتە داوای پیاوێکی لە خواترس کە شایستەی خۆیـەتی.دایکم بە دلّخۆشیەکەوە گوتی: خوا مبارەکی بکا. خوشکم بە راستی (ئیمان) شایەنی هەموو شتێکی باشە پاشان منیش گوتم: کەی دەیگوێزێتەوە، پوورم گوتی: لە پشوەدا انشا ء الله، نوخشـە بـێ لـە تـۆش (عبیر).

ئیمان لە شتێکی دیکەیدا زیاتر سەرنجی راکێشام کاتێ کە بینیم نیوەی ماردییەکەی کردووە بـە خێر نەك هەر ئەوە بەلکو رازی نەبووە ئاهەنگێکی گەورەی بۆ ساز بکـرێ بـەلکو تەنـها بـە بـانگ کردنـی کەسـ ە نزیـكو هاوەلـەکانی خواردنـی شـایەیەکی بچوکـی سـازدا لـە مالـەوە. لـە راسـتیدا هەلسوکەوتەکانی زۆر پرسیاری لـە لا وروژانـدم...ئایـا دەگونجـێ ئـافرەتێك لـەم سـەردەمی بـەزم و رەزمەدا خورەوشتێکی بەمجۆرە بنوێنێ؟ (ئیمان) چۆن بوو بە خاوەنی ئەو بیرەباوەڕە بـە هـێزەی

کە بەردنگاری نەفس و هەواو ئارەزووەکانی ببێتەوە. ئەم هێزەی لە کوێ بوو بۆ بەرەنگاری شەیتان وختوکەکانی.

ئیدی دڵنیا بوم پێش ئەوەی لەگەڵ شەیتاندا بکەومە جەنگەوە. تەواوی پەیوەست بوون بەم ئاینەوە مرۆڤ تەواو سەربەرز دەکاو کرۆکی مرۆڤ بوونی دەپارێزێ، ئەو مرۆڤەی کە خۆی بە بەهەشت دەفرۆشێ، بەڵێ تەنها بە بەهەشت. هەموو ئەمانە ئەوەی لە دڵمدا بەرامبەر بە (ئیمان) هەمبوو نەیهێڵاو لە بری ئەوە خۆڕاگریو وورە بەرزی پێبەخشیم وە بڕیارمدا ڕێگەو ڕەوتی ئەو بگرمە بەر بە پێی توانام، بەڵێ پێویستە لە سەر ڕێبازی ئەو بم و وەکو ئەوبم . هیوا خوازم خوای گەورە یارمەتیم بدات و پشتیوانم بێ، هەروەك داواکارم لە خوای گەورە دامەزراوم بکا خودا بیستەرو زانایە

## نەخۆشیەك تووشی ئافرەتی دانە پۆشراو دێ

مسلم لە (صحیح)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی (صلی الله علیه وسلم) ( ونساء كاسيات عاريات مائلات مملات رؤوسهن كاسنمة البخت المائلة لايدخلن الجنة ولا يجدن ريحها).
هەروەها (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ (لا تقبل صلاة الحائض الا بخمار)، واتە نوێژی کچی باڵغبە داپۆشراویەوە نەبێت دروست نىیە. رواه الامام احمدو ابوداودو الترمذي وابن ماجة.

توێژینەوە زانستیە نوێکان ئەوەیان سەلماندووە کە بە دەرکەوتنی پێستی لەشی ئافرەت کاریگەری خراپی لە ڕووی تەندروستیەوە لێ دەکەوێتەوە. سەرژمێریەکان ئاماژە بەوە دەکەن بۆ بڵاوبونەوەی نەخۆشی (السرطان الخبيث) لە سەر ئەو نەخۆشیانەی کە بە دەرەوەن لە لاشەی ئافرەتان بە تایبەتی ئەو کچانەی کە پۆشاکی کورت لە بەر دەکەن. لە گۆڤاری (الطبیـة)ی بەریتانیدا بڵاوکراوەتەوە: کە (السرطان الخبيث ) (الميلانوفا) لە دژوارترین جۆرەکانی شێرپەنجەیەو لە زیادبووندایە. وڕێژەی تازە پێگەیشتوان لە کچاندا لە هەڵکشاندایەو لە قاچەکانیانەوە تووش دەبن، هۆکاری سەرەکیش بۆ پەرەسەندنی ئەم شێرپەنجەیە بە هۆی بڵاوبونەوەی پۆشاکی کورتەوەیە کە تیشکی خۆر ڕاستەوخۆ لەپێستیان دەدات بە بەردەوامی، گەرچی گۆرەوی تەنك و نایلۆنیش لە پێ دەکەن بەڵام نابێتە هۆی پاراستنیان . گۆڤاری (اطباء الاوبئة ) بانگهێشتیان کرد بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ئەو نەخۆشیە کە ئیستە بووە بە بەڵایەك. ئەمەش ئەو ئایەتە پیرۆزەمان دێنێتەوە یاد (وإذ قالوا اللهمَ إن كان هذا هو الحقَ من عندك فأمطرْ علينا حجارة من السماءِ أو ائتنا بعذاب أليم) (لأنفال:٣٢) ئێستە ئەم نزایە گەیشتووە

به بەشێك لە شێوەی ئەم شێرپەنجە خراپەدا کە دژوارترین جۆری شێرپەنجەیە . ئەم نەخۆشیە بە هۆی بەرکەوتنی پێستەوەیە بە تیشکی خۆر بۆ ماوەیەکی زۆر وە تیشکی سەروی (وەنەوشەیی) بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن ئەمانەش لە بەرهەمی پۆشاکی کورت و کەنار دەریاکانەوەیە، ئەمەش هەموو جەستە دەگرێتەوە بە شێوەی جیاواز، یەکەم جار وەکو پەڵەیەکی بچوکی ڕەش بە دیار دەکەوێت، زیاتر لە پێیەکان و لاقەکانیانیاندا ، هەندێك جاری تریش لە چاوەکانیاندا. پاشان بلاودەبێتەوە بە هەموو جێگایەکدا لەگەڵ گەورەبوونی شوێنی یەکەمی، ئەوجا هێرش دەکاتە سەر گرێی (الليمفاويه) لە سەروی ڕانەوەو خوێن داگیر دەکات و لە جگەردا دەمێنێتەوە تا بە تەواوی تیکی دەشکینی.

لە هەموو لاشەدا دەمینیتەوە لە ئیسك و گورچیلەکاندا پاش توشبوونی گورچیلەکان بە شیرپەنجە پیساییەکەی رەش دەبیت، ئەمەو نەخوشیەکە دەگویزریتەوە بو کورپەلە لە سکی دایکیدا وئەوەی جیگەی سەرنجە بەکارهینانی چارەسەر بوئەم نەخوشیـیە هیچ سودیکی نییە.

لیرەوە گرنگی دانایی شەریعەتی ئیسلاممان بو دەردەکەوی لە لەبەرکردنی پوشاکیك کە سەراپای لاشە بپوشی وفراوان بیو تەنك نەبی لەگەل بەدەرکەوتنی روخسارو دەستەکانی، زور بە روونی بە دەرکەوتووە کە بالاپوشی باشترین پاریزەرە لە سزای دونیا کە خوی لەم نەخوشیەدا دەنوینیچ جای سزای دواروژ، ئەمەو پاش پالپشتکردنی زانستی نوی بوئەوەی کە ئیسلام بریاری لە سەرداوە هیچ بیانویەك دەمینی بو سفوریو رووت پوشی ئافرەت ؟

# فیتنەی جل وبەرگ ومۆدە

ژیان بەردەوامە و هەرجارەی نەوەیەك دێتەسەرشانۆی ژیان ورۆڵی خۆی دەبینێت .
وە لە هەرسەردەمێكدا جیاوازی هەیە لەنێوان نەوەكانیدا تا كاردەكاتەسەر نەوەیەك لەداهاتوودا كە لەهەرهەموو نەوەكانی تر جیاوازترە سەرجەم كارە خراپەكانی تێدا كۆدەبێتەوە . فیتنەوئاشوب رۆر دەبێت بەشێوەیەك كەلەنەوەكانی پێشوودا بەم شێوەنەبودوە.وەشێوازی بەدوای یەكهاتنی كارە خراپ وسەیرەكان بەردەوامە لەنەوەی مرۆڤایەتیدا.وە پێغەمبەری خوا دەفەرمێت "فإنه من يعش منكم فسيرى إختلافا كثيرا" رواه أبو داود —صحيح
واتە: هەركەسێ لەئێوە بژی ئەوا جیاوازی زۆر دەبێت.
وەكاتی سەرهەڵدانی هەر خراپەیەك. سەرەتا زۆر لەسەر كۆمەڵگە قورس ونامۆیە .بەلآم وەردە وەردە ئەم نامۆیە كاڵ دەبێتەوە بۆ ماوەیەكی تر ونەوەیەكی تر ونەوەیەكی تر كەبە كارێكی ئاسایی دادەنرێت وخەڵكی خۆی پێوەدەگرێت.
بەم شێوە ڕەوشت و ئاكاری جوان وبیروباوەڕ بەرەو سستی وكاڵ بوونەوە دەچێت.
تالەنەوەیەك دا سەرجەم كاروئاكارەخراپ وناشیرینەكان كۆدەبێتەوە ومەردایەتی وپاكی وبیروباوەڕ.. هتد بەتەواوی نامێنێت وناشرین وناپەسەند ترین پێڕۆنەوە دەبن دەبن لەمێژووی مرۆڤایەتیدا و قیامەتیان بەسەردا دێت .وەكۆتایی بە ڕۆڵی مرۆڤ دەهێنن لەم شانۆی ژیانەدا. بێ گومانین لەوەی بەدرێژایی مێژوو كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەمیشە لەكێشمەكێشمی (صراع) وململانێ دابووە لەنێوان بیروباوەڕو بنەما ڕەوشتیەكاندا لەلایەك وە فەساد وبێ ڕەوشتی وكارەخراپەكان دا لەلایەك تردوە.وەئەوەی ئەمڕۆ لەگۆڕەپانی ژیاندا دەبینرێت وهەستی پێ دەكرێت جنجاڵیە لەتاوان وكاری خراپەكاری كەنەوەی ئەم سەردەمەگیرۆدەی هاتووە.وەلەهەموویشی سەیرتر ئەوەیە كۆمەڵگەومرۆڤەكان بوونەتە دووبەرەی جیاواز لەم بارەیەوە.
**یەكەم**: زۆر بەتوندی دژی ئەم دیاردەداهێنراوە نارەوشتیانە وەستاونەتەوەوبەرنگاری دەبنەوە.
**دووەم**: بەرەیەك ئەم هەمووكاری فەسادكاری ونامرۆڤیە قبوڵ دەكات بەناوی سەردەمی بوون وشارستانیەت وپێشكەوت و وخوازیەوە..هتد

ودیەکێك لەودیاردە نامۆیانەی نەمرۆنەوەکانمان پێ سەرقاڵ بوونە.وەبۆتە یەکێك لەسیماکانی لادان لەبنەما نەخلاقیەکان کۆمەڵگای مرۆڤایەتی . شوێنی کەوتنی کوێرانە ولاسایی کردنەوەی نازانسیانەو نادروستانەی نافرەتانمانە بۆ نەو پیلان ونەخشانەی کەلەلایەن دەزگاکانی مۆدەو جلوبەرگی نافرەتەدوور لەڕەوشتەکانە کەنەمرۆ سەرجەم جیهانی پێ گیرۆدەبووە.نەم فیتنەیە هەرلە نمایشی جل وبەرگی ڕووت وتەسك ودادڕاو لەوشێوێنانەی کەجوانی لەشی نافرەتان دەردەخات ونادروەوی سێکسی دەبزوێنێت وشێوازەکانی خۆڕازانەوە ونارایشت کردن و...

هەموو نەمانە دەکرێتەوە کە بۆ ... ر وەرزێك وبۆنەوەیەك وناهەنگێك .بگەرە نووستن وگەشت ..بۆهەریەکەلەمانە شێوازێکی تایبەتی مۆدە هەیە ومانگانە نمایشی دەکرێت ونیشان دەدرێت.کەمەخابن زۆرێك لەنافرەتانمان سەرگەردانی نەم پیلانەژەهراویە بووە.کەڕاستەوخۆ نامانجی لەدەستدانی نابڕو شەرم وبالأپۆشی نافرەتانە وڕووت کردنەوە و هەراج کردنی لاشەیانە لەمەزادخانەکانی نمایشی جل وبەرگ دا.

چەندین دەزگاو کۆمپانیا و لایەن بەشداری نەم نابڕۆبردنە دەکەن . هەمووشیان بەجۆرێك لەجۆرەکان سەرەڕای ڕووتاندنەوەی خەڵکی و یاری کردن بەبیرو هۆشیان . دەیانەوێت بەرهەمی نەم ماندووبوونەیان بەدی بهێنن و بیدورنەوە ! لەم نێوەندەدە ڕۆڵی جولەکە شاراوەنی یە و نامازەی زۆری هەیە کە بەشداری نەوان لەم ڕەوەوە کارایە تا سەرئەنجام فەرمان ڕەوایی خەڵکی بکەن جڵەوی کاروباریان بگرنە دەست!

### سەرەتای سەرهەڵدانی نەم فیتنەیە

سەرەتای سەرهەڵدانی نەم فیتنەیە دەگەڕێتەوە بۆ هاتنی هێرشی وڵاتانی ڕۆژناوا بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاتێك کە کەسێك توانی مۆر(ختم)سوڵتان عبدالحمیدی دووەم.ساختەبکات ونوسراوێك لەشێوازی (فتوی)ی (شیخ الاسلام)بڵاوبکاتەوە کەدەڵێت.من مەرسومێکی سوڵتانیم پێ یە کەمۆڵەت وفتوای دەدات بەوەی کە (سەرپێچی) عوسمانی فێری بدەن وکڵاو ڕۆژناوای بکەنەسەر .

نەم کارە نارەزایەکی زۆری لێ کەوتەوە .بەڵام زۆری پێ ی نەچوو (کمال نەتاتورك)توانی بەزۆری هێزو دەسەڵات نەم کارانەجێ بەجێ بکات وتەنانەت بالأپۆشی نافرەتان ی قەدەغەکرد لەدام ودەزگاکانی دەوڵەتدا.ج بۆ دامە زراندن وخوێندن و...هتد کەئیستاش لەزۆرێك لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناەڕاستدا نەم یاسایە کاری پێ دەکری

## کێ لە پشتی ئەم پیلانەوەیە

ئاینی پیرۆز ئیسلام توانیویتی ئافرەتان بپارێزێت لەداوی ناردزوو پەرستان بەبالآپۆشی وپاك وداوێنی وشەرم وبنەما ڕەوشتەکان .بەلآم ئەم کارە بۆ مەرامی جولەکەکان زۆر سەخت وبەربەست بوود. بۆیە هەمیشە لەبیری ئەو دابوونە کە ئەم بەربەستە سەختە بشکێنن ولەناوی بەرن.

هەر بۆیە لەسەددەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) جوولەکەکان جل وبەرگیان لەبەر ئافرەتێکی باوەڕدار کردوە وویسـ.ان ڕووتی بکەنەوە لە بازاڕی (بنی قینقاع)دا.

بەم شێوەیە لەپیلان وبەرنامەڕێژی بەردەوامدا بوونە تاکار گەیشتە ئەمڕۆ کە دەبینیی چ کارێك بۆ ئەم پیلانە کراوە.زۆر بە ئاشکرا وبێ پەردە جوولەکەکان لەپشتی ئەم کاردوەن کە ئەمڕۆ لە هەمووجیهاندا کاری گەورەی بۆ دەکرێت چەندین کارگەی گەورە وپێشنگاو گۆڤار وکەناڵی ئاسمانی وناخۆی وڕۆژنامە وبلآوکراوەی جۆراوجۆر لەهەموو جیهاندا خزمەت بەم کارە دەکرێت وکاری ئاسانی بۆ دەکەن.

وەسالآنە بەمەلاین ی بۆخەرج دەکرێت .جوولەکەکان تەنها مەرامیان بەدەستکەوتی مادی وبازرگانیەکە نی یە لەم کاردیاندا؟بەلکو ئامانجی ترسناکترین هەیە کەبریتی یە لەتێکشکاندنی ژێر خانی ئەخلاقی وخێزانی لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا .وەخستنە ڕووی جوانیەکانی ئافرەتان وەك چەکێك وهۆکارێکی گرنگ بۆ شێواندنی ڕەوتی خێزان وکۆمەڵگە وژیانی مرۆڤایەتی.

جونکە بێ گومان دەزانن کە ئاف. تان دەتوانن چ ڕۆڵێك بگێڕن لەم کاردا.

کاتێك ئافرەتان لەبری پەروەردە کردنی نەوەیەکی ڕۆشنبیرو ڕەوشتەبەرزونیشتیمان پەروەر چاك خـواز.هتد. تەنهاسەرقاڵی نمایش وخۆ جوانکردن وکڕین وجلو بەرگ و مۆدەبن لەژیانیاندا. چۆن شیرازەی خێزان وکۆمەڵگە تێك ناچێت؟.وەدواتر ئەوانیش دەتوان زاڵ بن بەسەر هەموو جیهانداو مەرامەکانیان جێ بەجێ بکەن.وە سالآنەچ وەك خێزان وەدەوڵەت چەندین مەلاین خەرج دەکەن بۆ ئەم مەبەستە.بێ گومان ئەم نەخشەیە .نەخشەوپیلانێکی تەواوکراوو (متكاملە)وچەندین فلیمی ئاشرین وڕووت .وە وێنەی جۆراوجۆر وهەڵبژاردی شاجوانەکان و..پاڵپشتی ئەم کارە پڕە لەمەترسیەن.

## نەخشەو ئامانجەکانیان

بێ گومان ئەم کارە بەبێ ئامانج وستراتیژیەت نی یە.بەتایبەتی کاتێ کەدەبینین پاردیەکی یەجگار زۆری بۆ تەرخان دەکرێت..وەنەوەی ڕوون وئاشکرایە ئەم هەڵمەتە بڕە لەمەنز سیەی کەدەدکرێتە سەر ئافرەتان بەناوی (مۆدە)وە ئامانجی تێکشاندنی میللەتانە لەوئاسەتانە

١ سەرقاڵ کردن ودوورخستنەوەی میللەتان لەکێشەوبابەتەسەرەکی وگەورەکانی ...ل...رخال کردنیان بەشتانی لاوەکی ومادی.

ج لەپەرستنی خودای تاك وتەنیا وسەرفرازی وسەربەخۆ وەپەروەردەکردنی نەوەی ... دیان و بوون وبەکۆیلە وژێر دەستەی کەسانی تر هەروەك پێغەمبەر دەفەرمووێت "تع... ت عبد الدنیا وعبد الدرهم والقطیفة. والخمیصته . ان اعطیی رضي وان لم یعط لم یرض"

واتە :تیا بچێت بەندوکویلەی پارە ودینار و والقطیفة.واتە جل وبەرگێك.

٢ زاڵ بوون بەتەواوەتی بەسەر میللەتاندا و سەپاندنی نەریت وعادەتانی خۆیان بەسەر ئەوانی تردا وەك ژێر دەستەیەك.

هەروەکو (ابن خلدون ) دەڵێت :زاڵ بوو خۆی دەسەپێنێت بەسەر ژێر دەستەکانیدا. وەژێردەستەکانیش ناچار شوێنی کەوتەی ئەوان دەبن لەهەموو شتێکدا چ لەجل وبەرگ وسواری وچەك ونەریتەکانیان .

٣ کەم ندکێش کردنی پاردو سامان ومالی میللەتان بۆ خۆیان وقۆرخ کردنی وبەکارهێنانی تەنها بۆ ئامانجەکانی خۆیان .

ئەمەی ئیستا لەکۆمەلگادا هەستی پێ دەکرێت بەلگەیەکی حس هەڵنەگرە بۆ ئەم ڕاستی یە.

٤ سەپاندنی دەسەلات وتوانای خۆیانە بەسەرنەتەوەکانی تردا بەشوێنکەوتنی کوێرانە.

هەرچەندە ئەوان دەسەلاتی خۆیان بەشێوازی سەربازی ناسەپاندبێت.بەلام لەڕووی ڕۆشنبیری ونەریت وعادات وجل وبەرگەوە سەپاندوویانە. ئەمەش جورێکە لەشوێن کەوتووی و کۆیلەیی...

## وێنەی جل وبەرگ ی ناشیاو

ئێمە وەك فەرموودەکەی پێغەمبەر خودا(دووردی خوای لەسەر بێت) نالێین کەدەفەرمەرمێت لە وەسفی ئافرەتانی بێ ڕەوشت دا (کاسیات وعاریات)واتە ئافرەتانێکی رووتی نیمچە داپۆشراو...)؟!

بەڵکو ئەوەی ئەمرۆ دەبینرێت لەو قۆناغەتێ پەریوودو بگرە ڕووت وقوت ودانەپۆشراوون...؟
تەنانەت ئەمرۆ کار لەنمایشی جل وبەرگی تێ پەریودو نمایشی لەش ولاری ئافرەتانە بەڕووتی ..نەك نمایشی جل وبەرگ؟!
لەهەمووشی ناشرین تر .ئەم جۆرەنمایشانە بەشێوازێك ئەنجام دەدرێت کەهەندێ جموجۆڵی لەگەڵ دا دەکرێت کەمرۆڤ هەست بەشەرمەزاری دەکات کاتێ ئافرەتان کە(دایك وخوشك وکچ وخێزانمانە)بەوشێوەدێتە پێش چاو؟! کەلەگەڵ خودی سروشتی مرۆڤ دا ناگونجێنێت.ئێستاش ئەومەترسیانە دەخەینە ڕوو کەلەبلاوکردنەوەی ئەم وێنە وگۆڤار وفلیمانەدا لێ دەکەوێتەوە:
١-یارمەتی دان بۆبلاوکردنەوەی ڕووتی وخۆدانەپۆشین کەئەمەش سەرەتایەکە بۆبلابوونەوەی زیناوکاری فاحیشەو خراپە کەخوادەفەرمێت:
"إن الذين يحبون ان تشيع الفاحيشة فى الذين أمنوا لهم عذاب أليم فى الدنيا والاخرة والله يعلم وانتم لاتعلمون " سوردتی النور١٩
واتە: ئەوکەسانەی کەحەزدەکەن بێ ڕەوشتی وخراپەکاری لەنێو باوەڕداراندا بلاوبێتەوە ئەوا سزایەکی توندوتیژیان هەیە لەدونیاوقیامەتدا وەخوای گەورە بەتەنها زانایە وئێوە هیچ نازانن..
٢-بلاوکردنەوەی ئەم فلیم و وێنەو ..هتد دەبێتەهۆی تەشەنەکردنی بێ ڕەوشتی وچلێسی لەنێو کۆمەلگەدا وەپێچەوانەی فەرمانی خودایە کەفەرمان بەبالاپۆشی وشەرم دەکات .هەروەك پێغەمبەری خودا دەفەرموێت "إن ممادرك الناس من كلام النبوة الاولى .إذا لم تستحي فاصنع ماشئت" أخرجە البخارى
واتە: ئەگەر تۆشەرمت نەکرد چی ئەکەی بیکە..؟!
وەئەمە بانگەوازی کردنە بۆ گومرای کردنی ئافرەتان و خراپ کردنی کۆمەلگا هەرکەسەش ڕۆڵی هەبێت بۆبلاوکردنەوەی ئەوا بەپێی ئەم فەرموودەیە "من دعا إلى ضلالة كان عليه من الإثم مثل اثام من اتبعه . لاينقض ذلك من أوزارهم شيئا" أخرجه مسلم
٣-بلاوکردنەوەی ئەم جۆرە وێنانە..هتد دەبێتە هۆی لاوازی باوەڕ وحەزبەلاسایی کردنەوەی بێ ڕەوشتان (وەکێ بێت حەزبکات کەسانی بێ ڕەوشتی بێ ئابڕووی وەك مارلین مۆنرو مادۆنا ومونیکا ...هتد) بێتە پێشەنگ (قودە)وەی حەز بەلاسایی کردنەوەیان بکات لەهەموو لایەنێکەوە) هەرکەسە چاو لەهەر خەلکێك بکات لەوانە "من تشبه بقوم فهو منهم" رواه احمد و أبو داود

ودپێغەمبەری خودا ددفەرمێت :"من تشبة بقوم فهو منهم" واته :هەرکەسێك لاسای پێرێکی کرددود.ئەوا لەئەوانە ولەپێری ئەوان ددژمێرێت".

٤ یارمەتی دان لەبلاّوکردنەوەی ئەم جۆرە کارانە.ددبێتە هۆی یارمەتی وکۆمەك کردنی شێرشی فیکری وزایونی گان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی .ولەناودانی بنەما ئاینییەکانە.

٥ یارمەتی دان لەبلاّوکردنەوەی ئەم کارانە. ددبێتە هۆی توانەوە ولەناوچوونی بنەما ونەریتەکانی مرۆڤایەتی وئیسلامی .بەرانبەر بەپێرێك کە باوەڕیان بەهیچ بنەماو بنەڕەتێك نی یە وددیانەوێ زۆر بەسادەیی بەهاکانی ئەوان پەسەند بکرێت .

٦ بلاّوکردنەوەی ئەم وێنانە..هتد .ددبێتە هۆی پەرەسەندن وبلاّوبوونەوەی جۆرەها تاوان لەناوکۆمەڵگادا.چ ودك (زینا وبێ شەرمی )کەهەموویان لەلاوازی باوەڕود سەرچاوە وەردەگرن لەڕێی ئەو وێنانە وبلاّو کردنەوەی مۆدەو چەندەها شتی تردوە کارئاسانی بۆ ددکرێت.

٧ تیاچوونی کەسایەتی باوەڕدار ویاری کردن بەلاوان .بانگ خوازانی(مۆدە) توانیویانە لەم دوایەدا کاری وا بەلاوان وکەسایەتیەکان بکەن کە مرۆڤ زۆر بەقێزونیەوە تەماشایان ددکات . ئەویتر بەبلاّوکردنەوەی هەندێ جل وبەرگی تایبەت ونووسینی هەندێ (ووتە)ی ناشیاو بێ شەرمی لەسەر ڕووی ئەو جل وبەرگانە بۆ نموونە:

جل وبەرگی (مینی)واتە زۆر کورت.

جل وبەرگی (الميكرو)

جل وبەرگی (هوتبانتس)واتە شۆرتی بزوێنەر

جل وبەرگی(التوبلس)واتە سنگی ڕووت.

جل وبەرگی(السيرو)واتە زۆر ڕوون ودیار

یاخو هەندێ ووتەی ناشیاو ودك(تەماشای ژێری کە..؟!)(بۆ تۆیە بەتەنها..؟!)(بۆ هەمووکەسە..؟!)(شەرم مەکە وەرە..؟!)(دژی هەموو ڕەوشتێك ..؟!)و..هتد.

٨ هەلگرتن ی ئەو جۆرەو وێنەو گۆڤارانە.ددبنە هۆی دوورکەوتنەوەی فریشتەکانی خودا لەماڵەکانمان.

٩ یەکێك لەوکارانەی بازرگانیەکانی (مۆدە)کاری بۆددکەن دەرخستنی نمایشکەر لەئافرەتان بەشێوەیەکی تایبەت کەپێشی ددڵێن (ملکە)کەلەش ولاری بەجوانترین لەش ولار دادەنێت ودکراوە بەمەرجی لەشی ڕەشیق وشۆخ وشەنگ.

تایبێت لاواز وقەدباریك وبالا بەرزو...هتد. زۆرێك لەو وەسفانە كەبە(پێشەنگی)دادەنێن وەزۆرێك لەئافرەتانمان ئەمرۆ سەرقالی ئەنجام دانی رجیمی تایبەتین تا بتوانن لاسای ئەو ئافرەتانە بكەنەوە بە(ملكە)ناوەدبرین.وەبۆ ئەم مەبەستە سالآنە چەندین سیستەمی ریجێم وپەیمانگای تایبەت وگۆڤاری تایبەت كار بۆ ئەم بوارە دەكەن.

ئەمە وای كرد كە هەندێك لەپسپۆران و گۆڤارەكانی (مـودە) لەشاری (لندەن)كۆنگرەیەك ببەستن بۆ ئەم مەبەستە وكارە ناتەندروستیەكانی ئەم هەڵمەتە بخەنە روو وە داوای وەستاندنی ئەم كاردیان كرد.كەزیان زۆر بەلەشی ئافرەتان دەگەیەنێت.

كە ئەم كۆنگرەیە بەسەرپەرشتیاری حوكمەتی بەریتانی بوو.وەتەنانەت (لیزجونز)سەرنوسەری گۆڤاری (ماری تلیر) كەتایبەتە بە(مۆدە) دەڵێت: جیهانی(مـودە)لەسنوری خۆی لای داوە لەجیهانی خەیاڵ دا دەژی...

## خوشكم لەكۆتایدا هەرتۆی قوربانی

خوشكی بەرێز دڵنیابە لەكۆتایدا هەرتۆی قوربانی.

ئەگەر كورێكی لاو هاتە لات و چەند ووتەیەكی زەردو سوری بۆ كردیت ..ئایانەكەوێتە داویەوە یان نا...؟!

دڵنیابە ئەگەر خۆت بخەیتە ژێر رەحمی ئارەزووەكانیەوە ئەوساتە تۆی هەڵگرو بارگەی تاوانەكەیت و ئەویش زۆر بێ باكانە پاش ئەنجام دانی كارەكەی دەرباز دەبێت .

دووریش نیەبگەرێتەوەدو پاش گەزبێتەوە لەتاوانەكەی وەكۆمەلگاش تۆبەی لێ قبولْ دەكات.

بەلآ ئایا كومەلگە تۆبە لەتۆ قبولْ دەكات..؟!

هەرچەندە خوای گەورە لێ بوردەیە ولەهەمموو تاوانێك خۆش دەبێت .وتۆبەی تۆبەكاران قبولْ دەكات بەلآم دڵنیا بە كۆمەلگە لەتاوانی تۆ خۆش نابێت و هەرتۆش قوربانیت.

وەهیچ بەڵێنێكی ئەو لاوانە راست نی یە ولەداهاتوودا تۆ ناخوازێت ..

ئەو بریاری داوە كەسێكی رەوشت بەرز بخوازێت تۆ رەوشتت لەدەست داوە .؟!

سەرجەم بەڵێنەكانی لەبەڵێنی گورگ دەچێت.

ئەی ئەو كەسانەی:كەبۆ ئافرەتان فرمێسكی تیمساحی دەرێژن.وخۆتان بـەمیراتگری مافەكانیان دەزانن بێ گومان ئێوە پێش ئەوەی پەروشی مافەكانی ئەوان بن .پەروشی ئارەزووەكانتانن.

بۆ ئەم مەبەستەش شینی مافی ئافرەتان دەكەن .ئێوە كەی توانیتان داوێن پاكی پیاوەكان بپارێزن ئەوسا بێنەسەر ئافرەتان.

سەردەمانێك ئافرەتی موسڵمان بەشێوەیەكی هێمنانە دەژیـان و پەیوەست بـوو بـەماڵ وخـێزان وهاوسەری خۆیەوە و ژیانێكی پڕ لـە ئاسودەیان دەبـردە سـەر .هەمیشـە قوتابخانەیـەكی مـەزن بـوون بـۆ چـەندین كەڵـە پیـاوو شـازنی مـەرد یـان پـەروەردە دەكـرد وداویـن پـاكی ومتمانـەی وخۆشەویستی وهەوینی هاوسەرێتیان بوو بەلام هێرشی ژەهراوی ئێوەی هەڵ پەرست بەزمانی حاڵ دەتان ووت :ئەباوك وئەهاوسەربۆیان نیە مافی تۆ پێشێل بكەن .(ئێوە دەتانەوێ ئافرەتـان ڕووت وبـەرەلا بكـەن ڕێـزی هاوسـەر وبـاوك وكۆمەڵگـە نـەگرێت و بیكـەن بـەخێزانی هەمووكەسێك).

دەتان ووت :(باوك براو كەس وكار هەرهەموویان هیچیان لەتۆ زیاتر نی یـە تانـەوان هاوسـەرت بۆ دیاری كەن )كـاتێ خـۆی هاوسـەری هـەڵبژارد و نەزانانـە تـێ كـەوت وخۆشـی درێژخایـەنیان لەشەو ڕۆژێك درێژە نەكێشا بەڵكو تووشی چەرمە سەری هەتا هەتای بوو...

وتیان .(خۆشەویستی بنەما وبناغەی هاوسەرێتی سـەركەوتووە) ئەمـە تـەواوە بـەلام بەووتەیـە سەرگردانتان كردن تاركاگەیشتە ئەوەی تووشی چەندین چەرمەسـەری بـوون. ئەوخۆشیەشیان نەبینی .

ووتتان:(پێویستە هاوسەری ئافرەت دڵخوازی خۆی بێت )

ئەم كارە بوو وای لە ئافرەت كرد هەر جارەی هاوسەرێكی تاقی كردەوە

ئەكۆن وئە نوێ هیچیان ئەو كەسەنەبوون كە ئەو شادیەی بۆ دەستەبەربكات.....)

ووتیـان:(پێویسـتەخۆت سەرپیشـك بیـت وزانسـت بەدەسـت بـهێنیت بـۆ ئـەوەی زانسـتیانە پەروەردەی منداڵ بـەجێ بهێنیت ).كـەچی فـێری هـەموو شـتێك بووتـە تەنـها پـەروەردەكردن نەبێت!

ووتیان:(ئێمە ئافرەتانێك دەخوازین كەلێزان بێت لەشێوازی ئارەزووەكانمان وبتوانێت بـەپێی پێویستی ئێمە خۆی جوان بكات وسازبدات هەرئەمە بوو وای لەئافرەتان كـرد.لەتـەواوی حـەزو ئارەزوەكانتان بكۆڵێتەوە تابە تـەواوی شـارەزاتان بێت.پاشـان بـۆی دەركـەوت فـەرنگی حـەزی ئێـوە تەنـها نـاوی ئافرەتـانی بـەرەڵا و ڕووت وبـێ شـەرم وخـاوەن پێكەنینـە درێژەكـان وسەماكەرەكان و..ئەبێت هیچی تری تێدانی یە.ناچار ئەوانیش بەهەمان سیناریۆی ئـەواندا تـێ پەڕین هەر لە خۆڕوت كردنەوە سەماكردن و..هتد.

بەلام مەخابن دواجار بەبێ سوود بەشكستی گەڕانەوە وپاش تێربوونی ئارەزووەكانتان پشتان لێ كردن و بەلای كەسانی تردا ڕۆیشتن.

ئایا دەتانەوێ تەواوی ئەو ڕۆڵە خراپانە بەئافرەتی داوێن پاك و ڕەوشت بەرز بگێڕن ؟!

## خوشكم لە پێش كۆتـايدا

خوشـكم: ئەمـە بانگـەوازی منـە بـۆ تـۆ .بـۆ ئەوكەسـەی كـە لەپارچەیـەك لەپەراسـووی مـن دروستكراوە.

هەموومان تاوان دەكەین وهەڵە دەكـەین .بـەڵام پـەروەردگار لـە هـەموومان خـۆش دەبێـت گـەر تۆبەبكەین.

خوای گەورە دەفەرمێت"الا من تاب وامن وعمل صالحا فاولیك یدخلون الجنة ولایظلمون شیأ" سورة مریم /٦٠

واتـە :هەركەسـێك تۆبـەبكات و كـرداری چاكـە ئـەنجام بـدات .ئەوانـە دەچنەبەهشـتەوە وهیـچ ستەمێكیش تووشیان نابێت".

خوشكی بەرێز: تۆبەبكە وهەڵمەتكە بۆ ئەنجام دانی كاری چاكـە وچاكەخوازی .چونكـە كـاری چاكە خراپەكان لەناودەبات. خـوای گـەورە دەفـەرمێت :"واقیـم الصـلاة طـرفي النـهار وزلفـا مـن اللیل ان الحسنات یذهبن السیئات ذلك ذكری للذكرین "

واتـە :نوێـژ ئـەنجام بـدەن بەشـەوو بـەڕۆژ. كـرداری چاكـە.خراپـەكان لـەناودەبات .ئەمـەیاد خستنەوەیە كە بۆ ئەوكەسانەی یاد دەكەنەوە:

خوشكی نازیز: هیچ كاتێك لەبەخشندەی خـودا دوودڵ مەبـەو لەگـەورەی تاوانـەكانت تووشـی نائومێدی نەبێت.ئەگەر تۆ دەتەوێت تۆ بەبكەیت وپاش گەزبیتەوە لەتاوانـەكان .خـوای گـەورە لە هەموو تۆبەكاران خۆش دەبێت. خوای گەورە لەسێ یەكی شەودا دەفەرمێت :كێ دەیەوێت لێ ی خۆش بم.دوعادەكات لێ ی قبول كەم. ودەدەفەرمێت :ئەی بەندەكانم ئێوە بەشەو بەڕۆژ تـاوان دەكەن . تەنها منیش لەتاوان خۆش دەبم داوای لێ خۆش بوونم لێ بكەن تالێتان خۆشبم:

"یاعبادی انكم تزنبون.باللیل والنهار وانااغفر الزنوب جمیعاـفاستغفروفی اغفرلكم"

وە دەفەرمێت :٠هەركەسێك چاكە یەك بكات .مـن دەئـەوەندە یـان زیـاتر پاداشـتی دەدەمـەوە . وەهەركەسێك تاوانێك بكات .سزاكەی هەربەقەدەر تاوانەكەیە.

وەهەركەسێك بەیانتایی زەوی تـاوان ی هـەبێت .بـەڵام هاوبەشـیم بـۆ پەیدانـەكات .لێـی خـۆش دەبم بـەو ئەنـدازەیـە وەهەركەسـێك بستێك لێـم نزیـك ببێتـەوە (بەخواپەرسـتی ) بـاڵێك لێـی نزیك دەبمەوە وەهەركەسێك باڵێك لێم نزیـك بێتـەوە ئـەوا مـن باسكێك لێـی نزیـك دەبمـەوە .وەهەركەسێك بەهاتن بۆلام بێت من بەڕاكردن بەرەو پیری دێم .

"من عمل حسنة.فله عشر امثالها .اوأزيد. ومـن عمـل سـيئة فجزاءها مثلها .اوأغفـر. ومـن عمـل قراب الارض خطيئة.ثم لقينى لايشرك بى شـيئاً جعلت لـه مثلها مغفـرة ومـن اقـترب إلى شبرا اقتربت الي زرعا .ومن اقترب الي زرعا.اقتربت اليه باعا.ومن أتاني يمشي .اتية هرولة"

خوشكى بەڕێز : نـائومێد مەبـە وشـەيتان تێكت نەشكێنێت.ودەڵێـت :تۆكـەى پـيربوويت يـان شووت كرد تۆبە بكە نيستا كاتى نى يە. يان كارت لەسەر قورس دەكات و نائومێديت بۆ دروست دەكات تـۆش بەڕوويـەكى مەردانـەوە هاواربكـە بـەڕووى شـەيتانداو بڵـێ نانـەخێر هــەزار جـار نــەخێر نــا. كــێ دەڵێــت تەمــەن دەرفــەتى ئەوســاتانە دەدات لــەداهاتوودا مــرۆڤ تۆبــەبكات وبگەڕێتەوە؟! كێ دەڵێت ئەوزمانەى كەئێستايە بەڕاسـتگۆيانە تەوبـەو داواى لێ بوردنـى لـەخوا نـەكردووە لـەداهاتوودا دەرفـەتى ئـەوەى دەبێـت؟! هـەر بۆيـە بڕيـارى مەردانـەى خــۆت بــدەو بەڕاست گۆيانە بگەڕێرەوە لاى خواى گەورە و نەفرەت لەشەيتان و يارانى بكە و خۆت و خێزان و كۆمەلگەش لەشەڕى خراپەكاران بپارێزە.....

## چیرۆکـــــــــــــــــــــــــــــــە نوێ یـــــــــــــــــــــــــــــەکان

### کاتێك داوێن پاکی لەدەست دەدرێ

هەموو شتێك ئاسایی بوو لەماڵێکی بێ دەنگ و بچکۆلەدا کەتەنها یەك ساڵ بوو پێکهاتبوو . وەتەنها ژن و مێردێك بوون بەتەنها کەلەماوەی ئەم ساڵەدا ژیانی هاوسەرێتیان بڕیاردابوو.

هاوسەرەکە(مێردەکە) کەسێکی لاوو ماندوو کەهەر لەبەیانیەوەتا ئێوارە خەریکی ئیش و کاربوو بۆ پەیدا کردنی قوتی ڕۆژانەیان ئێواران کەبەوپەڕی ماندوو بوونەوە دەگەڕایەوە ماڵەوە بۆ پشوودان خەونی دەبینی بەوەی لەژێر سایەی سۆزو میهرەبانی خێزانیدا بحەوێتەوە خەون ، بەڵام خەونی بەئاگا . ئەگینا هەرکەس بەختەوەری دەوێ با ڕێ و شوێنی خۆی بگرێتە بەر چونکە کەشتی بەوشکانیدا ناڕوات . ئەم لاوە وەك زۆرێك لەلاوەکانی ئەم سەردەمە هەر لەهەوڵی دۆزینەوەی خێزانێکی جوان و شۆخ وشەنگ بوو. بەبێ گرنگی دان بەناوەڕۆکی ئەوکەسە لەڕووی ڕەوشت و ئاکارو ئەخلاقیاتی . وەزۆرێك لەلاوەکان گیرۆدەی ئەم حاڵەتەن، وبەدوای کەسی دینداردا ناگەڕێن کە پێغەمبەر خوا (دروودی خوای لەسەر بێ ) لەبارەیەوە دەفەرمێت " فاظفر بذات الدین تربت یداك" صحیح . رواه البخاری و مسلم. هەندێ لەلاوان کاتێ دەیانەوێ هاوسەرگیری ئەنجام دەن هەموو مەبەستێکیان تەنها جوانیە؟!! باڵای چەندێ بەرزە؟ ڕەنگی چۆنە؟ کێشی چەندە؟ ... هتد . لەوانەیە ئەوەی نەیپرسێ تەنها ئاینەکەی بێت ، هەندێ جار خۆی لەئاییندار دەپارێزێ بەبیانووی ئاڵۆزی و (معقد) یەوە ... لەوانەیە تانەو تەشەریش بدات . خاوەنی ئەم بەسەرهاتە ئافرەتێکی جوان و شۆخی زانکۆیی دەست کەوت ، بەڵام دوورە لە ئاکاروو ئایین ، کابرا بووە شۆفێری ئەم کچە زانکۆییە.

هەموو ڕۆژێك دەبوایە ئەم کوڕە ماندووە وەك شۆفێرێك خێزانی بگەیەنێتە زانکۆ و دواتریش دەچوو بەشوێنیدا....

ئەمە کاری ڕۆژانەی ئەم ماندوو ئەناسە بوو . کەهەمیشە لەهەوڵی ژیانێکی پڕ لەبەختەوەری و ئاسودەیی وئارامیدا بوو کەبەچەند گوڵاڵەیەکی روخۆشی (کوڕ و کچ) خێزانەبچکۆلەکەیان دەولەمەند و قەرەباڵغ بکات ئەمە هەموو ئاواتی ئەم (مێردە) شەکەتە بوو.

ڕۆژێك لەڕۆژان وەك پیشەی هەمیشەیی خێزانەکەی گەیاندە زانکۆ. پاش کاتژمێرێك زیاتر لەشوێنی کارەکەی خۆی تەلەفۆنێکی بۆکرا . زانی ئەوکەسەی قسە دەکات پیاوێکی ئاسایە (أمن).

تۆفلان کەسی...؟

+ بەڵێ.

فلانە کەس خزمی تۆیە؟

+ بەڵێ خێزانمە . هاوسەرمە.

کاکە بە خێرایی و بەپەلە بگەرە فلانە نەخۆشخانە.

+ بۆ کاکە چی بووە؟! ئەی هاوار؟

هیچی وا نیە بەلام زوو وەرە بۆ ئێرە.....

مێردە بەسەزمانەکە زۆر بەپەشۆکاوی و کەس نەیزانی چۆن چۆنی تەلەفۆنەکەی داناو یەکسەر خۆی گەیاندە ناوسەیارەکەی لەرێگادا چەندین خەیالی جۆراو جۆر بەبیری دا دەهات کەنەیدەزانی چی بووە و چی روویداوە. (ئاسایش و نەخۆشخانەو خێزانەکەی) سێ گۆشەیەکی زۆر ئالۆز بوو بەهیچ شێوەیەك لێی تێنەدەگەیشت هەرچۆنێك بوو خۆی گەیاندە نەخۆشخانەکە و سەیارەکەی لەشوێنێکی قەدەغەکراودا راوەستان . کەگەیشتە نەخۆشخانەکە وەك شێت رای دەکرد وتیان سەربدە لەژووری فریاکەوتن و ... چی رویداوە؟ بردیانەژووری بوژاندنەوە .کەبینی تەواو شێوا، خێزانەکەی سەراپای هەر خوێنە و کەوتووە لەو ژووردا لەژێر نرکەو ناڵەی ئازاردا دەناڵێنێ . بەلام زانی لەدەستدانی نابروو لەهەموو زنێك سەختتر مێردەکە وەك شێت هاواری دەکرد و دەیووت

چی روویداوە ئەی هاوار؟!

ئەفسەری ئاسایش پێی راگەیاند : ئەم ئافرەتە لەگەڵ دۆستەکەیدا ( عاشقەکەی ) لەفلان شوێندا تووشی کارەساتی سەیارە هاتوون...

لێرەدا قورگی ووشك بوو ئاگای لەخۆی نەما و وەك لە جێگایەکی بەرز دا بەربدرابێتەوە وابوو . خۆی پێنەگیرا و یەکسەر دانیشت. لەناکاو وەك شێت بەرەو رووی خێزانەکەی رای کردوو هاواری کرد و جوێن و وشەی ناشرینی بەخێزانەکەی دەوت ئەو رووخسارەی کەلە سەرەتادا پێی خەڵەتا و لەژیانیشدا ئەزدیهایەکی حەشار ابوو . وەئێستا ئەو رووە سوربووە لەخوێندا رووی کردە ئەو رووخسارە و وتی: تۆم تەلاق دا ... تۆم تەلاق دا...تۆم تەلاق دا... وەتفێکی کردە ناوچاوی و لێی دا رۆی.... خێزانی جێهێلا بەئازاری لاشەو نابرۆیەوە دەیناڵاند....

هەرکەس سووك بێت سووکایەتی لاناسانە

بریــــــندارکردن ئازار بەمردوو ناگەیەنێت

بەڵێ دۆستەكەی (عاشقەكەی) لەم كاردساتەدا مردوو خۆیشی بوە كەم ئەندام ، پشتی شكا ، دڕكەپەتكی بچڕا . بەهۆی ئەمەشی هەرچوار پەلی لەدەست دا .
زۆر ئاواتە خواز بوو بمردایە و ئەم حاڵەتەی بەسەردا نەهاتایە هەرچی خزم و كەس و كاریشی هەیە پشتیان تێ كردوو ڕەوانەی خانەی پەكەوتوانیان كرد تا دوا ڕۆژەكانی تەمەنی پڕ لە شەرمەزاری لەو شوێنەدا بەرێتە سەر . سەری لە خۆی و ژیانی لە كەسانی تریش شێواند.
هەروەكو خوای گەورە دەفەرمێت" ومن أعرض عن ذكری فان لة معیشة ضنكا ونحشرة یوم القیامة أعمی" طە ١٢٤ هەركەسێ پشت هەڵكا لەیادی خوا ئەوا ژیانێكی تەنگ بەسەر دەباو لەڕۆژی قیامەت دا بەكوێری حەشر دەكرێ.
* **ئەم چیرۆكە بەڕێز دكتور** سعید **كوڕی** مظفر **لەكاسێتێك دا دەیگێڕێتەوە.**

## ئاگاداری خوشكە نەزانەكانتان بن

ئێمە لەخێزانێكی بەختەوەردا دەژیاین نۆ خوشك و براین ،باوكمان لەكاری بازرگانیدا سەرقاڵەو دایكمان نەخوێندەوارە و ژنی ماڵەوەیە . بەڵام زۆر تێگەیشتووە و هەمیشە هانمان دەدات و كارمان بۆئاسان دەكات تاوەكو سەركەوتوو بین لەخوێندنماندا وپلەو پایەیەكمان هەبێت . خوشكە گەورەكەم هاوسەری پیاوێكی زۆر بەڕێزە و خاوەن پلەو پایەیەكی كۆمەڵایەتیە. براگەورەكەم و ئەوی پاش ئەولەدوو كاری چاك و پاك كاردەكەن دووخوشك و برایەكی ترم هەیە كەلەخۆم منداڵ ترن لەقۆناغەكانی سەرەتاییدا دەخوێنن. من و خوشكەكەم كەلەخۆم گەورە ترە بەساڵێك ، پێكەوە دەخوێنین كەگیرۆدە و قوربانی دەستی نەفامی و نەزانی منە.
ئەم خوشكەم و سەرجەم بنەماڵەكەمان زۆر دیندارو خواناس و بەڕێزن . وەلەسەر یەك ڕاستە شەقامی ڕەوشت بەرزی و خو ناسی دەڕۆن. تەنها من نەبێت وەكو مەڕی دوور لەڕان و شوان تووشی داوی گورگ بووم هیچ كۆت و بەندێكم پێ خۆش نەبوو. گوێم بە ڕەوشت و خواناسی نەدەدا هەمیشە جێگەی نیگەرانی خوشكەكانم بووم . بەتایبەتی ئەوەی كە پێكەوە بووین لەخوێندن.زۆر سەركەش بووم حەزم بەسنور دارێتی و سەرپەرشتیاری نەدەكرد . وە ئەم سەركەشیانەم ڕێیان خستە ناسینی كچە برادەرێكی نوێم كەزۆربەی كاتەكان پێكەوەدەبووین چ لەماڵ یان لە قوتابخانە . یان بەتەلەفۆن قسەمان دەكرد.
هەرچەندە ئەم كچە لەڕووی رەوشت و ئاكارەوە زۆر ناپەسەند و ناشیاو بوو كەناوی لەسەر زاری هەموو لایەك بوو بەڵام من هیچ گوێم بەم لایەنە نەدەدا تابوو دۆستایەتیم لەگەڵیدا بەهێز

دەكرد . خوشكەكەم زۆر بەم پەيوەنديە نيگەران بوو وەهەميشە سەرزەنشتى دەكردم و ئامۆژگارى دەكردم تالەو كچە دوور بكەومەوە بەلام بى سود بوو . پاشتر بۆم دەركەوت كە ئەم كچە دۆستايەتى و پەيوەنديەكى دلدارى هەيە لەگەل يەكيك لەكورەكاندا . پاشتر هانى دام كەمنيش وەك ئەم لەگەل برادەرى ( دۆستەكەى) پەيوەندى دلدارى ببەستم و زۆر هەولى داو هاتە بن دەستمەوە .

منيش سەرەتا زۆر دوودل بووم و راستەوخۆ نەچوومە ژير ئەم بارە ... بەلام بەهۆى بەردەوامى برادەرەكەم سەرئەنجام تەنها بەتەلەفۆن قسەم لەگەل كرد. دواتر وورده وورده قسەكردنمان بەتەلەفۆن زۆر ئاسايى بووە وە واى ليهات پەيوەست بوبوم بە دەنگ و وتە شرينەكانى كە بەجوانترين شيوە ( منى پى لەخشتە برد) سەرسام بوبوم، دواجار بەلينمان دا يەكترى ببينين و چاومان بەيەكترى بكەويت. لەم كارە زۆر دوودل بووم . مەترسى ئەوەم بوو كە شيودو ديمەنى جوانى منى بەدل نەبيت چونكە من مام ناوەند بووم لەجوانيدا . پاشتر يەكتريمان بينى و ئەو زۆرمنى بەدل بوو بەچەندين ووتەى شرين و سەرنج راكيش كەمەند كيشى كردم . ئەو گەنجيكى جوان قسەزان بوو منيش بەووتەكانى باوەرم كرد و زياتر پەيوەست تر بووم پيوەى .

هەوالى ئەم پەيوەنديەمانگەيشت بەخوشكەكەم چونكە كچەبرادەرەكەم داستانى من و ئەم كورەى بەو پەرى شانازيەوە لاى سەرجەم قوتابيەكان باس كرد بوو دديوت من رۆلى گرنگى ئەم كارەم گيراوە . خوشكەكەم بەم هەواله زۆر ئازارى دەچەشت زور ئامۆژگارى كردم و هەولى لەگەل دام بەلام بى سوود بوو ، ناچار هەرەشەى ئەوەى ليكردم كە بەمالەوە بليت و ئەم راستيانە بخاتە روو . منيش زۆر ترسام و زانيم زانينى كاريكى لەم جۆرە لەلايەن مالەوەمان باجەكەى زۆر گران و سەختە هەر بۆيە منيش كەوتمە بيرى ئەوەى چۆن بتوانم خالى لاوازى خوشكەكەم بگرم لەكاريك لەرووداويك.... هتد

تا بەوەوە منيش هەرەشەى لى بكەم و نەتوانيت نهينيكەم ئاشكرا بكات . بۆ ئەم مەبەستە زۆر بى بەزەييانە كەوتمە بيركردنەوە و پيلان داريژان . تا سەرئەنجام بريارم داسەرەتا متمانە بۆ خوشكەكەم بگيرمەوە هاتمە لاى و وتم من زۆر هەلە بووم ، ئيتر بەهيچ شيوەيەك پەيوەنديم لەگەل ئەو كورە دا نابيت و بەپيى ئامۆژگاريەكانت مامەلە دەكەم . ئەمە خوشكەكەمى زۆر شادومان كرد و زۆر خۆشحال بوو . پەيوەنديمان بەهيز تر و بەتين تر بوو . پاشان بۆقۆستنەوەى هەليك دەگەرام تاكو پيلانە ژەهراويەكەم جى بەجى بكەم .

خوشکەکەم زۆر بەپاك و بەرانەتەوە پێی ڕاگەیاندم کە جل و بەرگێکی نوێی کڕیوە ، دەیەوێت بۆ ئاهەنگی برادەرێکی بیکاتە بەری . بۆئەم مەبەستە لەکاتێك دا بگونجێت دەیکەمەبەرم تەماشای بکە بزانە جوانە و بەدڵتە؟!

منیش پێشتر خۆم مەلاس دا بوو بۆهەلێك خوشکە بێ تاوانەکەم زۆر بەسادەیەوە جل و بەرگەکەی لەبەری داکەند و خۆی گۆڕی بە جل و بەرگە نوێیەکە تا بزانێت من بەدڵمە . منیش زۆر بێ بەزاییانە دەستم کرد بە وێنە گرتنی بەهۆی ئەو کامێرا ی لەسەر مۆبایلەکەم بوو کە لەو کوڕەی دۆستم وەرم گرتبوو بۆ ئەم مەبەستە .

زۆر بەنهێنی وێنەم دەگرت . کە ئەو خۆی دا دەکەند و جل و بەگە نوێیەکەی دەپۆشی . بەبێ ئەوەی هەست بەهیچ بکات و پێی بزانێت . بەئەنجامدانی ئەم کارە، وام دەزانی سەرکەوتنێکی یەکجار مەزنم بەدەست هێناوە.

دواتر ( کامێراکە(مۆبایلەکە)) م گەڕاندەوە بۆ دۆستەکەم و ئەویش زۆر دڵ خۆش بوو . کەپێشتر زۆر هانی دەدام تا ئەم کارە ئەنجام بدەم . وە سوێندیشی خوارد کە بەهیچ شێوەیەك تەماشای ئەم وێنەیە ئەکات . چونکە منی ئۆش دەوێت . تەنها لەبەر ئەوەی ئەم خۆشەویستیە مان تێك ئەچێت بەهۆی خوشکەکەمەوە وە دڵنیای کردمەوە لەوەی ئەم وێنانە ئەپارێزێت.

بۆیەمنیش زۆر ساوێلکانە باوەڕم کرد و هاتمەوە دۆخی جارانی خۆم لەمامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کوڕەدا. دیسانەوە خوشکە بێ ئاگاکەم هەڕەشەی لێکردمەوە ئەگەر واز نەهێنم بەماڵەوە دەڵێت . منیش زۆر بێ باکانە پێم ڕاگەیاند کە ناتوانێت بەماڵەوە بڵێت چونکە چەند دەقیقەیەك وێنەی تۆم لەلایە بە نیمچە ڕووتی . و ئیستاش لەلای ئەو کوڕەیە دواتر منیش نیشانی ماڵەوەی دەدەم..؟!

هەر کە ئەم ووشەیەم لەدەم هاتە دەرەوە ئیتر خوشکەکەم تووشی سەدمەیەی زۆر گەورە بوو ( گەشکە)گرتی و دەستی کرد بەگریان و لەخۆدان ... دواتر خۆی نەگرت و بورایەوە.

پاشان گەیاندیانە نەخۆشخانە . تاماوەیەکی زۆر بە ئاگا نەهاتەوە و نەهاتە سەرخۆی مات و واقی وڕمابوو... بەلام ئەو خۆشەویستە بێ ویژدانەم زۆر بێ باك و بێ ویژدانانە ئەو چەند دەقیقە تۆمارکراوەی بەسەر زۆر بەی لاوەکاندا بلاو کردەوە، لەشاردا دەنگی دایەوە . وە ئەم هەواڵە گەیشتە ماڵەوەمان . باوك و براکانم زۆریان لێ داو عەزێتیان دا دیسانەوە گەیانیانە نەخۆشخانە بۆ ژووری چاودێری و مەترسی دار ... لەنێوان مان و نەماندابوو ... دواتر ئەو بێ ویژدانەی خۆشەویستم پێی ڕاگەیاندم کە بلاوبوونەوەی (وێنە) تۆمارکراوەکان بەمەبەست نەبووە و بەهەڵە ڕوویداوە . پاشان یەکسەر ووتەکانی گۆڕی و وتی بەزانی خوشکەکەت لەخۆت جوان تر و شۆخ ترە

باشە ئیتر پێویست ناکات بە ووشەی غەزەل من و تۆ بدوێین و خۆت بەکەسێکی ڕێك و پێك بنوێنیت چونکە ئێستا ئێوە خێزانێکی ناسراوو ناوزڕاون و وەرە باپێکەوە ڕابوێرین و .... هتد.
لەم کاتەدا وەك لەسەر شاخێکی زۆر بەرز بەرم بدەنەوە وابوو بۆم دەرکەوت کەئەم ناپاکە چ دڕندەیەکە و منیش چ تاوانێکی گەورەم ئەنجام داوە و خوشکە بێ تاوانەکەشم بوو بەقوربانی نەفامی و ساویلکەیی منی بێ عەقڵ ....بەم کارە گەورەترین کارەساتم بەسەر خوشکەکەم و خێزانە کەم دا هێنا . مێردی خوشکە گەورەکەم چی تر ڕێگای نەدا خوشکە کەم هاتوو چۆمان بکات ..... وە پەیوەندی بچڕاند . وەخانەوادەی مارەبڕی براکەم پەشیمان بوونەوەو مارە بڕینەکەیان هەڵوەشاندەوە. بەم شێوەیە شیرازەی خانەوادەکەمان تێك چوو شێوا ، بەهۆی نەفامی منەوە. ئەو خانەوادەی کە هەموو شتێکی بۆم فەراهەم هێنابوو لە ڕێز و پاردو هێمنی و خۆشی و سۆز....
بەلام ئەمە سەرئەنجامی دوور لەخوایی و ڕەوشتی جوان و بێ باکی لەکاری هەرزەکاری و دوور لەئامۆژگاریەکانی ماڵەوەمان بوو. هەرچەندە چەند جارێك وویستم بەرامبەر ماڵەوەمان دان بەتاوانەکەمدا بنێم ، بەلام نەم توانی و نەم وێرا . ناچار پێنووسم کردە زمانم وویستم ئەم کارەساتەی من بێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسانی ترو پەیامی من بۆ هەموو کوڕانی لاو ئەوەیە:
کەچی تر بەدوای کەم و کوڕی و ناموسی کەسدا مەگەڕێن و تەماشای وێنەی کچانی خەلکی مەکەن نەبا ڕۆژێك وێنەی خوشکەکەشت بکەوێتە بەردەستی خەلکی . تکام وایە کەس چی تر کامێرای مۆبایلەکانیان بۆ کاری لەم شێوەیە بەکار نەهێنن و ماڵی خەلکی نەگرنە قوڕ و کارەسات بەسەر کەسدا نەهێنن. تەنانەت وێنەی ئەندامانی خێزانی خۆتیش تۆمارمەکە نەبا بەسادەی دەربچێت و وەك کارەساتەکەی منی لێ بەسەر بێت داوا لەخوای بە بەزەیی دەکەم کە لێم ببورێت و خوشکە بێ تاوانەکەشم شیفا بدات و پەردەپۆشمان بکات...

## خزمی هاوسەروشەرمەزاری

پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) ڕاستی فەرمووە کە دەفەرمێت( إیاکم و الدخول علی النساء "فقال رجل من الانصار :افرأیت الحمو؟ قال الحمو الموت)
واتە : ئاگادار بن و ئامان مەڕۆنە شوێنێکەوە کە ئافرەتێکی تێدا بێت بەتەنها " یەکێك لەپشتیوانان ووتی :ئەی ئەگەر خزمی پیاوەکەی بێت . فەرمووی ئەوە هەر مردنە.کەدەفەرمێت

(أفرأيت الحمو) واتە چی دەفەرمووی سەبارەت بەوەی کە خزم وکەسوکارە نزیکەکانی میرد بەتەنهایی بچینە لای خێزانەکەی

کە دەفەرموویت ( الحمو الموت) واتەئەم پیکگەیشتنە مردنە چونکە زۆر جار لەخزمی نزیکەوە فیتنە و ئاشووب و کاری نادروست روودەدات بەهۆی زۆری تیکەلی و بینین و هاتوو چۆکردن لەنیوانیاندا . بەتایبەتی لەکۆمەلگەی ئیمەدا نزیك بوونەوە و هاتوو چۆکردن لەنیوان خزم و کەسدا زۆرە و خیزانی تیکەل دەبن. زۆر جار ئەم بوونی پەیوەندیە و دەقۆزریتەوە لەلایەن دەروون مردووەکان و کاری ناشرین روودەدات.

ئەمە پیشەکیەك بوو بۆ چیرۆکیك و رووداویکی راستەقینە کەلەشاری "ریاض" ی سعودی رووی داوە ،

کەسیك جی ی متمانە دەی گیریتەوە کە بەچاوی خۆی رووداوەکەی بینیوە ، لەنزیکەوە ئاگاداری بووە.

کە بە پیشەی (ژمیریاری) کاری دەکرد لە یەکیك لە نەخۆشخانەکان ، رۆژیك لەناکاو پیاوانی ئاسایش دوولاشەی سەربراوی رووت و قووتیان هینا بۆ نەخۆشخانەکە، ژن و پیاویك بوون دواتر سەرگوزشتەی رووداوەکە بەم شیوەیە بوو :

دوو کوری ئامۆزای یەکتر ی بوون لە دوو شوقەی بەرامبەر بەیەکتری دەژیان . و پەیوەندی یەکی بەهیز و بەتین لەنیوانیاندا هەبوو.

بەلام یەکیکیان شەیتان فریوی دا و تەماعی کردە خیزانی ئامۆزاکەی خۆی سەرئەنجام کار گەیشتە ئەوەی توانی پەیوەندیەکی نادروست پیکەوە دروست بکەن و کار گەیشتە ئەنجامدانی "زینا" ئەمەش بەقۆستنەوەی دەرچوونی میردەکەی لەمالەوە بۆکاری خۆی ، یەکسەر ئەم ئامۆزا بی ویژدانەی دەهاتەلای خیزانەکەی و هەموو شتیکیان ئەنجام دەدا کە ژن و میرد پیکەوە دەیکەن.

ئەم کارە ماوەیەکی زۆری خایەند تارۆژیکیان پیاویك کەلە شوقەی سەرەوەی مالەکەیانەوە بوو هەستی کرد پیلاوی زەلامیك لەبەردەم شوقەی ئەو مالەی تردایە دیارە کابرا لەبیری چووبوو لەدەرەوە پیلاوەکەی داکەندبوو . ئەمە بووە هۆی زیاتر ورد بیتەوە بەتایبەت کەزانی خاوەن مالەکە لەمال نیە و لەکارکردنە ، کەواتە کەسیکی تر لەمالەودیە. پاش بەدواداچوون و خۆحەشاردان بینی کە ئامۆزای کابراکەیە وە بۆچەند سەعاتیکە لەگەل خیزانەکەی ئامۆزاکەیدا لەژوورەوەن .

ئەمە وای کرد کە ئەم پیاوە چەندین جار چاودێری ئەم هەڵس و کەوتە بکات . تا بۆی دەرکەوت وگومانەکەی لەجێ ی خویدایە هەربۆیە بڕیاری دا کە ئەم نهێنیە بە خاوەن ماڵەکە بڵێ .

پاشان ڕاستی و دروستی ڕووداوەکانی بۆی گێڕایەوە و وتیشی حەز دەکەم خۆتیش بەتەواوی دڵنیا بیت لەم کارە، و چاودێریان بکە.

بۆ ڕۆژی داهاتوو مێردەکە بەخێزانی دەڵێت من سەفەردەکەم بۆ فلان شار و چەند ڕۆژێکم پێ دەچێت جا پێویستی و جل و بەرگم بۆ ئامادە بکە.

بەڵێ بەیانی زۆر بەئاسایی جانتاکەی هەلگرت و سواری سەیارەکەی بوو دەستی کرد بەڕۆیشتن بۆ شوێنێکی نزیك . لەولاشەوە ئامۆزاکەی بە وریاییەوە چاودێری دەکرد کە زانی ڕۆیشت و دڵنیا بوو . هات و وەك جاری جاران و لەگەڵ خێزانی ئامۆزاکەیدا کاری نادروستی خۆیان کرد و لەسەر سیسەمەکە خەوێکی قوڵ بردیانیەوە.

هاوسەرەکەشی پاش سەعاتێك یەکسەر گەڕایەوە و لەدووری شوقەکان سەیارەکەی ڕاگرت تاکەس هەستی پیێ نەکات ، پاشان بە لەسەرخۆیی هاتەوە ماڵەوە و ڕوەو ژووری نووستنەکە چوو . دەرگاکەی بەهێواشی کردەوە ئەی هاوار چی دەبینێ، بینی کە هەردووکیان لەسەر سیسەمەکە خەو بردوویانێتەوە.بەڕووت و قووتی .

پاشان بەهێواشی گەڕایەوە بەرەو ژووری چێشتخانەکە چوو چەقۆیەکی گەورەی هێنا و لەپێشدا ئامۆزاکەی خۆی سەر بڕی و لەکاتی گیان داندا دەنگێکی لێ بەرز بوەوە و ئافرەتەکە بەئاگا هاتەوە . بەلام مێردەکەی مۆڵەتی نەدا و ئەویشی سەربڕی، سەربڕینێك لەکاتی سەرپێچی کردنی خودادا . پاشان پەیوەندی کرد بەپیاوانی ئاسایشەوە کە بێن لاشەی هەردووکیان بەرن.

ئەمەیە ئەنجامی تاوانکاری و ناپاکی خوای گەورەش دەفەرمێت" ولاتقربوا الزنی إنة کان فاحشة وساء سبیلا"

هەروەها بەسەرهاتێکی تری کە هاوشێوەی ئەمە لای ئێمە لە دیمەشق ڕوویدا بەکورتی کەسێك دۆستەکەی خۆی دەباتەوە بۆماڵەوە لە ڕۆژانی زستاندا کە کەش و هەوا ساردە . لەژوورێکی بچووك دا دەبن وهەندێ خەڵۆزیش دەباتەوە تا ژوورەکە گەرم بکات و خواردنی لەسەر ببرژێنن و نێرگەلەش بکێشن . پاش ئەنجام دانی کاری ناشەرعی دەخەون و گازی ئۆکسجین نامێنێت لەئەنجامی سووتانی خەڵۆزەکە دا دواتر هەردووکیان دەخنکێن بەڕووت و قووتی . پاش چەند ڕۆژێك هاوسێکانیان هەست بەبۆنی ناۆش و گەنیوی دەکەن لە شووقەکەیان پاشان دەرگاکەیان دەشکێنن، دەبینن بەڕووتی و بەشێوەیەکی زۆر ناشرین مردوون.

بەڵێ " فأتهم الله من حيث لم يحتسبوا"

"فاعتبروا يااولى الابصار"

بەڵێ خوای گەورە لەشوێنێکەوە تووشی کردوون کە هەرگیز بەلای دا نەچوون.

دەپەند وەربگرن ئەی خاوەن ژیریەکان ...

## کچە " هاوڕێکەم " دەوێ

من وەکو پزیشکێك وەکو کاری ڕۆژانەی خۆم بەسەر نەخۆشەکاندا دەگەڕام و بەسەریانم دەکردەوە لەژووری چاودێریدا لەنەخۆشخانەی (کەنەدی) کە سەرقاڵی تەواو کردنی خوێندنی باڵا بووم تیایدا .

نەخۆشی سەرقەرەوێڵەی ژمارە (٣) بەتایبەتی ناوەکەیسەرەنجی ڕاکێشام کە بینیم ناوی "محمد" ە . ئەم ناوە لەم نەخۆشخانەیە چی دەکات؟

لێی ورد بوومەوە تەماشا دەکەم لاوێکی تەمەن بیست و پێنج ساڵەنەو شەکەت و ماندوو بوون بە ڕوخساریەوە دیار بوو کە لەژێر سۆنەردو ئۆکسجین و جهازدا بوو . تەماشای دۆسیەکەیم کرد بۆم دەرکەوت کە تووشی لەدەستدانی بەرگری ( ئایدز)بووە .وە پێش دوو ڕۆژ بە هەوکردنی توند ڕەوانەی ئەم نەخۆشخانەیە کراوە. بەپێی نووسینی پزیشکەکان وە دیمەنەکانی ڕوخساری حاڵەتەکەی زۆر ترسناك دیار بوو کە پێی دەچوو لەسەرە مەرگدا بێت .

ئەمە یەکەم نەخۆشی ڕۆژهەلاتی وموسڵمان نیە من لەم نەخۆشخانەیە ببینم بەڵام حاڵەتەکەی جێگەی تێ ڕامانم بوو. پاش تەواو کردنی ئەرکی بەسەر کردنەوەکەم بۆ نەخۆشەکان لە "محمد"ی نەخۆش نزیك بوومەوە ویستم بیدوێنم .

بەڵام هەستم کرد بەنوزدیەکەوە چەند ووشەیەکی بچڕبچڕی دەر دەبڕی کە هیچی لێ تێ نەدەگەیشتم . بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیم کرد بەماڵەوەیان . دایکی وەڵامی دایەوە . بۆم دەرکەوت ئەم ماڵە عەرەبی لوبنانین . وەباوکی بازرگانێکی بەناوبانگەو کۆگای شرینەمەنی هەیە.

پاشان بەکورتی حاڵەتی "محمد" م بۆ دایکی باس کرد . لەم ساتانەدا زەنگی دەزگاکانی ئاگادار کەرەوەی ژورەکەی "محمد" لێی دا و حاڵەتی نائاسایی ڕاگەیاند . کەنزم بوونەوەیەکی خێرا لەپەستانی خوێنیدا ڕوویداوە .

زۆر بەخێرایی بەدایکیم ڕاگەیاند زۆر پێویستە بەخێرایی بگەیتە ئێرە .

ووتی من زۆر سەرقاڵم پاش دەوام دێم . بەپەلە ووتم کارەکە مەترسی دارە و تەلەفۆنەکەم بەناچاری داخست و خۆم گەیاندە لای "محمد".

پاش نیو سەعات دایکی گەیشتە لامان، ئافرەتێکی عەرەبی لەکامڵ بووندایە . هیچ سیمایەکی باوەڕداری پێوە دیار نەبوو. دیار بوو زۆر شێواو بوو منیش حاڵەتی "محمد" م بۆ شی کردەوە، دەستی کرد بەگریانێکی بەکوڵ.

ویستم هێمنی بکەمەوە و وتم خوا کەریمە ، دووعا بکە خودا شیفای بدات.

بەسەر سوورمانێکەوە وتی : چیت ووت؟!

ووتم : لە خوا داوا بکە تا شیفای بدات.....

ووتی: تۆ مووسڵمانی ؟!

ووتم : بەڵێ، سوپاس بۆ خوا....

ووتی: ئێمەش بەهەمان شێوە موسڵمانین ...

ووتم : زۆر باشە بچۆرە ژوور سەری و هەندێ قورئانی بەسەرا بخوێنە ، تاوەکو هەندێ لەئازارەکانی سوك بێت و دەروونی هێمن بێت .... زۆر بەشێواویەوە گریاو وتی : نازانم!

ووتم : باشە ئەی چۆن نوێژ دەکەیت؟

ووتی: ئێمە... ئێمە... نوێژ... ناکەین.

لەوەتی هاتووین بۆ ئێرە ، تەنها لەجەژنەکاندا نەبێت بەڵام هەندێ جار ..... کەدەچمە سەر گۆڕی باپیرانم لەلبنان دوعایان بۆدەکەم بێ ئاگاداری مێردەکەم .من ئافرەتێکی دیندارم .

لەدڵی خۆمدا ووتم ( ئەی هاوار پەنا بەخوا دیندارەو نازانێت تەنانەت نوێژیش بکات وە قورئان بخوێنێ؟!)

پرسیارم کرد لێی سەبارەت بەکوڕەکەی .

ووتی: کوڕێکی باش بوو دڵ و دەروون پاك. زۆر دڵی بەژیان خۆش بوو . لەپار ساڵدا تووشی لادانی ئەخلاقی بوو لەگەڵ کچێکی هاوڕێیدا کە بەتەواوی زاڵ بوو بەسەریدا ...

ووتم: نوێژی دەکرد.

ووتی : نەخێر بەڵام بڕیاری دابوو لەکۆتایدا تەمەنیدا بچێت بۆ حەج.

لەدڵی خۆدا ووتم : کەس دڵنیایە لەوەی ئەمڕۆ تا سبەینێ دەمێنێ یاخود سی و چل وپەنجا و شەست ساڵ بژی تا بەنیاز بێت لەدوا تەمەنیدا حەج بکات ...؟!

پاشان لەنەخۆشەکە نزیك بوومەوە کە لەسەرەمەرگدا بوو بەردەوام زەنگی دەزگاکانی بوژاندنەوە تادەهات بەرز دەبودوە و دایکیشی بەبەردەوامی دەگریا.

لێی نزیك بوومەوە و دەستم گرت و پێم ووت:

محمد شایەتمان بهێنە بڵێ ( لاإلە الاالله) . محمد هەوڵی دەدا بەلام لەپەل و پۆ کەوتبوو ڕەنگی تەواو ڕەش هەڵگەڕابوو . هاتەوە هۆش و هەستی بەخۆی کرد .

ووتم : بڵێ ( لاإله الاالله) ....

ووتی : چارەسەرێکم بدەرێ تا ئازارەکانم لەسەر سووك بکات .

ووتم: ئەی گەنج بڵێ ( لاإله الاالله) . سەرجەم پەرستارەکان (ممرضات) پێیان سەیر بوو.

محمد لێوەکانی دەجوولاند . ووتم ئێستا دەیڵێت.

بەلام لەناکاو بە زمانی ئنگلیزی ووتی (ئای کەنت) (ئای کەنت ) واتە ناتوام ..... ناتوانم..... کچە هاوڕێکەم دەوێ ..... من ناتوانم. ..

لەم کاتانەدا لێدانی دڵی بەبەردەوامی بەردو نزم بوونەوە دەهات . ئەویش هەر دەیووت: کچە هاوڕێکەم دەوێت...من ناتوام.... وردە وردەلێدانی دڵی سست بوو هەناسەدانی شێوا ..... منیش خۆم پێنەگیرا و بەدەم گریانەوە هاوسەنگێتی خۆم لەدەستدا بوو هەردەم ووت دەی ئەی گەنج ...محمد.... دەی بڵێ .... تکات لێ دەکەم بڵێ .... ئەویش ووتی ناتوام.....

لێدانی دڵی ڕاوەستا . هەناسەدان بچڕا و لەشی خاوو بوەوە و سەرو ڕوخساری ڕەش داگیرسا و دایکی دەگریاو خۆی بەسەر سنگی ڕۆڵەکەیدا دابوو..... تۆ و باوکی

منیش بەو پەڕی قوڵی ناخمەوە دەگریام و هەموو نەریت و ئاکارێکی پزیشکی م لەدەستدا بوو ڕووم کردە دایکەکەی و هاوارم کرد :

تۆبەر پرسی تۆ......... تۆبەر پرسی تۆ.......

ئەم ئامانەتەتان لەدەستدا خوا لەدەستتدان بدات دایکی شی تا بوو دەگریا . لێرەدا ئەم ئایەتە قورئانیەم هاتەوە یاد کە دەفەرمێت(أم حسب الذين اجترحوا السيئات أن نجعلهم كالذين آمنوا وعملوا الصالحات سواء محياهم ومماتهم ساء ما يحكمون) جاثيه ٢١

واتە : ئەو کەسانەی کە تاوەنبارن و تاوەنکارن گومان دەبەن کەمردن و ژیانیان وەك (باوەڕداران و ئەنجام دەرانی کاری چاکە) دەبێت بێ گومان ئەوان زۆر بەهەڵەدا چوون.

زانای خواناس "ابن القيم" دەفەرمێت:

کەسێك لەتەواوی لاوێتی و ژیری و توانایدا بێت شەیتان زاڵ ببێت بەسەریدا و تاوەنکاری پێ ئەنجام بدات . ئەی لەکاتی سەرە مەرگدا چۆن دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر شەیتاندا . بێ گومان شەیتان بەدوای هەلدا دەگەڕێ تا زاڵ دەبێت بەسەریدا و هیچی بۆ ناکرێت شەیتان لەوکاتەدا لە

هەمووكات بەهێزترە . ئەویش لە هەموو كاتێكی لاواز تـرە ، كێ دەبێ بتوانێ لەو دوادواییانەدا لەگوناه پارێزراو بێت. لێرەدا خوای گەورە دەفەرمێت(يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا وفي الآخرة ويضل الله الظالمين ويفعل الله ما يشاء)سورة إبراهيم٢٧

**بە پێنووسی دکتۆر ئەیمەن کوڕی ئەسعەد عەبدە لەکەنەداوە**

# پێــــرست